# دەسەڵاتی کوشندە

## لە کۆمەڵگەی دیکتاتۆرە بچوکەکاندا



ئاسۆ جەبار

2007

## پێشکەشە...

بە خوێنەرانێک کە روانینو دنیابینی مۆدێرن جیادەکەنەوە لەحیکایەتە کوشندەکانو لەرەخنە تێدەگەنو دەنگێکن بۆ رووتکردنەوەی دەسەڵاتو هەڵماڵینی دەمامکە چەواشەکەرەکانو پێشکەشە بەو جەنگاوەرە مەعریفیانەی کە حەقیقەت لەجەهلو گەمژەکان وەردەگرنەوەو بە عیشقەوە سەفەر دەکەن بە ناو ئەم کتێبەدا...

دەسەلاتی کوشندە

ئاسۆ جەبار

کلێشەسازی: یادگار ئەورەحمان

تابلۆی سەربەرگ: چیمەن ئ.سمائیل

ناوی تابلۆ: پاشای نوێ

فەرزی بەرگ: کۆسار ئازاد نووری

تایپ: رۆشنا غەریب

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

چاپی یەکەم: سلێمانی ٢٠٠٧

چاپ: شڤان

ژمارەی تۆمارکراوی (٣١٢)ی ساڵی ٢٠٠٧ی و. رۆشنبیری پێدراوە.

# دەسەڵاتی کوشندە

-کۆمەڵگەی دیکتاتۆرە بچوکەکان

-دەسەڵاتی کوشندە

-دەسەڵاتی بەختەوەر و کۆمەڵگەی خۆشباوەڕ

-کەلاوەیەک بەناوی ژیانەوە

-دەسەڵاتی خاڵی لەمەعریفە

-جەهلی مۆدێرن

-ناشرینکردنی ژیان بەناوی دیموکراسیەتەوە

-مەرگدۆستی & ژیاندۆستی

-دەسەڵاتی جەهل

-حکومەتی ناعەدالەتی

-کۆمەڵگەی بێ ساحێب

-درۆزنترین حکومەتی دنیا

-جێگری حکومەت تۆڵەدەکاتەوە

-سەروەت و جەنەڕاڵەکان

-جەلاد.. کۆمەڵگە سەگ نییە

-شکاندنی کەرامەتی مرۆڤ

-دەسەڵاتی زۆردارو پەرلەمانی کارتۆنی

# کۆمەڵگەی دیکتاتۆرە بچوکەکان

"زۆرداران سێ جۆرن: هەندێکیان لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێرێن، هەندێکی دیکەیان بەزۆری تفەنگو قشونی عەسکەران لەسەر کورسی دادەنیشن، گروپێکی تریشیان ستەمکاریان بە میرات بۆ دەمێنێتەوە." ئاتین دۆلابۆتی

ئەگەر دیکتاتۆرەکانی بەرلە سەدەی بیستەم دیکتاتۆری تاکەکەسی بوون، ئەوا دیکتاتۆرەکانی سەدەی بیستەم هەلگری((سیستمێکی دیکتاتۆرین)). لەناو فەزایەکدا ئامادەن کە کۆی ئیشکردنی فەزاکە ئیشکردنێکی دیکتاتۆریانەیە.[1] سەردەمی دیکتاتۆرە نوێکان سەردەمی رێکخەرە گەورەکانو ماشێنە گەورەکانی ستەمکارییە، سەردەمی بە میتۆدکردنی زەبروزەنگو خەساندنی کولتوریو

[1] مەریوان وریا قانیع، سەرەتایەك بۆ لێکدانەوەی دیاردەی دیکتاتۆریەت، گۆڤای سەردەمی رەخنە، ل67

بێبایەخکردن و بچوککردنەوەی مرۆڤەکانە لە کۆمەڵگەیەکی قفڵدراو و لە فەرهەنگێکی هەژاری تاك ئاراستەی روانین و تاك دنیابینیدا، سەردەم دابەشبونی ئەو رێکخەرە گەورەیەیە بەسەر هەزاران رێکخەری هاوشێوەو کۆپیکراوی سیستمێك لێوانلێو لەهەژمونگەری و پەنهانکردن.

ئەم تێڕوانینەی مەریوان وریا قانع دەروازەیەکی کراوەترو فراوانتر لەسەر ئەم باسە دەکاتەوەو پتر دەمانخاتە بەردەم گفتوگۆیەکی جدیتر لەبارەی دیکتاتۆرییەت و سیستمی دامەزراوە دیکتاتۆرییەکان لەدنیای نوێ و سەردەمی کەرەستە ئاڵۆزەکاندا. لەراستیدا ئەوەی لێرەدا باسی لێوەدەکەین هێندەی قسەکردنە لەسەر ئەو رێکخەرە گەورەیەی کە سیستمێکی گەوری دابەشبووە بەسەر زیاد لە کایەیەك و زیاد لەپێکهاتەیەکی ئاڵۆزی سەرتاسەری، کە فۆرمێکی نابەرجەستەکراوی نادیاریکراوە لەشوێن و کاتە پۆلێنکراوەکاندا. لەسیستمی دیکتاتۆریدا شتێك نیە بەناوی شوێنە دیاریکراوەکان یان پۆلێنکردنی شوێنەکان، بەڵکە شوێن لەرێی فەنتازیایەکی کاریزمییەوە یەکسان دەبێتەوە بە پانتاییەکی گەورەی پاوانکراو و چاودێرکراو، دەبێت بە سەرزەمێنێکی بەرفراوانی بەرهەمهێنانی هێزو کۆنترۆلکردن و کاریگەری. شوێن دەبێتە بەرهەمهێنەرو خولقێنەری حیکایەت و دنیابینییەکی دیاریکراو، ئەگەر شوناسێکی پراوپڕ ببەخشین بە شوێن لەسیستمی دیکتاتۆریدا، ئەوا شوێن خەیالگەیەکی بەرفراوانی ئەو خەیاڵدانە گەورەیەی هێزو زەبروزەنگ و سڕینەوەی شوناس و سایکۆلۆژیاو جیاوازییەکانە، لە

هەناوی هەموو سیستمێکی دیکتاتۆری‌دا دەسەلاتێکی تۆتالیتاری ئامادەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی تاکەکەس‌و کۆمەڵگەو کولتورو هەر دنیابینییەك کە ناچێتەوە سەر ئەو ئیرادە سەرتاسەریەی کە مرۆڤەکان لەکایەیەکی بەرفراوانی تاکئاراستەییدا کۆدەکاتەوە.

دواجار سیستمی دیکتاتۆری هێندەی سیستمێکی وێناکراوە بۆ بەرجەستەکردنەوەی هەر شوناس‌و خەیاڵ‌و ستراتیژو روانینێك لەنەخشە بۆکێشان‌و جێبەجێکردندا، هێندە سیستمێکی بەرجەستە نیە کە پانتاییەکانی سنورێکی دیاریکراویان هەبێت لەماناو شوناس‌و پیادەکردندا، واتە ئەوەی دیکتاتۆرەکان لەمەودایەکی دیاریکراودا کۆدەکاتەوە تەنها ئایدۆلۆژیا نیە، رەنگە نەتەوە بێت یان ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراوی پێکهاتەیی بێت لەنەتەوەپەرستی‌و ئاینپەرستی‌و ئەخلاقپەرستی‌و خودشەیدایی، هەروەها رەنگە مەزهەبێکی دیاریکراو یان تایەفەگەری‌و ئایدیاپەرستی سیماگەلێکی جیاوازبن بۆ پێکهێنانی سیستمێکی دیکتاتۆری بەهێز. هاوکات ئەندازەی روانین‌و دنیابینی لەسیستمی دیکتاتۆریدا هێندەی وێناکراوێکی وەهمین، هێندە نەخشەیەکی ئاشکرا نیین، ئەم سیستمە لەئاستی کۆمەڵگەدا کار لەسەر خولقاندنی کۆمەڵگەیەکی وەهمی‌و سەرکەوتنی وەهمی‌و هێزی وەهمی‌و دەسەلاتی وەهمی‌و فەرهەنگێکی وەهمی دەکات، هاوکات لەئاستی تاکەکەسیشدا بەرهەمهێنەری مرۆڤگەلێکی سوپەرمانە، واتە هێزی لەرادەبەدەرو سەرکەوتنی لەرادەبەدەرو سوپایەکی ئیلاهی لەمرۆڤی خەیاڵی.

# ئەخلاقیاتی دیکتاتۆری

ئــەو دەســەڵاتەی هــەنگاوێك دووردەكەوێتــەوە لــەهاوڵاتیان، دەیــان هــەنگاو نزیكدەبێتــەوە لــەدیكتاتۆری. هــەروەك چــۆن دیموكراسی تــەنها كۆكردنــەوەی تایەفــەو تــیرەو عەشــایرەكان نییــە، هاوكــات كۆكردنــەوەی دەیان نوسەرو هونەرمەندی بێئیش نیە لەهۆڵێكی كۆبونەوەی حیزبــداو رازیكردنی رۆژنامەو گۆڤارو ناوەنــدەكانی راگەیانــدن نییــە بــە كۆمــەڵێك حیكایەتی بچوكو لێشاوێك موقەدەساتی ساختەو یادەوەرییەكی بێ مانا لەئێستادا، بەهەمانشێوە سیستمی دیكتاتۆریش پێوانە ناكرێت بــە داهاتی خراپی ساڵانەی تاكەكەسو دروشمو هوتافكێشانی پڕ لەدرۆو لێوانلێو لە جەهل بۆ دیموكراسیو دنیای مۆدێرن، دیكتاتۆرێك نیە لەدنیادا بەقەدەر هــەمومان باسی لەدیموراسی نــەكردبێت، بــەڵام ئــەم چــەمكە زۆر لــەوە گــەورەترە لەقەفــەزی حیزبێكــدا یــان لەقەفــەزی زێڕینــی دەســەڵاتێكی دیكتاتۆرییدا جێببێتەوە.

دیكتــاتۆر تــەنها ئــەوە نییــە كــە تــۆ دەیبینیــت، بەڵكــە ئــەو بونــەوەرە گــەورە دابەشــبووەیە كــە تــۆ وەك بونــەوەرێكی بــچوك نایبینیت، دیكتاتۆر جەستەیەك نیە وەك جەستەكانی دیكە لەڕووی فیزیكیو بایەلۆژییــەوە، ئــەو جەســتەیەكی پەرشــوبڵاوەو لاشــەیەكی پاڵكــەوتوە لەســەر هــەموو لاشــەكانی دیكــە. تــۆ بۆئــەوەی بزانیــت دیكتــاتۆر چــییە، بەتــەنها ناتوانیــت بگەڕێیتــەوە بــۆ خــودی ئــەو بونــەوەرەو بگەڕێتــەوە بــۆ كەســایەتیو دەرئــەنجامی رەفتارەكــانی،

نەخێر دەبێت بەرلەهەر شتێك بگەڕێیتەوە بۆستراکچەری ئەو بونیادە گەورەیەی کە دیکتاتۆری لەسەر رادەوەستێت، بگەڕێیتەوە بۆئەو نیزامی دابەشبوونەی کە سەرلەبەری پانتاییەکان لەساتەوەختێکی درێژخایەنی بێئاگاییەکاندا داگیردەکات، دەکرێت ئەو رێکخەرە گەورەیە بخەیتە بەردەم پرسیارو راڤەکاری کە فەزای بێدەنگیو سەرزەمینی بێدەنگو خامۆش دروستدەکەن، پێویستە ئەو ناوەندو دەزگاو پانتاییانە بناسیت کە دەکەوێتە نێوان بێدەنگیو زەبروزەنگەوە، کە پردی پەیوەندین لەنێوان خامۆشیو دەسەلاّتدا، هاوکات سەرزەمینێکن لەنێوان مەرگو وەهمدا. مەرج نییە بگەڕێیتەوە سەر ئەو کاریزمایەی کە لەدەوری ئەو بوونەوەرە تەجەلادەکات، بگەڕێیتەوە بۆ سەر ئەو عەدەمییەتەی کە لەدەرەوەی هەموو بوونەوەرەکان، هەموو هەبووەکان بەرپادەبێت، کەواتە ئایا ئێمە لەدەرەوەی ئەو خەیالگەیە دەژین، ئایا کەوتوینەتە دەرەوەی ئەو بازنە بێسنورەی کە فەزاکانی دیکتاتۆر دەکێشنو دووبارەدەبنەوە، ئایا لەهەموو بوونەوەرێکدا ئەو کاریزمایە دروست نابێت ؟ تۆ بۆئەوەی لەدەرەوەی ئەو مۆنۆپۆلیزەیە قسەبکەیتو رامانێکی دیکەو دنیابینیەکی دیکە بەرپابکەیت، دەکرێت لەدەرەوەی ئەو وێرانەیە، لەدەرەوەی ئەو ستراکتورە کۆنکرێتییە جارێکی دیکە بڕوانیتە ئەو بونیادەو ئەو کاریزماو مۆنۆپۆلیزە گەورەیەی کە دیکتاتۆر خەلقی دەکاتو دەبێتە خالقو بەرپاکەری ئەو پانتاییە کۆنترۆلکراوانەی کە مرۆڤەکانی تیادا دەژین. ئەو وەك کورتکەرەوەیەکی گەورەی ژیان، تەنها مەرگدۆستێکی کارا نییە بۆ

بەرپاكردنی مەرگ؛ نەخێر ئەو لەخودی مەرگ مۆدیلێكی دیكەی ژیان بەرپادەكاتو خەیاڵێكی سەرتاسەری بێئیرادەی تاكەكانو ئیرادەیەكی گشتی كۆنكرێتی دروستدەكات، كاتێك تەواوی ناوەندەكان دەبنە داریژەرو بەرپاكەرانی كۆنترۆڵو چاودێریكردنو لێپرسینەوەو تەرجەمەكردنی شفرەكانو هێماكانی ئەو دەسەڵاتە، تۆ بەئاسانی ناتوانیت سەربازگەیەك لەمزگەوتێك جیابكەیتەوە، ناتوانیت قوتابخانەیەك لەرێكخراوێكی حیزبی یان لەدەزگاكانی دەسەڵات جیابكەیتەوە، یان زانكۆ لەبەندیخانە جیابكەیتەوە، كاتێك سەرجەم ناوەندەكان دەبنە موڵكی دەسەڵاتو حیزب؛ ئەوكاتە سیستمێكی ئاسۆیی كۆنترۆڵو مۆنۆپۆلیزەكردن بەرپادەبێت، ئەوكاتە دیكتاتۆرو كاریزماكانی بەسەر تەواوی نێوەندەكاندا دابەشدەبن، دەرئەنجام مامۆستایەك یان مەلایەك دەتوانێت هەمان رۆڵو كاریگەریی دیكتاتۆر ببینێت، ئەوكاتە مزگەوتێكو خوێندنگەیەكو زانكۆیەك دەتوانن هەمان رۆڵی حیزبو دیكتاتۆر ببینن، كاتێك دیكتاتۆر بەسەر تەواوی ناوەندو مووۆڤەكاندا دابەشدەبێت، گرنگ نییە دیكتاتۆر ماوە یان نەماوە، راڤەكردنی ئەم بۆچوونە زۆر بە سادەیی پەیوەستە بە ڕوانینو دنیابینییە هاوشێوەكانو لەكارخستنو خەساندنی سەرلەبەری جیاوازییە فەرهەنگیو رۆشنبیریو شارستانییەكانو یەكسان كردنەوەی سەرلەبەری ئەو ناوەندە ژیارییە بە پانتاییەكی گەورەی بەرهەمهێنانی ئیرادەیەكی گشتیی پاوانكراوی تاكڕەهەند. واتە كاتێك دەسەڵاتە دیكتاتۆرییەكان دێنو جیاوازییەكان دەكوژنو

ئـیرادە جیاوازەکـانی تاکەکـەس لـەئیرادەی گـشتیی کاریزمی‌ـدا دەتوێتـەوە؛ ئەوکاتـە تـەواوی پانتاییـە کۆمەڵایـەتی‌و کولتـوری‌و ئابوری‌و سیاسی‌و دامودەزگایەیەکان لەسەر ئاستێکی رێـژەیی دەبنـە مۆنۆپۆلیزەکەری سەرچاوەکان‌و بەستنەوەی مرۆڤەکان بـەمۆڕاڵێکی مێگـەلی ڕەشـەبیرکردنەوەی تـاقمێکی سیاسـی دیـاریکراو و بـێ جیاوازی، کاتێك دیکتاتۆر حساب بۆ رایگشتی ناکات، تـەنها دیکتـاتۆر بەشدار نییە لەو رێکخەرە گەورەیەدا کە رووبەرێکی سەرتاسـەری‌یە بـۆ بێـدەنگی‌و سـتەمکاری، نـەخێر تـەواوی کۆمـەڵگا بەشـدارە لـە پراکتیزەکردنـی سـڕینەوەی جیـاوازی‌و بـەرپاکردنی بێـدەنگی. هەروەها"ئەو کۆمەڵگایانەی کە ـەزگاو کولتوری دیموکراسییان نییە یـان زۆر لاوازە. کایـەی سیاسـیان زۆر پارچەپارچـەو پـڕ ناکۆکییـەو یاسایەك نییـە ئـەو ناکۆکیانـە بـەڕێوەببات، سیـستمێکی دادوەریـان نییـە کـە توانـای کـارکردنی سـەربەخۆیان هـەبێت، دیـاردەی سەرکردەپەرسـتی تیایـدا بـەهێزە، دەبنـە شـوێنی بەرهـەمهێنانی دیکتاتۆر."[2]

ئەوەمان لەبیرنەچێت دەرئـەنجامی هـەموو بێدەنگیـەك بەرابـەر ناعەدالەتی کۆمەڵایەتی‌و ئـابوری دنیایـەك دیکتـاتۆر دروسـتدەکات‌و دنیایەك ستەمکاری بەرهەمدەهێنێت. هاوکات هـەموو وێرانییەیـەکی کولتـوری‌و غیـابی سیـستمە دیموکراتییـەکان یـان غیـابی رێکخـەرە شارسـتانی‌و مۆدێرنـەکان بـۆ نەخـشەدانان‌و هێـشتنەوەی کلێشەسازییەکی دامودەزگـایی لەبـەڕێوەبردن‌و رێکخستنی کۆمەڵگە

---

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل93

لەیەکەیەکی ئەکتیڤو بەرهەمهێنەرو هێشتنەوەی جیاوازییەکانداو غیابی میدیای ئازادو پەرلەمانی ئەکتیڤو نەبوونی ئۆپزسیۆن هۆکارگەلێکی بەهێزن بۆ دروستکردنی دیکتاتۆرو رەنگڕێژکردنی ئەخلاقیاتێکی سەرتاسەری دیکتاتۆری.

دەرەنجام مەریوان وریا قانیع لە کلێشەیەکی دیکەدا کۆمەڵگەو دیکتاتۆر دەبەستێتەوە بەدۆخێکی سایکۆلۆژی شێواوەوە کە تیایدا دیکتاتۆرەکان توانای رێکخستنەوەی ئەو بێ هیوایی‌و بێئومێدییانەی کۆمەڵگەیان هەیە لەڕێی مژدەو بەڵێن‌و وەهمەکانەوەو دەڵێ: ئەو هەلومەرجانەش کە کۆمەڵگە توشی بێهیواییەکی گەورە دەکەن، مژدەی واقعیانەیان تێدا نییە، لانیکەمی عەدالەتی کۆمەڵایەتی تێدا بزرە، رێگا خۆشکەرن بۆ دروستبوونی دیکتاتۆرێك کە مژدەی ساختەو هیوای ساختە لەو کۆمەڵگەیانەدا بچێنێت. زۆرجار دیکتاتۆرەکان لەسەر بێهیوای‌و نائومێدی خەڵك کاردەکەن. ئەمانە لەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتییە تایبەتەدا دێن بەناوی کۆتایهێنان بە نائارامی‌و پارچەپارچەیی‌و نادڵنیاییەوە دەدوێن.[3] لەراستیدا مژدەو بەڵێنەکانی دیکتاتۆرەکان هیچیان کەمتر نییە لەو مژدانەی کە مژدەبەخش‌و پێغەمبەران پەیامیان بۆ کردووەو خۆیان بۆ تەرخانکردووە، هەموو ئەمانەش بە درێژایی مێژوو سودیان لە بێهیوایی‌و بێئومێدی مرۆڤەکان کردووەو کاریان لەسەر کردووە، هاوکات هێزو توانای ئەو مژدانە لەبزواندنی یادەوەری‌و ئەو نوستالژیا گەورەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە دیارترین شوێنە

---

[3] هـ.س.پ، ل93-94

هەستیارەکانی مرۆڤن لە قولاییدا کە بە ئاسانی دەتوانرێت لەرێی داگیرکردنی ژیان و سەرچاوە ئابوری و سیاسی و فەرهەنگی و ژیارییەکانەوە کاریان تێبکرێت و بەکاربهێنرێت.

## دیکتاتۆرە بچوکەکان

دیکتاتۆر تەنها ئەو کەسایەتییە کاریزمییە نییە بەتەنها، بەڵکە کاریزمایەکی دابەشبووە بەسەر سەرلەبەری سەرچاوەو پێکهاتە ژیارییەکانی ئەو کلێشەسازییە شارستانییەی کە مرۆڤەکان لەچەند یەکەیەکی دیاریکراوی بەرجەستەدا کۆدەکاتەوە، ئەم دەرئەنجامە لە کۆمەڵگا داخراوەکاندا زیاتر دەردەکەوێت، کەواتە دیکتاتۆری بچوك کێیە؟ ئایا هەمان دیکتاتۆرە لەمیناتۆرێکی وێناکراودا یان کلێشەسازییەکی جیاوازترە؟ ئەو پانتاییە گەورانەی کە دیکتاتۆرە بچوکەکان مۆنۆپۆلی دەکەن و سەرجەم وردەکاریەکانی ستەمکاری تیادا پراکتیزەدەکەن دیکتاتۆرە گەورەکان بە چەند قۆناغێکی یەکلەدوایەکی پاوانکردن و ستەمکاری دەگەنە ئەو دەرەنجامە.

لەنێوان ئیرادەی تۆو ئیرادەی دەسەڵاتدا بۆشاییەکی گەورە هەیە، رەنگە پردێکی پەیوەندی هەبێت، دەسەڵات بەردەوام لە رایەڵکردنی پەیوەندیەکانیدا گرفتاری کۆکردنەوەی سەرلەبەری جەماوەرە لەژێر یەك چەتری سیاسی و یەك سەقفی ئابوری و تاکەیەك باخچەی پەرژینبۆکراوی فەرهەنگیدا، هاوکات لەکۆمەڵگا داخراوەکاندا کە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری یان ستەمکاری یان تۆتالیتاریی بەرێوەی دەبات، ئەو پردەی کە لەنێوان هاوڵاتیان و

دەسەڵاتدا دروستدەبێت تاکەیەك ئاڕاستەی هەیە، کە ئاڕاستەیەکی داخوازیگەرانەیە لەدەسەڵاتێکی موتڵەقەوە بۆ هاوڵاتیان، کۆنترۆڵکردنو پەروەردەکردنو ئاڕاستەکردنی ئیرادەیەکی باڵاو رەها بەسەر تەواوی هاوڵاتیاندا، هەروەها لەکۆمەڵگا داخراوەکانیشدا کە دەسەڵات دابەشدەبێت بەسەر سەرلەبەری ناوەندەکانی هێزدا کە لەئەمارەتی حیزبەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە بچوکترین خانەی کۆمەڵایەتیو دامودەزگا حکومیو حیزبییەکان.

ئەوەی لەو کۆمەڵگایانەدا کە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری تیایدا لەئارادایە حسابی بۆ ناکرێت، رایگشتی هاوڵاتیانەو مافە هەرە سەرتاییەکانی تاکەکەسو مافەمەدەنییەکانی هاوڵاتیانو ئیرادەی جیاوازی مرۆڤەکانە، ئەوەی ناوی ئازادیە بونی نیە، هێندەی ستەمکاری سەروەرەو هێندەی مۆنۆپۆلیزەکردنی سەرچاوە ئابورییەکان لەلایەن دەسەڵاتو هێزەوە دەبنە ستراتیژی درێژخایەن، هێندە مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی هۆشیار بونی نیە. ئەو ناعەدالەتییە کۆمەڵایەتیەی کە لەژێر سایەی دیکتاتۆرەکاندا هەیە لەهیچ گۆشەیەکی ئەم دونیایەدا بونی نیە.

لەبەرئەوە زۆر بەسادەیی بۆئەوەی چیتر دیکتاتۆر دروستنەبێتەوەو ئەو سیستمە دیکتاتۆریە وێرانکەرانەی وەك سیتمی نازیو مۆسۆلۆنیو ستالینیو بەعسیزمو مەزهەبگەرایی ئێرانی دروستنەبنەوە، دەبێت بەلایەنی کەمەوە دەسەڵات حساب بۆ رایگشتی هاوڵاتیان بکاتو دەستنەخاتە سەرچاوە ئابوریو دەزگاییەکانو وەزارەتو ژیانەوەو مۆنۆپۆلی بکات. دەبێت حساب بۆ ئیرادەی جیاوازو خەونو دنیابینییە

جیاوازەکان بکات.، پێویستە ئۆپۆزسیۆنی سیاسیو فەرهەنگیو ئابوری دروستببنو دەبێت حیزب دوربکەوێتەوە لەپانتاییە فەرهەنگیو رۆشنبیریو کۆمەلایەتیو حکومییەکانو دامودەزگاییەکان، دەبێت میدیای ئازادو گروپەکانی فشار دروستببنو رێکخراوەکانی کۆمەلگەی مەدەنیو سەندیکاکان ببنە هێزگەلێکی رەخنەگریی چاودێرو ئەکتیف بەسەر دەسەلاتو حکومەتو حیزبەکانەوە.

مەرگی دیکتاتۆر بە تەنها لەهەر کۆمەلگەیەکدا نە کاریزماکانی دیکتاتۆر، نە خەونە دیکتاتۆرییەکان، نە دەسەلاتە ستەمکارو بەزەبروزەنگەکانی لەناودەبات؛ بەلکە ئەوەی گرنگە لێرەدا پاشماوەو سیتمە کۆنکرێتییەکانی دیکتاتۆرە، کە پێکهاتوون لەپەروەردەو فێرکردنی دیکتاتۆریانە، بیرکردنەوەو روانینو دنیابینی دیکتاتۆریانە، عەقلی داگیرکاریو پاوانکردن، سیستمی چاودێرکدنو سزاو پاداشت، عەقلیەتی بێیاخکردنی ژیانو شکۆدارکردنی مەرگو مەرگدۆستیو بێبایەخکردنی ژیان. هەموو ئەمانە پاشماوەی ئەو سەرزەمینە پاوانکراوەیە کە دیکتاتۆرەکان دروستیدەکەنو بۆ کۆمەلگەو دەسەلاتو بۆ سایکۆلۆژیای تاکەکانو تەواوی کۆمەلگەی بەجێیدەهێلن.

بۆئەوەی نەبینە دیکتاتۆر دەبێت ئەو روحە کاریزمییەی دیکتاۆر لەناو خۆماندا بکوژین، دەبێت دەولەمەندییەکانی دیکتاتۆر لەناو خۆماندا ئیفلاس پێبکەین، دەبێت نەبینە لاسایکەرەوەی ئەخلاقیاتی دیکتاتۆر لەداگیرکردنی ژیاندا. رەنگە هەزیلترین گروپی سیاسی ببێتە گەورەترین دیکتاتۆر، رەنگە کۆمەلێك حیزب مەهامەکانی دیکتاتۆرو ئەو هێزە کاریزماییە لەناو خۆیاندا دابەشبکەنو دیکتاتۆر بژێننەوەو

وێرانەیەکی دیکە بەرپابکەنەوە، هەر دەسەلاتێك حساب بۆ رایگشتی نەکات، چەند دەسەلاتێکی بچوك‌و موفلس بێت دەبێتە دیکتاتۆر. هەر دەسەلاتێك سەرچاوەی ژیان کۆنترۆڵ‌و مۆتۆپۆلیزە بکات بۆخۆی‌و هاوپەیمان‌و هاوڕوانینەکانی، ناکرێت پێی نەڵێین دیکتاتۆر، هەرچەند دیکتاتۆرێکی بچوکیش بێت هەمان ئەو هێزە بەکاردەهێنێت کە لەماشینی عەقڵیەتێکی دیتاتۆرییەوە سەرچاوە دەگرێت. هێندەی دیکتاتۆرە بچوکەکان دەبنە ستەمکاری گەورە؛ هێندە دیکتاتۆرە گەورەکان نایانەوێت ببنە ستەمکاری گەورە بگرە دەیانەوێت ببنە ستەمکارێکی پەنهان‌و نادیار.

## مۆنۆپۆلیزەکردنی بڕیارەکان

تەنها لە سیستمە دیکتاتۆرییەکاندا تەواوی راوبۆچوون‌و بیرکردنەوەکان دەبنە مولکی یەکەم‌و رەهاو بێقسەی ناوەندی حوکم‌و ئەو هەرەمە گەورەیەی کە زانیاری‌و ئامازەو شفرەو بڕیارەکانی پیادا دێتە خواری‌و دامودەزگاکانی دەسەلات پەیڕەو پیادەیدەکەن، ئەوەی جێی گفتوگۆو قسەکردن نیە تەواوی ئەو بڕیارو زانیاریانەیە کە لەسەرەوەی هەرەمەکەوە بە نهینی گەلاڵەدەکری‌و بە نهێنیدا دێتەخواری‌و ئاڕاستە دەکرێت.

هەر دەسەلاتێك لە دنیادا ئەم شێوازە بەکاربەرێت، ئەوا دەبێتە پەیڕەوکەری مۆراڵی دیکتاتۆری، کاتێك دەسەلات سەرچاوەکان مۆنۆپۆلیزە دەکات‌و سەرلەبەر داگیریان دەکات، تەنها ئەگەر گەورەترین بانگەواز بۆ دیموکراسیەت‌و کۆمەڵگای مەدەنیش بکات، دەبێت بە

دیکتاتۆر، لەبەرئەوە دیکتاتۆر هەر ئەوە نیە کە جینۆساید ئەنجامدەداتو تەواوی رووبەرەکانی ژیان لەکۆمەڵگەیەکدا دەکاتە بەندینخانەیەکی گەورە، نەخێر بەرلە هەرشتێك دیکتاتۆریەت ئەخلاقو بیرکردنەوەیە، ئەخلاقی مۆنۆپۆلیزەکردنی سەرچاوە ئابوریو سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان کۆمەڵە ئەخلاقێکی دیکتاتۆرین، ئەخلاقی بێگوێی دەسەڵات بەرامبەر هاولاتیانو حساب نەکردن بۆ رایگشتیو پشتگوێخستنی تەواوی رەخنەکانو ئەو گەندەڵییە ئیداریو ئابوریو وزاریانە بەشێکن لە مۆراڵی سیستمی دیکتاتۆری، هاوکات بێدەنگیو تەمەڵخانەی ئیداریو فەرهەنگیو رۆشنبیری بەشێکی گەورەی ئەخلاقی دیکتاتۆری پێکدەهێنن.

بۆئەوەی لەم دۆخە تێبگەین دەکرێت بگەرێینەوە بۆ سەر بۆچونێکی بەختیار عەلی کە دەڵێ: هێزی حیزبی ئێمە لەدوای راپەرینەوە پابەندی توانایەتی لەسەر پاوانکردنی زیاتری ئابوریو ئیدارەو هێزی میلیشیای بۆخۆی، واتە خودی هێزی حیزبەکان، ئەو هێزەیە کە لەکۆمەڵگای دەدزن، چونکە ئابوری مولکی کۆمەڵگایە مولکی حیزب نییە، هەرکاتێکیش ئابوری حکومەت لەئابوری حزیب جیانەکرایەوە، قسەکردن لە دیموکراسییەت، نوکتەیەکی گەورەیە. [4]، لەراستیدا لێرەدا ئێمە باس لەوە ناکەین کە ئەو دەسەڵاتەی لەکوردستاندا لەئارادایە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆرییە، نەخێر کێشەکە لەوەدا نییە کێ دیکتاتۆرەو کێ دیکتاتۆر نیە، بەڵکە کێشەکە لەوەدایە ئێمە ئەگەر وەك نمونەیەك باس لەدەسەڵاتی حیزب بکەین لەکوردستاندا،

---

[4] (بەختیار عەلی/ رۆشنبیر، کۆمەڵگا، دیموکراسیەت- گفتوگۆ-ل25)

ئەوا تەواوی حیزبەکانی کوردستان‌و بەتایبەتی هەردوو حیزبی دەسەلآتدار باس لە دیموکراسییەت‌و ژیانی مەدەنی‌و دنیای مۆدێرن دەکەن‌و کەناڵەکانی راگەیاندنەکانی خۆیان سیخناخ کردووە بە دروشمی پێکەوەژیان‌و ئازادی‌و دیموکراسی، بەلآم لە واقعدا ئەوەی حساب بێت بۆ رای هاولآتیان‌و رایگشتی نەکراوە، بە هیچ شێوەیەك لەئاست یەکتر قبوڵکردنیشدا نین، هیچ جیاوازییەك قبوڵناکەن، بەجیاوازییەکانی خۆشیانەوە، سەرجەم دەزگاو سەرچاوە ئابوری‌و سیاسییەکانیان بۆخۆیان مۆنۆپۆلکردوەو بونەتە سەرداری تەواوی سەرچاوەکان‌و راوبرپیارە چارەنوسسازەکان.

ئەورۆکە کێشەکە لەوەدا نییە ئێمە کۆمەڵگەیەکی تەندروستین یان نا، بەڵکە گرفتی هەرە گەورە لێرەوە دەستپێدەکات ئایا لەنێوان بێدەنگی‌و دەسەلآتدا ناوەندێك هەیە بۆ بەرپاکردنی جیاوازی‌و جێکردنەوەی دنیابینییە جیاوازەکان لەسەرزەمینێکی پڕ لەگفتوگۆو گۆڕانکاری، نەخێر، ئایا هێزەکان دەتوانن یەکتر قبوڵبکەن لەدەرەوەی ئەو قەسەمی یەکترلەناوبردنە یەکتر ببینن‌و حساب بۆ رەخنەو بۆچونەکانی دەرەوەی ئەو تەمەڵخانەیە بکەن، ئالێرەوە کۆمەڵگا بەتەواوی چین‌و توێژەکانییەوە لە دروستبونی دیکتاتۆرە بچوکەکان دەترسێت، لەکاتێکدا بەرێوبەرێکی بەرێوبەرایەتێکی زۆر بچوك دەتوانێت ببێتە دیکتاتۆرو پەیرەوکەری تەریقەتی مۆنۆپۆلیزەکردن‌و خەلقکردنی گەندەڵی ئیداری، دەتوانێت حساب بۆ یەك رای بەرامبەر نەکات، هەزاران نمونەی لەم جۆرەمان هەیە، کاتێك دامودەزگاکان دەبنە دیکتاتۆر، کاتێك حیزبێك دەبێتە دیکتاتۆرو حساب بۆ رایگشتی هاولآتیان‌و رەخنەی رۆشنبیران ناکەن، کاتێك مامۆستایەك‌و بەرێوبەرێکی دائیرەیەك‌و کادرێکی بچوکی

حیزب و بەرپرسێکی عەنتەر لە شوێنگەکەی خۆیاندا دەبنە دیکتاتۆر، کاتێك شاعیرێك و رۆشنبیرێك دەبنە ستایشکار و زورناژەن بۆ حیزبی دەسەلاتدار، ئالێرەوە قسەکردن لەدیکتاتۆرە بچوکەکان قسەکردنێکی ئەکادیمییەو دەکرێت ببێتە جێی بایەخ و گفتوگۆی جدی لەسەر بکرێت.

## ئیفلاسی سیاسی و قاتوقڕی رایگشتی

سەرنجی ئێمە لەسەر ئەخلاقیات و بیرکردنەوەو ململانێی بچوکەکانی ستەمکاری و لێرەدا کورتدەکەینەوەو دەڵێین؛ شەڕەکانی ئێوە زۆر لەوە بچوکترن ببنە ململانێ و پڕۆژەی گەورە بۆ دروستکردنی جیاوازییەکی سیاسی و هێزێکی دیکە لەدەرەوەی هێزە تەقلیدییەکان و لەدەرەوەی تایەفەو تیرەو مەزهەب و ترادسیۆنە داخراوەکانی رەشەکۆمەلگای سونەتی و ئاینی، ئێوە نەکەوتونەتە دەرەوەی ئەو بازنەیەی عەقڵی خێڵ و سیاسەتی دەشتەکی تایەفەوتیرەوە، ئێوە بەبێ تێڕوانینێکی تاکڕەوانەی پڕ لەبێگوێی ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ شێوازە مۆدێرنەکانی رایگشتی و گوێگرتن لەداواکارییەکانی هاولاتیان و راوبۆچونی شەقام، کارەساتی ئیفلاسییە گەورەکانی سیاسەت و مەعریفەو دنیابینی و جیاوازییەکان لەو عەقڵیەتە بەبەردبووانەوە دەستپێدەکات کە قبوڵی هیچ دنیابینییەکی دیکە ناکەن.

کێشە لەوەدا نییە تۆ رازیت بەسەرجەم ئەو فشارانەو گوڵبارانی دەکەیت، رازیت بەخەیاڵەکانی خۆت و جیاوازییەکانی خۆت کوشتووەو رۆشنبیرەکانت ستایشت بۆدەکەن، نەخێر کێشەکە

لەوەدایە تۆ بەم هەموو بێئاگاییەوە، بەو هەموو مێژووە پڕ لەکارەساتەوە کە پڕە لە چەوسانەوەو کۆیلەیەتیو بێباکیو کوشتارو جینۆسایدو سڕینەوەی شوناسو قڕکردنی کۆمەڵگایەك لەڕووی کولتوریو شارستانیو کۆمەڵایەتیو شوناسو جەستەوە، روانینێکی دیکەت نییە لەدەرەوەی حساب نەکردن بۆ کۆمەڵگەو دەسەڵاتو رایگشتی. تۆ بەو هەموو ماڵوێرانییەوە، بەو هەموو ئیفلاسییەوە گوێ لەرایگشتی هاولاتیان ناگریتو حساب بۆ هیچ جیاوازییەك ناکەیتو بە ئارەزووی خۆت تەواوی سەرچاوەکان، واتە سەرچاوە ئابوریو سیاسیو کولتوریو حکومیو رۆشنبیرییەکانت لەناوچە لۆکاڵییەکاندا دابەشکردووەو سەرلەبەری ئەو سەرچاوانەتان مۆنۆپۆلیزەکردوەو رای هاولاتیانو رای ئازادتان خستۆتە ژێر پێتانەوە. (ئەزمونی دیکتاتۆرەکان وێنەیەکی دیکەی ستەمکاریمان بۆ وێنادەکات، کە بریتییە لەوەی کە هەرگیزاوهەرگیز حساب بۆ رایگشتی ناکەنو گوێ لەهیچ نەغمەیەکی جیاواز ناگرنو تەنها گوێ لەو نەغمە کۆنکرێتییەی خۆیانو هاودەردەکانی خۆیان دەگرنو گوێ لە ستایشکارانو موجامەلەچییەکانی دەوری مێزەکانیان دەگرنو هیچی تر.

## نەریتی بێئاگایی

بێئاگایی تەنها دۆخێکی دەرونی یان کۆمەڵایەتی یان تاکەکەسی نیە، بکەوێتە دەرەوەی مۆراڵو بیرکردنەوەو روانینەوە، ئەم چەمکە پەیوەندییەکی زۆر قوڵو مەعریفی هەیە بە

چوارچێوەی بیرکردنەوەو تێڕوانین و دنیابینییەکانەوە. تۆ بەبێ ئەو پەیوەندییە ناتوانیت هاوکێشەیەکی بەرجەستە بۆ خۆت دروستبکەیت تا بێئاگاییەکانی خۆتی پێ بەخێوبکەیت، بیرکردنەوە یەکێکە لە کەرەستە مۆدێرنەکانی مرۆڤ، یەکێکە لەسەرچاوە گەورەکانی ئەو ماشێنە گەورەیەی کە ناوی جیهانە، تۆ بەبێ بیرکردنەوە دەکەویتە دەرەوەی تێڕوانینەکان و بۆچوونەکان و دنیابینییەکانەوە، بیرکردنەوە یەکێك نییە لە پرنسیپە ئەخلاقییەکان، بەلاّم بەتوندی پەیوەستە بە مۆراڵ و شێواز و نەریتە جیاوازەکانەوە، ئالێرەوەیە کاتێك بیرکردنەوە دەبێتە شتێکی لاوەکی و بێبایەخ، هاوکێشەیەکی دیکە دێتەئاراوە بۆ بەرهەمهێنانی بێئاگایی و داخران بەسەر کەرەستە کۆن و سواوەکانی تێڕوانین و نەریتی باوی بێئاگایی لەپێناو مانەوەداو گەمژەیی لەپێناو ژیاندا.

کاتێك بێئاگایی راستەوخۆ دەکەوێتە نێو پێودانگە ژیاری و پانتاییە جیهانییەکانی دنیابینییەوە، دەرئەنجام خۆت و ماڵە داخراوەکەت، خۆت و کەرەستە کۆنەکانت، خۆت و مێژووەکەت، خۆت و یادەوەرییەکانت دەکەونە دەرەوەی گۆڕانکارییەکان و دەرەوەی پێشکەوتن و دەرەوەی سیاسەت و دەرەوەی حکومەت و دەرەوەی بەرژەوەندییە مۆدێرنەکان، کاتێك تۆ غەرقی جەهل و بەرژەوەندییە لۆکاڵیی و ناشەرعییەکان دەبیت، دەکەوێتە دەرەوەی ستراتیژەکان و لە پەراوێزی گۆڕانکارییەکاندا بەدنیایەك بێئاگاییەوە، بەدنیایەك خەیاڵی شکاوەوە، بەدنیایەك یادەوەری ئازاربەخشەوە دۆڕاوییەکانی خۆت دەژمێریت و سکالاّو گازندەکانت

دەکەیتە یاداشتو پەیامێکی هەزیلو وەهمەکانتی پێ گەورە دەکەیت، ئەمەیە دەرئەنجامی ئەو نەریتی بێئاگاییەی کە بۆتە ئەخلاقێکی هەزیل بۆ کوشتنی دنیابینییەکانو کوشتنی جیاوازییەکان. کاتێكماڵەکەت پڕدەکەیت لەوەهمی بچوكو بچوك ناتوانیت واقعبینانە سەیری دنیا بکەیتو لەدەرەوەی ئەو بازنە بێکۆتاییەی ئەو وەهمە دنیاکانی دیکەو روانینەکانی دیکە بخوێنیتەوە.

دەکرێت لێرەوە بگەڕێینەوە سەر چەمکی دیموکراسی، دیموکراسی بۆیە پەسەندە لەبەر ئەم هۆیانە: دەرئەنجام دوورەپەرێزییە لەدیکتاتۆریو دابینکەری مافە سەرەتاییو مەدەنییەکانی تاکەسو کۆمەلگایە، لەئەنجامدا ئازادی گشتیو مافی چارەی خۆنوسینو سەربەخۆیی ئەخلاقیو ئالوگۆڕکێی مرۆڤو پارێزگاری بەرژەوەندییەکانی تاکەکەسو یەکسانی سیاسی لێدەکەوێتەوە، هەروەها لەسیستمی دیموکراسی مۆدێرنیشدا ئاشتیخوازیو گەشەو پەرەپێدانو هەلکردنو یەکترقبولکردنو قبولکردنی جیاوازییەکانو حسابکردن بۆ رایگشتی هاولاتیانو رەخنەکانیان پەیرەودەکرێتو دەبنە کۆڵەکە گرنگەکانی دیموکراسی.

لەکۆتاییدا؛ ئەم رەخنانە تەنها دانانی ئەو ئاوێنەیەیە کە پێویستە بۆ دەسەلاتو کۆمەلگا دابنرێت تا روخساری ئێستاو مێژووی خۆیان ببینن، وەك بەختیار عەلی دەڵێت: ئەو کۆمەلگایەی داوادەکات رۆشنبیرەکانی ستایشی فەزڵەکانی بکەن، دەوری واعیزی

مزگەوتی بۆ ببینن، کۆمەڵگایەکە لەوە دەترسێت، رۆشنبیرێك لەدایکبێت، ئاوێنەیەکی بۆ دابنێتو روخساری خۆی ببینێت.

پێویستە بەر لەهەر هەنگاوێکی پراکتیکی بەرەو کۆمەڵگەیەکی مۆدێرنو شارستانی، خەیاڵەکانی دیکتاتۆرییو ئەخلاقیاتو روانینەکانی دیکتاتۆریی لەخۆماندا بکوژین، دیموکراسیەت بەرلەوەی هەنگاوێکی پراکتیکی بێت، دەیان هەنگاوی تیۆریو ئەخلاقیو هزرییە، لەبەرئەوە ئەو دیموکراسییەتو یاسا مەدەنیانەی کە لە کەناڵەکانی دەسەڵاتەوە بەئێمە دەگات، تەنها کلێشەیەکی دیکتاتۆریو ستەمکارانەیەو هیچی تر، چونکە ئەو مۆدێلەی دیموکراسی کە حساب بۆ رایگشتی ناکاتو دنیایەك نایەکسانی کۆمەڵایەتیو ئابوریو راژەیی بۆ هاوڵاتیان دروستدەکات، بێجگە لەئەخلاقیاتو روانینێکی دیکتاتۆری هیچی دیکەی لەپشتەوە نییە.

*رەنگە بەکارهێنانی چەمکێکی لەم جۆرە هێندەی دۆزینەوەی رەهەندەگەلێکی فەنتازی بێت هێندە راڤەکردنی زاراوەیەك نەبێتو ناساندنی چەمکێك نەبێت، بەڵکە دۆزینەوەی ئەو رەهەندە فەنتازیو خەیاڵپێنەکراوانەیە کە دەبنە هێزگەلێکی لەرادەبەدەری دیارینەکراو بۆ کونترۆڵکردنو خەساندنی کۆمەڵگە لەرێی کۆنترۆڵکردنی ژیانو خەیاڵو خولیاکانی تاکەکەسو چاودێرکردنی بیرکردنەوەو هزرو هەر جیاوازییەك کە ناکەوێتە سەرزەمینە وەهمیو مۆنۆپۆلکراوەکەی ئەو سیستمەوە کە جیاوازی بەهەموو تەرزەکانییەوە بچوکدەبێتەوە بۆ نزمترین ئاستی بینینو فەنابوون،*

وێرانکردنــــی کۆمەڵگەیـــەك بەگــشتی لــەڕێی تۆخکردنـــەوەو ڕەشکردنەوەی ناعەدالـەتیو کاڵکردنـەوەی مـرۆڤو مافە مـەدەنیو سیاسـیو کولتورییـەکانی ئینـسانگەلێك کــە دەکەونــە پانتاییـە دیـسپلینکراوەکەی ئـەو سیـستمەوە، کـە دنیاکـە بـۆ بـەرپاکردنی زەبــروزەنگو مــەرگو وێرانکردنـــی ژیـان زۆر بـــە ســادەییو وێرانکردنـی سـایکۆلۆژیای تاکەکـەسو نائومێـدکردنی سـەرتاپای کۆمەڵگـە لـەڕێی ئـەو ماشـێنە ئـاڵۆزەوە کـە کـاری بـچوکردنەوەی پرۆژەو خەونو ئارەزووەکانی مرۆڤەو کاری سڕینەوەی حەقیقەتو نەفی کردنی ئەوی دییە.

# دەسەڵاتی کوشندە

"خەڵکی لەژێر کۆنترۆڵی ستەمکاران بەسادەیی دەبنە کەسی ترسنۆك و باڵادەستی قبوڵ دەکەن."ئاتین دۆلابۆتی

ئەو دەسەڵاتانەی بانگەشە بۆ دیموکراسیەت دەکەن و هوتاف دەکێشن بۆ مافی مرۆڤ و بەڵێنی وەهمی بە هاوڵاتیان دەفرۆشنەوەو فریان بەدنیای مۆدێرنەوە نیە لەدەسەڵاتە دیکتاتۆرو ستەمکارەکان کوشندەترن.

دەسەڵاتی کوشندە تەنها دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری یان ستەمکاری یان تۆتالیتاری نیە، بەڵام بەشێکی جیانەکراوەیە لەو دەسەڵاتانە، روحێکی گەورەی هەژمونگەرو سەرومرە لەپشت ئەو دەسەڵاتانەوە کە ماشێنیکی گەورەی بیرکەرەوەو داڕێژەرو داگیرکردنە، دەسەڵاتێکە بۆ خەساندنی ژیان و کۆمەڵگە، هاوکات دەسەڵاتێکە بۆ بەرپاکردنی کاریزمایەکی گەورەی چاودێرکردن و کۆنترۆڵکردنی کایەو پێکهاتە کۆمەڵگایی و کولتوری و سیاسی و ئابوری و رۆشنبیرییەکان.

بەلاّم سەرباری ئەوەی دەسەلاّتە دیکتاتۆرو تۆتالیتاریەکان خاوەنی هێزێکی گەورەی بەرهەمهێنانی ستەمکاریو وێرانکردنی کۆمەڵگەن لەڕووی فەرهەنگیو ئابورییەوە، هاوکات خاوەنی سیحرێکی گەورەی مانەوەن لەعەقڵیەتو روانینو بیرکردنەوەی دەسەلاّتەکانی پاش خۆیان، بەواتایەك ئەوەی لەدیکتاتۆرو ستەمکارەکان دەمێنێتەوە تەنها یادەوەریو مێژووی سەرکوتکردنو چاودێرکردنو کاولکارییەکان نین، بەڵکە ئەو میراتە گەورەیە بۆ دەسەلاّتو حکومەتە نادیموکراتو نامۆدێرنەکان جێدێڵێ کە پێکهاتەیەکی ئاڵۆزە لەمورالّو سیستمێکی کۆنکرێتی بۆ چاودێرکردنی کۆمەڵگەو مرۆڤەکانو میراتێکی گەورە بۆ بێبایەخکردنی مرۆڤو ئەو سەرمایە رەمزیو کولتوریو رۆشنبیرییانەی کە دەبنە هێزگەلێکی فەرهەنگیو شارستانی کۆمەڵگە، میراتێکی گەورەوگرانی کوشتنی جیاوازییەکانو روانینو دنیابینییەکانە، لە سندوقی ئەو میراتە بەجێماوەدا دنیایەك ماشێنی کوشتنی خەونو داواکارییەکانو مافە مەدەنیو فەرهەنگییەکانی هاولاّتیانی تیادایە، ماشێنی کوشتنی رایگشتیو میدیای ئازاد، ماشێنی چاودێرکردنو کۆنترۆڵکردنی تاکەکەسو کۆمەڵگە، ماشێنی داگیرکردنی سەرلەبەری دەزگا رۆشنبیریو فەرهەنگیو سیاسیو ئابوریو مۆدێرنەکان، ماشێنی چەوسانەوەی ئابوریو وێرانکردنی ژێرخانی کۆمەڵگەو تالاّنکردنی ژیان، ماشێنی دروستکردنی کاریزمای کارتۆنیو موقەدەساتی بەتالّ لەماهیەتو پڕ لەسەروەریو یادەوەری تۆزلێنیشتوو، ماشێنی سازکردنی فیستیڤاڵی ساختەو کەرنەڤالّی ستایشکردنو خۆدەرخستن، ماشێنی جۆشدانو خرۆشاندنی کۆمەڵگە لەرێی بۆنەو موناسەبەی حیزبیو نیشتیمانیەوە

ساختەکردنو دروستکردنی پاڵەوانی وەهمیو زیندووکردنەوەی جەنگاوەرە تۆزلێنیشتوەکانو هەڵواسینی وێنەی سەرکردە کۆنەکانو سەرۆکەکان لەدائیرە حکومیو حیزبییەکانو دابەشکردنی پۆستەری رۆخساری تورەو پڕ لەزەردەخەنەی سەرۆکەکان بەسەر هاوڵاتیاندا.

ماشێنێکی دیکەی ئەم میراتە گەورەیەی دیکتاتۆرەکان بریتییە لەماشێنی بەرپاکردنی ناعەدالەتییە گەورەکانو گەندەڵییە بێسەروبەرەکان، ماشێنی کاوکردنی کۆمەڵگە بە دروشمو هوتافکێشان، ماشێنی سازدانی خۆشباوەڕی بۆ کۆمەڵگەو بەختەوەری بۆ دەسەڵات، ماشێنی خولقاندنی حکومەتی وەهمیو پەرلەمانی کارتۆنیو رابواردن بە سەرووەری یاساو مافەکانی مرۆڤ.

بۆئەوەی لەوێرانەییەکانی دەسەڵاتێك تێبگەین کە لەڕووی فەرهەنگیو مەعریفییەوە خاوەنی کەلاوەیەکی گەورەی تێگەیشتنو بیرکردنەوەو پرۆژەی دواخستنی کۆمەڵگەیە لەڕووی شارستانییەوە. دەبێت بەر لەهەرشتێك باس لەحکومەتو دەسەڵاتی ئاوین(شەفاف)و بەرپرسیارو دامودەزگایی بکەین، وەك چۆن بۆئەوەی لەسیستمی دیکتاتۆریو رژێمە ستەمکارەکان تێبگەین، دەبێت شتێك لەدیموکراسیو لیبرالیەتو کۆمەملگەی کراوە بزانینو ئەو جومگە سەرەکیانە بدۆزینەوە کە دەبنە نێوەندی گرێدانەوەو پەیوەندی کۆمەڵگە بە پێشکەوتنەوە.

جۆن ستیوارت میل (1873-1806) کوڕە گەورەکەی جیمیز میل لەکتێبەکەی خۆیدا بەناوی (ئازادی) دەڵێت: "تەواوی مرۆڤایەتیش مافی ئەوەی نیە دەمی کەسێکی ناڕەزامەندو نەیار

ببەستیّو ڕێگەی دەربڕینی بیروباوەڕەکانی لێبگرێت. چونکە ئەگەر وانەبێت، هەرگیز مرۆڤایەتی بەبیروباوەڕو ڕوانینی نوێ، ئاشنا نابێتو لەدۆخێکی لەوجۆرەدا ڕێگای گەشەو پێشکەوتن دەبەسترێت، واتە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی مافی بیرکردنەوەو هۆشمەندێتیو دەربڕینی بیروڕاکانی هەیەو لەپلەوپایەی عەقڵو دانایی مرۆڤ ناوەشێتەوە کەبببێتە لەمپەری بەردەم بڵاوبوونەوەی هزرو بیروباوەڕی هاوڕەگەزانەی وەك خۆی". ئەو دەسەلاّتانەی دەبنە ڕێگرێکی جاهیلانە یان مۆدێرنانە لەبەردەم ڕوانینو دنیابینیە جیاوازەکانداو دەبنە ماشێنێکی زەبەلاحی وەهمی بۆ بێبایەخکردنی ڕەخنەو میدیای ئازاد دەسەلاّتگەلێکی جاهیلن بەدنیای مۆدێرنو هاوکات دەبنە ماشێنێکی گەورەی بەرهەمهێنانی سەلەفیەتو دواکەوتنو حیکایەتی کوشندە.

دواجار ئەم مۆدێلە پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی کۆلێکتە لەدنیای کلاسیكو دنیای مۆدێرن، واتە پانتاییەکی گەورەی یادەوەریو مێژوو، حیکایەتو موقەدەساتە، هاوکات بەکاربەرێکی بێمەعریفەو دواکەوتووی تەکنۆلۆژیای مۆدێرنە لە (تەلەفیزیۆنەوە بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤار، لە کەناڵی ئاسمانییەوە بۆ سایتی ئینتەرنێت، لەدەزگای ڕۆشنبیرییەوە بۆ کۆمپانیای ئابوریو سیاسیو فەرهەنگی، لەوتاری سیاسییەوە بۆ بەڵێنی وەهمی، لەکاریزمای بەتاڵەوە بۆ حیکایەتی کوشندە، لەریفۆرمەوە بۆ تالاّنکردنی ژیانو ڕووتکردنەووەی مرۆڤ لەهەر چالاکیو ئومێدێك، لەبەرپاکردنی تەمەڵخانەیەکی گەورەوە بۆ گرتێبەردانی ناعەدالەتی،

لەئاسایکردنەوەی گەندەڵییەوە بۆ ئیفلیج کردنی هەر گۆڕانکارییەك).

دەسەڵات بەر لەهەرشتێك هەڵگری تایبەتمەندی بەرپرسیارێتییەو پەیوەندییەکی ززۆر قوڵو کاریگەرو شارستانی پێکیانەوە دەبەستێت، هەروەها ئەم پەیوەندییە درێژ دەبێتەوە بۆ پەیوەندی نێوان سیاسەت بە رایگشتییەوە، پەیوەندی دامەزراوە فەرهەنگیو رۆشنبیریو شارستانییەکان بە ژیانی خەڵكو پاراستنی سەربەخۆییانەوە.

دەسەلاتی بەرپرسیار، واتە دەسەلاتێك کە بیردەکاتەوە، خاوەنی دەسەلاتێکی ئاوینو گوێگرە، حکومەتێکە کە هاولاتیان بەئاسانی دەتوانن دەسەلاتی یاسادانانو جێبەجێکردنو پەرلەمان لەیەکدی جیابکەنەوە، ، بەواتایەك پەرلەمان دەبێتە زمانحاڵی هاولاتیانو تاوتوێکاری یاساو رایگشتیو نارەزاییەکان، هەروەها دەبێتە نێوەندی هەڵسەنگاندنی پرۆژەو گورانکارییەکان، دەبێتە پانتاییەکی گفتوگۆئامێز بۆ شیکردنەوەو راقەکاریو هەڵسەنگاندنی بۆچونو بریارە سیاسیو ئابوریو فەرهەنگیو پەروەردەییەکان.

ڤالتەر لیپ (1930)نوسەری ئەمریکایی، دەڵێت: دیموکراسی گوزارشتە لەدەزگایەك یاخود میکانیزمێکە کە بەپێی توانا یەکانگیری ئیرادەی کۆمەلایەتی خەڵك بێت، چونکە هەتا کۆنترۆڵو چاودێری حکومەتو دەوڵەت لەکاروباری کۆمەلایەتی خەڵکدا زیاتر بێت، ئاسایشو ئارامی خەڵك کەمتر دەبێتەوە.. کاتێك دەسەلات دەبێتە ماشێنێکی گەورە بۆ داگیرکردنی ژیانو سەرلەبەری کایەو

پێکهاتە ئابوری‌و سیاسی‌و فەرهەنگی‌و کۆمەڵایەتییەکان، سەرباری ئەو داگیرکارییە جاهیلانەیە، جارێکی دیکە دەبێتەوە بە زمانحاڵی تەواوی کۆمەڵگەو گروپە جیاوازەکان، جارێك دەبێت بە قسەکەرێکی ئایدۆلۆژی، ماوەیەکی دیکە دەبێت بە خوتبەبێژێکی ئاینی، ناوبەناو دەبێت بە گوتەبێژێکی دیکتاتۆرو رەهاگەر، هاوکات بەردەوام دەبێتە قسەکەرێکی کاریزمی بۆ بەرهەمهێنان‌و پەخشکردنی وەهم‌و خۆشباوەڕی، خولقاندنی فەنتازیای چاوەڕوانی‌و سازکردنی سەرزەمینێکی وێکچووی پڕ لەبێئاگایی، بەڵام لێوانلێو لەوەهم، خاڵی لەژیان بەڵام لێوان لەحیکایەتخوازی‌و یادەوەریپەرستی‌و پیرۆزخوازی‌و حیزبسالاری‌و دواکەتوخوازی‌و جەهلخوازی.

دەسەڵاتی بەرپرسیار، واتە بەرپرسیار بەرامبەر ژیانی هاوڵاتیان‌و باشترکردنی بژێوی ژیان‌و گوزەرانی تاکەکەس‌و کۆمەڵگە، هاوکات لەپشت دەسەڵاتە مۆدێرنەکانەوە دەستەیەکی پروفیشناڵ‌و راڤەکارو سەربەخۆ ئامادەگیان هەیە، کە دەستەیەکە دابەشدەبێت بەسەر چەند بەشێکی کاریگەرو بیرکەرەوەدا، کە کارکردن‌و بیرکردنەوەی دامودەزگایی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەم دەستەیە رێگرێکی گەورەیە لەبەردەم بڕیارە سەربەخۆکانی سەرۆکدا، رێگرێکی گەورەیە لەبەردەم دەخالەتی حیزب‌و هێزە کۆنەپەرست‌و جاهیلەکانی حیزب‌و خێڵ‌و پیاوە خلافاوەکانی نێو حکومەت‌و سیاسەت، دەستەی پروفیشناڵ‌و ئەکادیمست پێکهاتووە لەکۆمەڵە کەسێکی بەتواناو راڤەکارو پرۆفیسۆر لەبوارە جیاجیاکاندا، بەسەر ئەم بەشانەدا دابەش دەبن: بەشی

تێگەیشتن لەسیاسەتو ڕاڤەکردنی گۆڕانکاریو پێشهاتە سیاسییەکانو شیکردنەوەی بڕیارە سیاسییەکانو داڕشتنی دبلۆماسیو پەیوەندیو بڕیارو سازدانی گۆڕانکاریو پێشکەوتنی سیاسی.

بەشی دووەم، پێکهاتووە لەکەسانی پروفیشناڵ لەبواری ئابوریو گەشەپێدانو سازدانی گۆڕانکاریی ئابوریو گەشەپێدانو پێشخستنی کۆمەڵگە، ئەم دەستەیە بیرکەرەوەو ڕاڤەکارو داڕێژەری پرۆژەی گەورەن بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵگە، لەڕوی ئابورییەوەو داڕشتنی میکانیزمی جیاواز بۆ بەرزکردنەوەی داهاتو پێویستییەکانی کۆمەڵگە، بۆ دروستکردنو گەشەپێدانی پیشەسازیو کشتوکاڵو سەروەتو سامانی کۆمەڵگە، بۆ ڕێگرتن لەهەڵاوسانی ئابوریو نزمبوونەوەی داهاتی ساڵانەی تاکەکەس. هاوکات ئەمە دەستەیە پێکنەهاتووە لەکۆمەڵێك ڕاوێژکاری موچەخۆری بێئیشو بێ پرۆژە، دەستەیەکی تەمەڵ نیە لەڕووی زانستیو ئەکادمییەوە، واتە دەستەیەکی نەخوێنەوارو حیزبی نین کە فریان بەدونیای مۆدێرنو گۆرانکاریو گەشەپێدانەوە نەبێت. بەواتایەك دەستەیەکە بەرلەوەی سەرۆکی حکومەت یان سەرۆکی حیزبەکانی دەسەڵات بڕیاری سەقەتو بێبەرنامە لەڕێی تەلەفیزیۆنەکانیانەوە بلاوبکەنەوە، ئەم دەستەیە دەبێتە ڕێگرێکی مەعریفی لەبەردەم دیکتاتۆریەتی بڕیارو تاك بیرکردنەوەو خۆبەخۆیو عەنتەریات.

دەستەیەکی دیکەش لەپشت حکومەتە مۆدێرنەکانی دونیاوە ئامادەگی بەرچاوی هەیە، ئەویش دەستەی ئەکادمیستو ڕۆشنبیرو هونەرمەندە جدییەکانە، ئەم دەستەیە کارلەسەر گەشەپێدانو گۆڕانکاری

فەرهەنگی‌و رۆشنبیری دەکات، ئەم دەستەیە خاوەنی پلان‌و بەرنامەی فەرهەنگی‌و ڕۆشنبیرییە، دەستەیەکە بۆ رێزگرتن‌و شکۆدارکردنی رۆشنبیری‌و مەعریفە، دەستەیەك نیە بۆ ناشرینکردنی رۆشنبیری‌و جوانکردنی حیزب، دەستەیەك نیە بۆ سازدانی فیستیڤاڵ‌و کەرنەڤاڵی ساختەو بێبەرنامەو پڕ لەشکۆدارکردنی مەکرەمەکانی حیزب‌و جوانکردنی رووی ناشرینی ناعەدالەتی‌و گەندەڵی‌و خەونکوشتن، بەڵکە دەستەیەکە بۆ گەشەپێدان بە بیرۆکەو راوبۆچونە جیاوازەکان، بەلام دەستەیەك نیە بۆ کوشتنی خەون‌و وێرانکردن‌و تالانکردنی پرۆژەو بێبایەخکردنی رۆشنبیری‌و فەرهەنگ‌و مەعریفەو رەخنەگرتن.

هاوکات بێجگە لەم دەستانە کۆمەڵێك دەستەی دیکەی ئەکادیمی‌و پرۆفیشناڵ لەپشت حکومەتە مۆدێرنەکانەوە بەردەوام ئامادەگیان هەیە کە کاریان ئەوەیە بە هزرو روانین‌و بیرکردنەوەو راڤەکاری‌و دانانی پلان بەرنامە بۆ حکومەت دادەنێن، وەك دەستەی پلان دانان، دەستەی راگەیاندن‌و پەیوەندی، دەستەی ئەنترۆپۆلۆژیست‌و سایکۆلۆژیست‌و سۆسۆلۆژیست بۆ تێگەیشتن لەکۆمەڵگەو تاکەکەس‌و گروپە جیاوازەکان لەرووی مرۆڤناسی‌و کولتورناسی‌و دەرونی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئاینی‌و فەرهەنگییەوە.

حکومەتی بەرپرسیار ئەو حکومەتە مۆدێرن‌و دامودەزگایی‌و شەفافەیە کە لەرووی سیاسی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و دارای‌و میدیاییەوە بەرپرسیارە بەرامبەر کۆمەڵگە، بەرپرسیارە بەرامبەر بەرزکردنەوەی داهاتی سالانەی تاکەکەس‌و کۆمەڵگە، بەرپرسیارە بەرامبەر باشترکردنی ژیانی هاولاتیان، بەرپرسیارە بەرامبەر

گەشەپێدانی ئابوری‌و سیاسەت‌و فەرهەنگ‌و رۆشنبیری‌و رێزگرتن لەدەزگا فەرهەنگی‌و گروپە سەربەخۆکان، هاوکات بەرپرسیاریشە لەئاشکراکردنی داهات‌و بودجەی حکومەت‌و دیاریکردن‌و پۆلینکردنی ئەو بودجەیەی حکومەت بۆئەوەی چیتر بزانرێت بودجەی حکومەت‌و داهاتەکانی بۆچی بەکاردەهێنرێت‌و چەند پرۆژەی لێ جێبەجێ دەکرێت‌و چەندی لێدەمێنێتەوەو چەندی دیارنامێنێت.

زۆر بەسادەیی ئەمەیە دەسەڵاتی بەرپرسیارو شەفاف، بەڵام بەرامبەر ئەم مۆدێلە مۆدێرن‌و کراوەیەی دەسەڵات، دەسەڵاتێکی دیکەش لەئارادایە، کە ئێمە لەم نوسینەدا ناوی دەنێین دەسەڵاتی کوشندە یان حکومەتی نابەرپرسیارو ناشەفاف، حکومەت‌و دەسەڵاتی موتڵەقی حیزب (دەسەڵاتی کوشندە). کە لەراستیدا یەکێکە لەمۆدێلە هەرە ناشرینەکانی دەسەڵات‌و حکومەت، کە ناعەدالەتی لەم جۆرە دەسەڵاتانەدا دەگاتە ئەوپەری نەخوێنەواری‌و بێئاگایی‌و کاولکاری، گەندەڵی دەگاتە ئەوپەڕی رووتکردنەوەی کۆمەلگەو بەتاڵانبردنی ژیان، دەگاتە ئەوپەڕی جەهل بە کۆمەڵگەو گیرفان دورین بۆ بەرپرس‌و سەرۆك‌و ئەحبابی حیزب‌و عەنتەرەکانی کۆمەڵگە، دەگاتە ئەوپەڕی فەرهودکردنی داهاتی هاوڵاتیان‌و دەوڵەمەندبونی بەرپرسەکان، ئەوپەڕی بازرگانیکردنێکی مشەخۆرانەو خوێنخۆرانەو بڕینی گیرفانی هاوڵاتیان‌و سازکردنی سەرزەمینێکی شەرابی بۆ خەونە ناشرینەکانی خۆیان لەرێی داگیرکردنی زۆرترین پانتایی دەوڵەمەندبون‌و تاڵانکردنی ژیان‌و

گوزەرانی هاولاتیان. واتە سازدانی سەرزەمینێکی گەورەی بەرەلایی و نابەرپرسیارێتی و بەرپاکردنی یاسای جەنگەڵ و کوشتنی روانین و رەخنە و دنیابینییە مۆدێرنەکان و شکۆدارکردنی حیکایەتە کوشندەکان و سەروەرییە کارتۆنییەکان و رامکردن و دەستەمۆکردنی مرۆڤ لەچوارچێوەیەکی وەهمی و لەقەفەزێکی داخراوی لێوانلێو لەناعەدالەتی و بێدەنگی.

هاوکات ئەم مۆدێلە خاوەنی عەقلێتێکی کۆنزێرڤاتیڤ و نابەرپرس و ناعادیلە، عەقلێتێکە خوازیاری داگیرکردنی سەرلەبەری سەرچاوە ئابوری و فەرهەنگی رۆشنبیری و میدیایی و سیاسییەکانە، عەقلێتێکە هەلگری حەشارگەیەکی پەنهانە بۆ کۆنترۆلکردنی کۆمەلگە لەرێی کۆنەپەرستی و چەوساندنەوەی ئابورییەوە.

## حکومەت و مزگەوت و مۆبایل و سۆپەرمارکێت

ئەم مۆدێلە ناشرینەی دەسەلات، بەرلەوەی بیربکاتەوە بڕیاردەدات، بەرلەوەی خەونی هەبێت، خەونەکانی دیکەو ڕوانین و دنیابینییەکانی دیکە دەکوژێت، بەرلەوەی گوێ لەرایگشتی و راوێژکاران و راڤەکاران و ئەکادیمیستەکان بگرێت گوێ لەهەژارترین مۆدێلی حیزب دەگرێت و بڕیاردەدات دەرگاکانی بەڕووی رەخنەگراندا دابخات و پەنجەرەکانی بەڕووی هاولاتیاندا دابخات و گوێکانی پڕبکات لەموجامەلە و ستایش و پیاهەلدان و دایان بخات، بەرلەوەی بزانێت کۆمەلگە پێویستی بەچییە و داواکارییە

هەنوکەیـەکانی کۆمەڵگـە چـینو چارەسـەرە ریـشەیەکانی پێـشکەوتنو گەشەکردن چین بۆ رزگارکردنی کۆمەڵگە لەدواکەوتوییو وێرانەیی ئابوریو فەرهەنگیو شارستانی هەڵدەستێت بەدروستکردنی سەدان مزگەوت لەشارو شارۆچکەو لادێکاندا(بۆنمونە لەشارۆچکەیەکی بچوکدا تـەغار دەگاتـە پـەنجا مزگەوت، بەڵام تاکە دواناوەندییەك هەیە لەو شارۆچکەیەدا، نـە پەیمانگە هەیە نە زانکۆ نە کافتریا بۆ گەنج هەیە، نە سـەنتەرێکی گـەنجان هەیـە، نـە دەزگایەکی رۆشنبیری نە ناوەندێکی فەرهەنگی).

بەرلـەوەی ئـەم دەسـەڵاتە بزانێـت ئاسـانترین ئۆپـشنو ئەکـشن کـۆپیکردنی زمـانو فـۆنتێکی زمـانی خۆماڵییـە، سـەرۆکی حکومـەت هەڵدەستێت بـە ریکلام کـردن بـۆ کۆمپانیایـەکی دەرەکیو بیـانی لـەناخی دڵەوە پیرۆزباییو دەستخۆشیان لێدەکات، بـەڵام ئـەم سـەرۆكو دەسـەڵاتو مەلحەمەتـە بـۆ چرکەسـاتێك لەتوانایـدا نیـە دەستخۆشـی لەرۆماننوسـێکی بەتوانای وڵات بکـات، یـان سوپاسگوزاری ئـەو رۆشـنبیرانە بێـت کـە کاریـان لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوە بـووە لەسـەر کۆمەڵگـەو دەسـەڵاتو فەرهـەنگ، دەبوایـە سـەرۆکی حکومـەت چـاوی ئـەو کۆمپیوتەریستە بەتوانایانـە مـاچ بکات کە سالآنێك لەمەوبـەر فـۆنتی کوردیـان دروسـتکردو زمـانی کوردیـان لەسیستمی کۆمپیوتەردا دارشت (مـن وەك نوسـەرێك زۆر دەستخۆشـی لـەو کۆرو کچە بەتوانایانە دەکـەم کـە لـەخۆرئاواو کوردسـتان سـەرباری قورسـی ژیانیـان بەسـەربەخۆی خۆیـان هەڵـسان بەدروسـتکردنی فـۆنتی کـوردیو ئێمـەیان ئاشـناکرد بـەو زانـستە جوانـە). بـەڵام هـیچ سـەرکردەیەك، هـیچ پیـاوێکی سیاسـی خـەوتوو خەبـەری نـەبۆوە تـا دەستخۆشـی لـەم کەسـە دڵسۆزانە بکات.

هاوکـات کردنـەوەی سـەدان مزگـەوتو دیوەخـانی خێـڵو عەشـرەتە خۆشەویـستەکانو ئەحبابـەکانی حیـزب، بەڵگـەی جـەهلێکی کوشـندەیە بـەدونیای مـۆدێرن، خـەونێکی کۆنزێرڤاتیڤانـەو کۆنەپەرسـتانەیە بـۆ زیندوکردنەوەی خوداناسییەکی کێورانـەو پاڵەوانێتیـەکی خـاڵی لەخـەونو ئازایەتی، بەڵام پڕ لەتەنەکورو وەهم، ...رەنگە خوێنـەرێکی حیزبـی بڵێـت ئایـە لـەم نوسـینەدا دەسـەڵاتو مزگـەوت دەخرێنەبـەر راڤـەکاریو بەراوردەوە..؟ منـیش هـەر لێـرەدا وەڵامـی دەدەمـەوەو دەڵـێم : حکومـەتو حیزبو مزگەوتو دیوەخـان پەیوەندییـەکی زۆر قـوڵو کاریگـەریان هەیـە بەیەکـــەوە، دەســـەڵاتی نـــامۆدێرنو بەهـــەمان شـــێوە دەســـەڵاتە دیکتاتۆریـەکانیش بـەردەوام بـۆ هێـشتنەوەی خۆیـانو دەنـگو سـیمایو رەمـزو کاریزمـای خۆیـان کۆمـەڵێك شـێوازی کلاسـیكو ئـاینیو مـۆدێرن دەگرنەبەر وەك دروستکردنو سازدانی سەدان مزگەوتو دیوەخانی خێـڵو بارەگای حیزبیو دامودەزگای بەناو روشـنبیریو فەرهـەنگیو تەعزێخانـەو چـلەخانەو حیزبخانـــەو ئایدۆلۆژیاخانـــەو گەعدەخانـــەو تیاترۆخانـــەو بەنزینخانـــەی حیزبـــیو عەنتەرخانـــەو میوانخانـــەو موبایـــل خانـــەو ســـوپەرمارکێتو تەلـەفیزیۆن خانـــەو رادیـــۆ خانـــەو رۆژنامەخانـــەو گۆڤارخانەو فیستیڤاڵ خانەو موناسەبە خانەو یادخانەو سەروەری خانـەو موقەدەسـات خانـە....تـاد، هـەموو ئـەم خانانـە وێنـاکراوێکی خـەیاڵی نـین، بەڵکـە سـازکردنێکی پانتاییـەکی گـەورەی بێئاگـاییو کاولکارییـە لـەڕووی مـــەعریفیو فەرهەنگییـــەوە، هاوکـــات شـــێوازگەلێکی ســـتەمکارانەی ســـایکۆلۆژیو کۆمەڵایـەتیو فەرهەنگییـە بـۆ داگیرکردنـی کۆمەڵگـەو سـازکردنی تەمەڵخانەیـەکی گـەورەی شارسـتانیو کۆمەڵایـەتی، هاوکـات

بەكارهێنانی ئەم میكانیزمانە دەبێتە ڕێگرێكی گەورە لەبەردەم نوێخوازیو عەقڵو ڕوانینو دنیابینی جیاوازو نوێ.

نوسەرێكە ئێرانی (د. عەباس عەلی سەحافیان) بە نیگەرانییەكی گەورەوە بەراوردێكی سادەو ساكار دەكات لەنێوان دیموكراسیو دیكتاتۆریداو دەڵێت: لە دیموكراسیدا؛ دەسەڵاتداران بەدەنگی خەڵك دەگەنە دەسەڵاتو بەدەنگی خەڵكیش لەدەسەڵات كەنارگیر دەكرێن. لەدیكتاتۆریشدا دەسەڵاتداران ڕەنگە بەدەنگی خەڵك بگەنە دەسەڵات، بەڵام هەرگیز بەدەنگی خەڵك لەدەسەڵات كەنارگیر ناكرێن.

مایەی شانازییە بۆ خەڵكی یۆنان كە (2500) ساڵ لەمەوبەر، دەسەڵاتی ئەسینا ئازادی بیروباوەڕو ڕادەربڕینو ڕای خەڵكی بەهەند وەرگرتووە، لەكاتێكدا ئەمڕو لەكۆتایی سەدەی بیستەمدا ئەم ئازادییە لەزۆرینەی وڵاتانو كۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بوونی نییە.

ئالان تۆرین لەئاماژەیەكدا چەمكی دیموكراسی لەو ستراكچەرە كۆنكرێتییە دادەماڵێت كە تەنها بریتی بێت لەكۆمەڵێك دروشمی دووبارەو چوارچێوەیەكی سنورداری سیاسی یان فەرهەنگیو دەڵێت: "دیموكراسی مرۆڤایەتی داناماڵێت بۆ تەنها هاوڵاتی، بەڵكە وەك تاكەكەسێكی ئازاد دانیپیادەنێت، بەڵكە وەك تاكەكەسێكی پەیوەست بەكۆگەڵە ئابوری یان ڕۆشنبیرییەكانیش ئیعترافی پێدەكات."

دواتر درێژە دەدات بەئاماژەكانیو دەڵێت: "سیستمی دیموكراسی بریتیە لەداڕشتەیەكی ژیانی سیاسی كە ژمارەیەكی زۆر بەزۆرترین ئازادی تەیار دەكات، هاوكات داڕشتەیەكە كە پارێزگاری فراوانترین هەمەچەشنی پێویست دەكاتو دانیپێدا دەنێت."

ئـەو هێزانـەی لـەدنیادا کولتـورێکی دیکتـاتۆری‌و سـەراپاگیری سیاسـی‌و ئابورییـان هەیـە، هێزگـەلێکی شـەڕانگێزن‌و روانـین‌و دنیابینییـەکی مەرگدۆسـتیان هەیـە بـۆ وێرانکردنـی ژیـان‌و کوشـتنی خـەون‌و روانـین‌و دنیابینییەکانی هێزو فەرهەنگەکانی دیکە. بەدرێژایی مێژوو لەپاڵ کولتوری لێکبوردن‌و یەکتری قبوڵکردن‌و پێکەوەژیاندا دەسەڵاتگەلێکی کوشندە کاریان داگیرکردنی سەرلەبەری سەرچاوە ئابوری‌و شارستانییەکان بووە.

# دەسەڵاتی بەختەوەر و کۆمەڵگەی خۆشباوەڕ

(پڕۆژەی وێرانکردنی کۆمەڵگەو بێبایەخکردنی ژیان)

لەڕاستیدا لێرەدا ئێمە باس لەوە ناکەین کە دەسەڵاتگەلێکی دیکتاتۆری تا ئەوڕۆکە هێزگەلێکی پاوانخوازی وێرانکارن بۆ داگیرکردنی کۆمەڵگەو سەرلەبەری سەرچاوە ماددیو فەرهەنگییەکانی کۆمەڵگە، نەخێر کێشەکە لەوەدا نیە کێ دیکتاتۆرەو کێ دیکتاتۆر نیە، بەڵکە گرفتەکە لەوێوە دەسپێدەکات کە دەسەڵاتگەلێکی دیکتاتۆری ئەم سەردەمە هەن کە بوونەتە زمانحاڵی یەکەمی دیموکراسییەتو ژیانی مەدەنیو دنیای مۆدێرنو کەناڵەکانی راگەیاندن سیخناخ دەکەن بە دروشمی پێکەوەژیانو ئازادیو دیموکراسی، بەلاّم لەواقعدا ئەوەی حساب بێت بۆ رای هاولاّتیانو رایگشتی ناکرێتو دواجار ئەم دەسەلاّتانە بێجگە لەوەی کە دەسەلاّتێکی بەختەوەرن بە خۆشباوەڕییەکانی کۆمەڵگە هیچی تر نیین.

دەسەلآتی بەختەوەر ئەو دەسەلآتە دەوڵەمەندەیە کە تاکەیەك خەون لەپشتییوە ئامادەیەو دەبێتە داینەمۆی بەرێوەوبردنو ئەکتیڤبوونی، ئەو خەونەش خەونی زوو دەوڵەمەندبوونو بودجەی زۆروزەوەندەی خاوەنداریێتییە، بەواتایەك ئەو دەسەلآتە بەردەوام لەهەوڵی تالآکردنی ژیاندایە بۆخۆی وەك سەرچاوەیەك بۆ داگیرکردنی داهاتەکانی کۆمەڵگە، واتە بۆ حیزبو فیرعەونە بچوکەکانی بۆ سەرۆكو رەعیەتە نزیکەکانی بۆ وەزیرو ئەندام پەرلەمانە بێدەنگو رامکراوەکانی، ئەم دەسەلآتە بەردەوام کاردەکات بۆ بچوککردنەوەی ژیان لەتاکەیەك حیکایەتی سەروەریو پرکردنی ژیان لەدروشمی بەتاڵو لە موقەدەساتی خاڵی لە سیحرو رەمزو کاریزما (بەواتایەك ئەو دەسەلآتە بەردەوام لەهەوڵی بەکاریزماکردنی ئەو موقەدەساتانەدایە)، ئەم دەسەلآتە بەشێوەیەك لەشێوەکان نایەوێت لەئێستای مۆدێرندا بژی، بەلآم دەیەوێتو کار بۆ ئەوە دەکات ببێتە درێژکراوەی رابردوویەکی پڕ لەحیکایەتو سەروەری، بەواتایەك دەسەلآتێکی کۆنزێڤاتیڤە، رابردوخوازو یادەوەریخوازو مێژووخوازە، هاوکات لەوەهمی رابردووەوە ئێستا رەنگرێژدەکاتو کلێشەسازێکی بەسەلیقەیە بۆ وێناکردنی ئێستای کۆمەڵگە لەوەهمێکی سەرتاسەری بێئەندازەدا، بۆ مانەوەی خۆیو دارشتنەوەی لەساتەوەختە جیاجیاکانی سەردەمە جیاوازەکاندا. یادەوەریخوازە بەو مانایەی ئەم دەسەلآتە بۆ هێشتنەوەی بەختەوەریو دەوڵەمەندییەکانی ئێستای بەردەوام خوێن لەسەروەرییەکانی رابردووەوە وەردەگرێتو سەرلەبەری

دروشمەکانو بەڵێنەکانی بۆنی یادەوەرییەکی تەپتۆزخواردووی لێوەدێت، دەسەڵاتێکە تاسەرئێسك لەیادەوەرییە سەیروسەمەرەکانی خۆیدا دەژی.

ئەم دەسەڵاتە لەتوانایدایە ساتەوەختەکانی ئێستای کۆمەڵگەو ژیان پڕبکات لەبەهاکانی رابردوو لەمەرگو کارەساتەکانی ناومێژوو، بۆ هێشتنەوەی خۆی لەسەر کورسی دەسەڵات خوازیارە سەرلەبەری رۆژژمێرەکان پڕبکات لەشەهیدو ترسو کارەساتو وێرانەییەکان، لەکاتێکدا شەهید لەلای دەسەڵاتی بەختەوەر کارتێکە بۆ بردنەوەی هەڵبژاردنو دەسخەڕۆکردنی ئێستاو یادەوەرییەکانی کۆمەڵگە، تەنها لافیتەیەکی رەشە بۆ هەڵواسینی بە ئێستادا، یادێکە بۆ رازاندنەوەی سفرەی بەختەوەریو پڕکردنەوەی عیشوەی مانەوە، کە دەبنە سەروەری بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بەختەوەریو چێژی بێئاگایی.

دەسەڵاتی بەختەوەر دەسەڵاتێکی حیزبسالارو دیکتاتۆرە، بەو واتایەی دەسەڵاتی دیکتاتۆری ئەو دەسەڵاتە هەژمونگەرو داگیرکارەیە کە سەرلەبەری سەرچاوەکانی ژیانو ئابوریو سیاسەتو ژیانی شارستانیو تەواوی کۆمەڵگەو فەرهەنگو دەزگا شارستانیو رۆشنبیریو ئابورییەکان داگیرو کۆنترۆڵ دەکاتو خۆی دەکات بە خاوەنی یەکەمی هەموو ئەم بوارانەو دەرەنجام خۆی بەختەوەر دەکات بە چێژی خاوەندارێتیکردنو داگیرکردنی هەموو بوارەکان.

هاوکات کار لەسەر کۆنکرێتکردنو سواغدانی ئەو ناوەندانە دەکات بە روانینو دنیابینییە داخراوەکانی خۆی، ئەو دەسەڵاتەی بەم شێوازە بیردەکاتەوە سەرباری ئەوەی دەسەڵاتێکی نامۆدێرنو

ناشارستانییه، دەسەڵاتێکی وێرانکارو کاولکاریشە بۆ بچوککردنەوەی کۆمەڵگەو ئەو ئاستە ژیارییەی کە فەرهەنگو دنیابینی کۆمەڵگەی پیادا تێدەپەڕێت، ئەو دەسەڵاتە سەرباری ئەوەی دەسەڵاتێکی نەرجیسیو خۆپەرستە، دەسەڵاتێکیشە خوازیاری سەپاندنی تاکەیەك روانینو بیرکردنەوەی حیزبیانە یان ئایدۆلۆژیانەیە.

ئەوکاتە بەختەوەرە کە تەواوی کۆمەڵگەو دەزگاو ناوەندەکانی ژیانی داگیرکردوەو تەواوی کۆمەڵگە وەك ئەو بیردەکەنەوە، هاوکات کەس بۆی نەبێت بڵێت نەخێر، ئەو دەسەڵاتە خوازیاری دەرهێنانی وشەی نەخێرە لەفەرهەنگو زمانی وتووێژ، شاگەشکە دەبێت بە بەڵێو سەرڕاوەشاندنو چەپڵەڕێزانو هەڵپەرکێو سازشو هوتافکێشان، دواجار دەسەڵاتی بەختەوەر ئەو دەسەڵاتەیە کە بەردەوام لەهەوڵی کوشتنی نەخێرەکاندایە، بەردەوام لەسڕینەوەی ناڕەزاییو جیاوازییەکاندایە، هەمیشە لەهەوڵی بێبایەخکردنی رەخنەو گفتوگۆو رۆشنبیریو ئاستە جیاجیاکانی هزرو دنیابینییەکاندایە. ستراتیژی ئەم جۆرە دەسەڵاتانە بریتییە لەبێدەنگکردنی کۆمەڵگەو خەساندنی کۆمەڵگە بە وەهمو سازکردنی سەرزەمینێکی گەورەی خۆشباوەڕی.

ئەو دەسەڵاتەی وەك دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکانی دنیا دەستدەگرێت بەسەر سەرلەبەری سەرچاوە ئابورییەکانداو داگیریان دەکات، دەرەنجام دەوڵەمەند دەبێت، پاش ئەو دەوڵەمەندبوونە ناشەرعیو نادادپەروەرانەیە، هەڵدەستێت بەسازدانی کەرنەڤاڵو فیستیڤاڵ بۆ شکۆدارکردنو قەبەکردنی قەبارەی خۆیو بچوککردنەوەی ژیان،

زەبــەلاحکردنی هێزەکــانی نــاوخۆ وەك پــۆلیس‌و ئاســایش‌و دەزگــا نهێنییــەکانی حیــزب‌و بێبایــەخکردنی قسەکردن‌و ڕەخنــەکان‌و ئاستی ڕۆشنبیری، هەڵدەستێت بە پڕکردنی گیرفانە سێ بەچوارەکانی خۆیان‌و تــالاّنکردنی گیرفانــە بــچوکەکانی هــاوڵاتی، وێرانکردنــی شــار لــەڕێی تــاریککردن‌و موحتــاجکردنی مــرۆڤ‌و چەوســانەوەی هــاوڵاتی لــەڕێی وێرانکردنــی بــژێوی ژیانییــەوە بەرامبــەر بەرزکردنــەوەی تــەلارەکانی خۆیان‌و جوانکردنی هۆڵی کۆبوونــەوەکان‌و بەتاڵکردنــەوەی پەرلــەمان‌و وەزارەتــەکان لەڕەخنــەو پڕکردنــەوەی لەبێــدەنگی‌و موچــەی زۆرو تەمــەڵی، دەســەڵاتی بەختــەوەر بــۆ ئــەم پڕۆســەیە داراییــەکی بــاش هەڵدەڕژێت بۆ ئینشانوس‌و راپۆرتنوس‌و عەریزەنوسە بێئیشەکانی نــاو دەســەڵات بۆئــەوەی تەلــەفزیۆن‌و رادیــۆو ڕۆژنامــەکان پــڕ بکــەن لەهوتافکێــشان‌و دروشمــی بــەتاڵ لــەماناو راســتگۆیی، پڕیانبکــەن لەستایش‌و خەونی ڕەنگاڵەیی‌و وەهمی. هاوکات ئەم دەسەڵاتە بەردەوام لەهــەوڵی خۆڕازاندنــەوەو ماکیــاجکردن دایــە، بۆنمونــە لــەبری تەلەفزیۆنێکی لۆکاڵی خۆی دەکات بەخاوەنی چەندین کەناڵ‌و میدیای لۆکاڵی‌و سەتەلایتی، لەبری تاکەیەك رادیۆی پڕ لەدەنگی نارەزایی دەیان رادیۆی پڕ لەگۆرانی هەمەڕەنگ‌و پڕ لــەدروشمی بــەتاڵ‌و پــڕ لەهەواڵی ســەرمێزو حیکایــەت‌و نوکتــەی حیزبــی، هــەروەها لــەبری تاکەیــەك بلاّوکراوەی حەزینی ڕەشوسپی، سەدان ڕۆژنامــەو گۆڤــارو هەفتەنامــەو وەرزەنامــەو ســاڵنامە دەکــات بــە زمانحــاڵی بەختەوەرییــەکانی خــۆی‌و خۆشباوەڕپێکردنی کۆمەڵگە، دەیانکات بە مینبەری دەوڵەمەندییەکانی خۆی‌و کەلاوەکانی ژیان، لەبری ژوورێکی بچکۆلە بۆ دەرکردنــی چــەند

بلاَوكراوەیـەكی رەشوسـپی، چـەندین دەزگـای رۆشـنبیریو حیزبـیو دۆستەكانی خۆی دەخاتە كـار بـۆ چەواشـەكردنی رایگشتی هاولاَتیـانو دەوروبەرو كۆمەلگەی نیَودەولەتی.

دواجـار دەسـەلاَتی بەختـەوەر هەرچـەندە سـەرلەبەری سەرچـاوە تەكنیكیو فەرهەنگییەكانی دنیای مۆدیَرن بۆخـۆی داگیردەكـات، بـەلاَم ئەو دەسـەلاَتەیە كـە فـرِی بـەدنیای مـۆدیَرنو بوژانـەوەی فەرهـەنگیو شارسـتانیو كرانـەوەی كۆمەلگـەوە نیـە، لەبەرئـەوەی دەسـەلاَتیَكە تاسەرئیَسك باوەرِی بە قبولكردنی جیاوازییەكان نیە، بـاوەرِی بـە مافـە مەدەنییـەكانی هاولاَتیـان نیـە، بـەردەوام لەپیَـشیَلكردنی مافـەكانی مرۆڤدایـە، هاوكـات دەسـەلاَتیَكە بـە موتلـەقی بـاوەرِی بـەوە هەیـە كـە دەبیَـت خۆشـگوزەرانییەكان بۆخـۆی بیَـتو ویَرانییـەكان بـۆ كۆمەلگـە، تەلارەكان بۆخۆیو كریَچیَتیو كەلاوەكان بۆ كۆمەلگە، موچەی بیَسنور بۆخۆیانو ئیفلاسیو هەژاری بۆ هاولاَتیان، زەویو باخەكان بۆخۆیـانو شـەهیدەكان بـۆ كۆمەلگـە، ئاشـتبوونەوەكان بۆخۆیـانو بیَهیـوایو بیَئومیَدی بـۆ كۆمەلگـە، گەشـتوگوزارو خۆشـگوزەرانییەكان بۆخۆیـانو ئەحبابەكانیان، كەئابەو بیَزاریو سەرهەلگرتنو ئاوارەیی بۆ هاولاَتیان، كارەباو روناكییـەكان بخۆیـانو چـراو تـاریكیو راكەرِاكـە بـۆ كۆمـەلانی خەلك. سوتەمەنیو ساردكەرەوەو گەرمكەرەوەو ژووری نوستنی تاوس بۆخۆیـانو سـەرەی بـەنزینو بیَكارەبـاییو كیَـشەی نیـشتەجیَبوون بـۆ خەلك.

دەسـەلاَتی بەختـەوەر میكـانیزمیَكی سادەوسـاكار بـەكاردەبات بـۆ كـۆنترۆلكردنو بیَـدەنگكردنی ناوەنـدەكانی دەسـەلاَتو دەزگـا

رۆشــــنبیرییەکانو رۆژنامـــەو تەلەفیزۆنــــەکان، ئـــەو میکانیزمــــەش بێدەنگکردنــە لــەرێی پێــدانی موچــەیەکی زۆرو بەخــشینی خــەڵاتو پاداشتی گوێڕایەڵی، بۆنمونـە پەرلـەمانتارێك لـەبری ئـەوەی موچـەیەکی ئاسایی وەربگرێت موچەکەی دەکەن بە (3.600$)سێ هەزارو شەسـەد دۆلارو قسوری دەدەنێ، ئەمە بێجگە لـە مەسـروفاتو منحـەی مەترسـی، وەزیرێــك لــەبری ئــەوەی موچــەیەکی مــەعقولی بــدەنێ، موچــەیەکی نامـەعقولو ناشایـستەی دەدەنـێ کـە لەموچـەی پەرلـەمانتارێك زیـاترەو (36)ئەوەنـدە لەموچـەی دەرچـویەکی زانکـۆ زیـاترە، ئەمـە بێجگـە لـە موچـــەی خـــەیاڵی ســـەرۆکی حکومـــەتو جێگرەکـــەیو بەرپرســـە حیزبییەکانو نەسـریەی سیحری ِ بودجـەی لابـەلای حیـزبو پاداشـتو مەکرەمەی ئەملاولا، لەڕاستیدا دەتوانین ناوێکی دیکەش ببڕین بـەبالای دەســـەلاتی بەختـــەوەردا، ئـــەویش قۆنتەراتخانــــە یــــان تەمەڵخانـــەو بێدەنگخانە.

کۆمەلگەی خۆشباوەڕیش ئەو جۆرە کۆمەلگەیەیە کە باوەڕی بە بەلێنە وەهمییەکانو هوتافکێشانو میـدیاکانی دەسـەلات هەیـە، یـان کۆمەلگەیەکە تواناى جیاکردنەوەی راستییەکانی نیە لەدرۆکان، یان تاسەرئێـسك بێئومێـدە لەگۆڕانکارییـەکانو بەلێنــەکانو گرفتـاری بێدەنگییــەکی کوشــندەیەو بــە سەرســامییەوە دانیــشتووە بــەدیار کاولبونی ژیانو بێمانییەکانەوە.

کۆمەلگـەی خۆشـباوەڕ کۆمەلگەیــەکی وەهمییــە، واتـە کۆمەلگەیەکـە ســەرلەبەری ستراکــچەرەکانی پێکهاتەگــەلێکی وەهمــین، وەك دامــەزراوە یاسـاییەکان، پەرلــەمان، دەســەلاتی وەهمــی ســەروەری یاســا، ناوەنــدەکانی

راگەیانــــدن، دەزگـــاو رێکخـــراوە پیـــشەیی و ســـەندیکایی و حکـــومی و ناحکومییـــەکان، هاوکـــات لەبەرئـــەوەی ســـەرلەبەری دەزگـــاو ناوەنـــدە رۆشـنبیری و فەرهەنگییـەکان دامەزراوەگـەلێکی حیزبـی یـان پاشـکۆی ئـەو ناوەنـدە داخراوانـەن، کەواتـە ئـەوانیش ناوەندگـەلێکی وەهمـی و بێـدەنگ و پەخـشکاری خۆشـباوەڕییەکانن، هـەروەها لـەم جـۆرە کۆمەڵگەیانـەدا دەیـان حیزبـــی وەهمـــی هەیـــە، هـــەزاران ئەکتیڤیـــست و ئەنـــدازیاری وەهـــم و خۆشـــباوەڕی بیرکـــەرەوەو داڕێـــژەری بەرنامەگـــەلێکی سەرتاســـەرین بـــۆ خامۆشـــکردن و بێـــدەنگکردن و خەفـــەکردنی کۆمەڵگـــەو دنیابینییـــە جیاوازەکـان، وەك مـەلاو خوتبەبێـژەکان، شـاعیرو نوسـەرە ئایدۆلۆژیـست و حیزبییـــەکان، راپۆرتنـــوس و رۆژنامەنوســـە حیزبییـــەکان، راوێـــژکارو پرۆفیـسۆرە سـاختەکارەکان، بانگەشـەکاران و هوتافکێـشەرانی دەسـەڵات و حیزب.

## حکومەتی وەهمی

کاتێك ناعەدالەتی و نامرۆڤایەتی و ناشارستانی دەگاتـە ئەوپـەڕی بێمانـایی و ئەوپـەڕی جـەهل و ئەوپـەڕی بێبـاکی، ئـیتر چاوەڕوانی وەڵامدانەوە چ بایەخێکی هەیە، لەبەرئەوەی ئێمەی مرۆڤ پێمانوایە تاکـە بوونـەوەرێك کـە توانـای وەڵامدانـەوەی هەیـە بـە قسەکردن و گفتوگۆ بەشەرە.

ئـــەو دەســـەڵاتانەی وەڵامـــی رۆشـــنبیران و رەخنـــەگران و رۆژنامەنوســـان و هونەرمەنـــدان و هاوڵاتیـــان نادەنـــەوە تاسەرئێـــسك جاهیلن، بەڵێ جـاهیلن بـە دیموکراسیەت و سادەترین مـافی مـرۆڤ و فەرهەنـگ و شارستانیەت و رۆشنبیری، بەڵێ ئێـوەی بێـدەنگ و ئێـوەی

بێباك و ئێوەی خەوتوو، ئێوەی تێروتەسەلی کۆبونەوە بەتاڵەکانتان، لێوانلێو لەدەوڵەمەندییە بێبەهرییەکانتان، لێورێژ لە نامەعریفیەت و ناڕۆشنبیریتان.

لەراستیدا ئەو حکومەتانەی کە ناتوانن سادەترین و ساکارترین و بچوکترین ماف بۆ هاوڵاتیان دابین بکەن، وەك کارەباو خزمەتگوزاری و سوتەمەنی و نیشەجێبوون، حکومەتگەلێکی فاشیلن لەرووی کارگێڕی و بەرێووەبردن و حوکمڕانییەوە، بەڵێ ئەو حکومەتانەی تەنها شانازی بە موقەدەسات و شۆڕش و سەردەمی شاخ و سەروەرییەکانیانەوە دەکەن حکومەتێکی وەهمین، بەواتایەك ئەو دەسەڵاتە فڕی بە ئێستاوە نەماوە، دەسەڵاتێکی وەهمییەو پێیوایە یان هەستدەکات حکومەتە، بەڵام لەراستیدا حکومەت نیە.

ئەو حکومەتەی گوێ لەهیچ شتێك ناگرێت و پێیوایە حساب بۆ خەڵك ناکات و رایگشتی خستۆتە ژێر پێیەوەو حساب بۆ میدیای ئازادو رەخنەگرەکان ناکات، حکومەتێکی کارتۆنییە، بەتاڵە لەهەر روانینێکی زانستی و ئەکادیمی بۆ دنیا، بەڵام پڕە لە نائاگایی و بێباکی و خەمساردی و ناعەدالەتی و تەشریفات و موجامەلەو وێرانەیی و جەهل، بەواتایەك تەمەڵخانەیەکی گەورەوگرانی بەخێوکردنی جەهل و وەهمە.

لەراستیدا ئەو حکومەتانەی کە وەڵامی هیچ رەخنەیەك نادەنەوە حکومەتێکی نابەرپرسیارو بێ پرۆژەن، حکومەتێکە ستراکچەرەکەی زۆر لەو ماڵە هەزیلە وێرانترە کە لە لم دروستدەکرێت و ژوورەکانی پڕن لەهەواو قەڵایەکە بێئەندازە

وەهمییەو کۆشکێکە بۆ شاردنەوەی بێباکی. کاتێك ئێمەی مرۆڤ قسە لەگەڵ یەکتردا دەکەین، لەگفتوگۆو رووبەروبونەوەکانماندا وەڵامی یەکتری دەدەینەوە، لەڕێی ئەم پرۆسەیەشەوە لەیەکتری تێدەگەین، بەڵام کاتێك تۆی ئینسان بەردەوام قسە بۆ یەکێك دەکەیتو وەڵامت ناداتەوە، ئەگەر تۆی مروڤ هەستت کرد هەزاران کەس گوێت لێدەگرنو تەنها یەك کەس گوێت لێناگرێت، ئەوا یەکڕا دەگەیتە ئەو باوەڕەی کە ئەو مرۆڤەی تۆ قسەی بۆ دەکەیت یان رەخنەی لێدەگریت مرۆڤێکی نابەرپرسو تێنەگەیشتووەو ناشارستانییە، هاوکات کاتێك تۆی مرۆڤ رەخنە لەحکومەت دەگریتو وەڵامت ناداتەوە، کە شتێکی هونەری نیە، یەکڕا هەستدەکەیت حکومەتو جێگرو وەزیرو پەرلەمانتارەکانت بێئاگاو خەمساردو نابەرپرو نادیموکراتو ناشارستانین.

خوێنەرانی ئازیز ئەو حکومەتانەی پێیانوایە خۆپیشاندانو نارەزایی دەربڕینو مانگرتنو رەخنەگرتن زەرەری هەیە بۆ ئاسایشی نەتەوەییو برا مەزهەبییەکانمانو دەبێت بە دارو بەلیسو قۆناغە تفەنگو فیشەكو زیندانیکردنی کوێرانە وەڵامیان بدرێتەوە، بە حەقەت دەسەڵاتو حکومەتێکی دواکەوتوونو وێرانن لەرووی شارستانییەوە، ئەوەی نوێنەرایەتی ئەو جۆرە بیرکردنەوانەش دەکات با وەزیر بێت یان ئەندام پەرلەمان یان بەرپرسی حیزبی، ئینسانگەلێکی بێئاگان لەکۆمەڵگەو ژیانی مۆدێرنو فریان بەسەر ئەو چەمکە رەنگاڵەیانەوە نیە کە رۆژانە تەلەفزیۆنو رۆژنامەو رادیۆکانی لێپڕدەکەنو کۆمەڵگەی پێ خاڵیدەکەنەوە.

ئەو حکومەتانەی بەردەوام لەهەوڵی کوشتنی خەون و دنیابینی و داواکاری و پرۆژەو بیرکردنەوەو روانینی هاولاتیاندان هەمیشە لەهەوڵی خۆدزینەوەو گوێنەگرتن و وەلام نەدانەوەو نابەرپرسیاریدان، هاوکات فریان بەسەر دنیای مۆدێرن و دیموکراسییەتەوە نییە، دەرەنجام حکومەتێکی کەئیب و بەرهەمهێنەری کەئابەن بۆ هاولاتیان و بەردەوام لەهەوڵی گەشەپێدانی حوزن و بێهیواییدان بۆ تەواوی کۆمەلگەو سەرلەبەری ناوەندەکانی ژیان.

پاش ئەوەی لەهەموو لایەکەوە رەخنە لەمجۆرە حکومەتانە دەگیرێت و لەهەموو شوێنێکدا.. لەماڵەکان و لەچاخانەکان و لەدائیرەکان و لەناو پاس و لەناو کۆڕوکۆبونەوە رۆشنبیرییەکان و لەشانۆگەرییەکاندا، لەرێی مزگەوت و پیاسەی سەر شەقامەکان و لەرێی ئیمەیل و ئینتەنێت و لەسەر رووی رۆژنامەو لەدڵی هەریەکێکدا دنیایەك رەخنەو نارەزایی توند هەیە، کاتێك لەدڵی هەموو یەکێك لەئەندامانی ئەو کۆمەلگایانەی کە خاوەنی حکومەتێکی بێگوێن بەراستی جوێن بە حکومەت دەدرێت و بەراستی تف لەو رۆژگارانە دەکرێت کە بەرێزو حورمەتەوە لەبەردەم سندوقەکانی دەنگداندا دەوەستان و دەنگیان دەدا بە هیچ. کاتێك هاولاتیان بەجیدی رێزو حورمەتیان هەیە بۆ ژیان و جوانکردنی هەر ساتەوەختێك کە بۆنی چاوەروانی لێدێت، بەلام بە پێچەوانەوە حکومەتەکەی رێز بۆ هیچ شتێك دانانێت و بەحورمەتەوە وەلامی هیچ داواکاری و نارەزایی و رەخنەیەك

ناداتەوە کە بۆنی ژیانی لێبێت، ئەوکاتە تۆی مرۆڤ هەستدەکەیت.. ئیتر تۆ خاوەنی حکومەتێکی وەهمیتو لەخەیاڵی خۆتدا حکومەتێکت هەیە حسابت بۆ دەکاتو لەوباوەڕەدایت گوێت لێدەگرێت، بەڵام کاتێك لەو خەیاڵە شیرینە بێداردەبیتەوە سەیردەکەیت لەکەلاوەیەکدایت بەناوی ژیانەوەو لەوێرانەیەکدایت بەناوی حوکمڕانیو سەروەرییەوە.

ئەو حکومەتانەی پێیانوایە دەرەنجامی وەڵامنەدانەوەیانو حساب نەکردن بۆ رەخنەو رایگشتی دەبێتە هۆی ئەوەی ئیتر کەس تاقەتی رەخنەی نامێنێتو هەموان لەپڕێکدا کۆڵ دەدەن، بەداخەوە ئەو خەیاڵە پاقلاوەییە زۆر بچوکە لەبەردەم نوسینو رەخنەی ئەو نوسەرە جیدیو سەبەخۆیانەدا.

ئەو دەسەڵاتانەی لەخەیاڵی ئەوەدا دەژین کە وەڵامنەدانەوەیان دەیانگەیەنێتە بەختەوەریو گوێنەگرتن لەرەخنە دەیانگەیەنێتە نەشوە، دەسەڵاتگەلێکی وەهمیو نادیموکراتو نامۆدێرنو جاهیلن، لەبەرئەوەی کەسی بێگوێ ئەو کەسەیە کە جەهلێکی کوشندەی هەیە بەدنیای دەرەوەی خۆیو دنیای گۆڕانکارییە گەورەکان.

کاتێك تۆی مرۆڤ دەبیتە خەرمانێکی گەورە لەچاوەڕوانیو بەتەمابوون ئەوکاتە ئیتر خەونەکانت بەکوڵی خەمەوە گەورە دەبنو خۆت بچوکدەبیتەوە، ئەوکاتە خەیاڵەکانت دەبنە دێوەزمەو خۆت دەبیتە جانەوەرێکی بچوك، واتە کاتێك تۆی ئینسان بەردەوام چاوەوڕوانی باشبونی کارەباو هاتنەوەی کارەباو ئاو و چاوەڕوانی

هەرزانییەکی خەیاڵیت لەبێمانایی گرانی بازاڕو بژێوی ژیاندا، کاتێك تۆ چاوەڕوانی دوو ژوور دەبیت بۆ دابەشکردنی تەنهاییەکانی خۆتو هاوژینەکەت بەسەر رووبەری بچوکی بێماناییدا، کاتێك بەتەمای ئەوەی رۆژێك لەرۆژان حکومەت گوێت لێبگرێت یان وەڵامت بداتەوە یان بەتەمای ئەوەی وەك مرۆڤ حسابت بۆ بکرێت، یان بەتەمای ئەوەی رۆژێك لەرۆژان ئیتر لەسەرەی بەنزینو غازو نەوتدا ژیانت تەواو نەبێتو وەك وڵاتێکی تازەپێگەیشتوو سەرە بۆ هیچ نەگریتو ژیان زور سادەو سروشتی بێتەوە، ئەوکاتە ئیتر چاوەڕوانییەکان مێشکت دەخۆنو خەیاڵەکانت دەبن بەکابوسو هێدی هێدی ژیانت یەکسان دەکەنەوە بە سیفرو بێهودەیی خەیاڵو خولیاکانت تالان دەکاتو کەئابە دەبێتە هاورێیەکی هەمیشەییتو چاوەڕوانییە بێماناکان هێدی هێدی کاڵت دەکەنەوەو فڕێت دەدەنەوە پانتاییەکی گەورەی ناعەدالەتیو گەندەڵیو بێساحەبیو بەڵێنی درۆو نابەرپسیارێتی، کە دواجار ئەم پانتاییە بێجگە لەمەزاتخانەیەکی گەورەی بێماناکردنی ژیان هیچی تر نیە.

حکومەتی وەهمی یەکێکە لەحکومەتە هەرە دەگمەنەکانی دنیاو ناوەندێکی دەسەڵاتی پڕ لەناچاریو نابەرپرسیارێتیو نافەرهەنگیو نامەعریفییە، شێوازێکی تازەی حکومکردنە، مۆدێلێکی دیکەی بەڕێوەبردنو حوکمڕانییە، هاوکات سیتمێکی پەرشوبڵاوی ناتەندروستە، بەواتایەك قۆنتەراتخانەیەکی گەورەیە بۆ هەراجکردنی مافە مەدەنییەکانی هاوڵاتیانو مەزاتخانەیەکی گەورەیە بۆ بێماناکردنی ژیانو مەعریفەتو شارستانیو دنیای

مـۆدێرن، لەکاتێکـدا حکومـەتی وەهمـی خـۆی بۆخـۆی بـازارێکی گـــەورەی ژەنەڕاڵـــەکانی جەنگـــەو خومخانەیـــەکی بـــچکۆلانەی دیموکراسیەتە.

# کەلاوەیەك بەناوی ژیانەوە

"چێژو توندوتیژی ئەوکاتانە تێکەڵاوی یەکدی دەبن
کە دەسەڵات زەبرورزەنگ بەپیرۆزبکات، خەونی
ئامادەبوون لەمێژوودا لای مرۆڤە بچوکەکان
دروستبکات، بیانکات بە پاڵەوان، مەدالیای
قارەمانێتی بدات بە ترسنۆکەکان..." ئاراس فەتاح

*دنیای داخراو دنیایەکە کە ژمارەی مزگەوت و بارەگای حیزبەکانی سەدان ئەوەندەی زانکۆ و پەیمانگەکان و دەزگای راستەقینەی گەنجان و ناوەندە رۆشنبیرییەکانێتی. دنیای درۆ گەورەکانی دەسەڵات و حکومەت و حیزبە لەگەڵ هاوڵاتیاندا، دنیای تاڵانکردنی ژیانە بەناوی مەرگەوە، دنیای بێبایەخکردنی قسەکردن و رەخنەگرتنە، دنیای ئەحبابەکانی حیزب و هەژارکردنی کۆمەڵگەیەکە لەرێی چەوسانەوەی ئابوری و فەرهەنگی و سیاسی و ناعەدالەتییەوە.*

دنیای کۆمەڵگە داخراوەکان دنیای دووبارەکردنەوەی ژیانە لەئاستێکی هەژاری مەعریفیدا، هاوکات دنیای بەتاڵکردنەوەی هەر

ماناو واتایەکە لەپێکهاتە هەرە جەوهەرییەکانی، دنیای ساختەکاری‌و جەهلێکی گەورەیە بە ژیان‌و کارەسات‌و گۆڕانکاری‌و بەرەودان بە روانین‌و دنیابینییە جیاوازەکان. هەروەها دنیای رازاندنەوەی جەهلە، ئارایشتکردنی بێباکی‌و کەمتەرخەمی‌و ئاوڕنەدانەوەیە لەمێژوویەکی دوورودرێژی پڕ لەگۆڕانکاری‌و سودوەرنەگرتنە لەهەر گەمژەییەکی سیاسی‌و بێ ماناکردنی خودی ژیان‌و فەرهەنگ‌و گۆڕانکارییەکان.

ئێمە دەبێت پرسیار لەوە بکەین، ئایا لەبەردەم چ دەسەڵات‌و کۆمەڵگەو کولتورو فەرهەنگێکداین، ئێمە سەر بە چ مەودایەکی روانین‌و دنیابینییەکین بۆ دنیاو خۆمان‌و تێگەیشتن لەگۆڕانکاری‌و ئەو ئاستە ژیارییەی تیایدا دەگوزەرێین، ئێمە چۆن بیردەکەینەوەو ئەزمونی ئێمە لەگەڵ خودی ژیان‌و ئەو ئاستە دیاریکراوەی کولتورو ئەو ئاستە نامۆیەی فەرهەنگە جیاوازەکانی دەرەوەی خۆمان لە چ ئاستێکدایە، هەموو ئەم پرسیارانە نیگەرانمان ناکات بەو کولتورە هەژارەی کە ئاستی تێگەیشتنی لەدنیاو گۆڕانکاری‌و دیاردەو بایەخدان بە مرۆڤ وەك بوویەکی کاریگەرو زیندوو، ئێمە خاوەنی کۆمەڵگەو دەسەڵات‌و ناوەندێکی داخراوی کولتورین کە سیخناخە لەجەهلا بەرامبەر خودی ژیان‌و سەرلەبەری ئەو گۆڕانکارییە گەورانەی کە رۆژانە سات بەسات روودەدەن‌و ئێمەی بێئاگا لەدنیا، بێبەش لەهەر بەشدارییەکی کاریگەر بە روانینێکی داخراوەوە کە سەرلەبەری دنیابینییەکانی ئێمەی لەکۆمەڵێك حیکایەتی بچوکدا بەندکردووە.

ئێمە کە تێزێکی گەورەی وەك کۆمەڵگەی داخراو دەخەینە بەرباس‌و راڤەکاری، تەنها لەبەرئەوە نیە ئێمە تەنها ئەو دنیا داخراوە وەك خۆی باس بکەین‌و دووربکەوینەوە لەهەر روانین‌و کلێشەسازییەکی دیاریکراو، نەخێر مەبەستەکانی ئێمەو کاری میتۆدی ئێمە لەسەر ئەم کۆمەڵگەیە بە ئەندازەیەکی رەخنەییە، کە دووردەکەوینەوە لەهەر بەراوردکارییەکی نامەعقول‌و نائەکادیمی کە دنیای رەخنە دابەشدەکات بەسەر رەخنەی داهێنەرو رەخنەی روخێنەر، لەبەرئەوەی ئەم دابەشکردنە نەریتییە بەرلەوەی بەرهەمی روانینێکی کۆنزێرڤاتیڤانە(کۆنەپەرستانە) بێت بۆ دنیا، بەرهەمی خەیاڵدانێکیشە بۆ جیاکردنەوەی باش لەخراپ، چاکە لەشەڕ، بەلاّم ئێمە بۆئەوەی بەردەوام نەکەوینە نێو ئەو ئاستە ترادیسیۆنیە داخراوەوە، کار لەسەر هەڵوەشانەوەو وردکردنەوەی پێکهاتە هەرە ناوکۆیی‌و جەوهەری‌و لابەلاکانی کۆمەڵگەو تەواوی ئەو کایەو پێکهاتە کۆمەڵایەتی‌و کولتوری‌و سیاسیانە دەکەین کە لەیەکەیەکی هاوبەشی نادیاریکراودا کاریان هەژارکردنی کۆمەڵگەیە لەڕووی کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگی‌و روانین‌و دنیابینییە جیاوازەکانەوە.

کەواتە ئێمە خاوەنی چ جۆرە کۆمەڵگەیەکین..؟ ئێمە بێجگە لەوەی خاوەنی کۆمەڵگەیەکی داخراوین، خاوەنی کۆمەڵگەیەکی هەژاریشین لەڕووی مەعریفی‌و فەرهەنگییەوە، خاوەی کۆمەڵگەیەکی ماندوو وهیلاکین، بەلاّم بەو مانایە نا ئێمە هیلاکی دنیایەك کارو ئەکشن‌و روانین‌و کاریگەری‌و مامەڵکردنی

فەرهەنگین، بەڵکە هیلاکی کولتورێکین تاسەرئێسك کولتورێکی بازنەیی داخراوە، پڕە لەترادسیۆنی (نەریتی) بێ مانا، لێوانلێوە لەدووبارەبونەوەو رۆتینو سیخناخە لەحیکایەتی بچوك‌و بێسود، بەلاّم رەنگە لەم گفتوگۆیەدا بەپێی پێویست نەتوانین بچینە نێو قولاّیی باسکردنی ئەم کۆمەلگەو کولتورە، بەلاّم هێندە هەیە، دەبێت ئەوە بزانین کە ئێمەی مرۆڤ لەم دەڤەرە ئاڵۆزەدا سەرباری ئەو هەژارییە کولتورییە گەورەیەی کە تیایدا دەگوزەرێین، لەسەرگەردانییەکی گەورەی سیاسی‌و فەرهەنگی‌و کۆمەلاّیەتی‌و ئابوریدا دەژین‌و، روانین‌و دنیابینییەکانمان هێندە لاوازە کە توانای راڤەکاری‌و تێگەیشتنمان لەدنیاکانی دەرەوەی خۆمانی بە ئەندازەیەك بچوککردۆتەوە، کە ئاگامان لەمافەکان‌و ئەرکەکان‌و پەیوەندی نێوان ئێمەو دامەزراوەکان نیە، هاوکات تەواوی روانینەکانی ئێمە بە قەدەر هێڵێکی پەیوەندی بە دنیاکانی دەرەوەی خۆمان کاریگەر نیەو لەئاستی سفری پەیوەندیداین، لەبەرئەوە نا ئێمە ناتوانین پەیوەندی لەدەرەوەی خۆمان دروست بکەین، نەخێر یەکەمینجار هۆکاری هەرە سەرەکی ئەم ناپەیوەندییە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئێمە پەیوەندیمان بە خۆمانەوە نیەو لەئاستێکی زۆر خراپی پەیوەندی‌و مامەڵەکردنداین بە خۆمانەوە، ئیتر چۆن دەتوانین پەوەندییەکی دروست‌و شارستانی لەسنوری دەرەوەی خۆمان دروست بکەین، ئێمە تا خۆمان نە ناسین ناتوانین دنیاکانی دەرەوەی خۆمان بناسین‌و ژیان‌و فەرهەنگی کرانەوە لەگەڵیاندا دابەشبکەین.

خراپترین ئەخلاق ئەو ئەخلاقەیە کە خۆت بە بەرپرسو خاوەن بڕیار دادەنێیت، لەوەش خراپتر ئەوەیە سەرلەبەری بەرپرسیارییەکانی خۆت بخەیتە ملی یەکێکی دیو خۆت رووتبکەیتەوە لەبەرپرسیارێتیو خۆت دامالّی لەهەر کارو ئەرکو ئەکشنێك بۆ ژیان، کاتێك تۆی بەرپرس، تۆی مرۆڤ، تۆی سەرۆك، تۆی حکومەت، تۆی گەنج بەم ئەخلاقە ناشرینەوە مامەڵە لەگەڵ ژیاندا دەکەیتو خۆت بە بەرپرسو خاوەن روانین نازانیت، ئەوا تۆ هەر چییەك بیت کەسێکی جاهیلی بە دنیاو ژیانو دنیای مۆدێرن، لەبەرئەوە واباشترە، تەنها خەریکی تێرکردنی غەریزەکانت بیت وەك خواردنو خەو و سێکسو ئیسراحەتو دووربکەویتەوە لەژیانی مرۆڤەکانی دیکەو دەستنەخەیتە ناو دنیای بیرکردنەوەو روانینو بەرپرسیارێتییەوە.

بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە ئەورۆکە نەوەیەك هەیە گرفتارە لەنێوان ئەو کولتورە هەژارەی کۆمەڵگەو دنیای مۆدێرنو ئەو کولتورە دەوڵەمەندەی دنیاکانی دەرەوەی خۆی، هاوکات کەسانێکی دیکە هەن نیگەرانن لەو هەموو ناعەدالەتیو نابەرپرسیارێتیو بێماناییەی کە ئەم فەرهەنگە هەژارە هەڵگرێتیو کاری لەسەر دەکات.

نەوەیەك لەدەرەوەی ئەو ترادسیۆنە داخراوەی ژیان، لەدەرەوەی ئەو دنیا کۆنکرێتییەی کە روانین بچوکدەکاتەوە بۆ خەیاڵێکی بچوكو کۆمەڵە حیکایەتێکی بچوك، دنیابینییەکی دیکەو خەیالگەیەکی فراوانتریان هەیە بۆ شکاندنی ئەو تەوقی حیکایەتانەی کاردەکەن بۆ وێناکردنی خەونو مەوداکانی روانین.

هەروەها ئەو دنیابینییەی کاردەکات بۆ بچوکردنەوەی خەونەکان، کاریش دەکات بۆ بچوکردنەوەی مرۆڤەکان لەکۆمەڵە حیکایەتێکی هاوشێوەدا. ئەم دیاردەیە هەوڵێکی گەورەیە بۆ شکاندنی ستراکچەری حیکایەتەکانو ئەو نادنیابینییەی کە گەمارۆی ژیانی داوە، ئەو بێدەنگییەی کە دروستکەرو دارێژەری قەیرانەکانە.

جیهانبینی مۆدێرن کار لەسەر دوو ئاستی جیاواز دەکات، بەواتایەك بزوێنەری دوو ئاستی بیرکردنەوەیە، ئاستی یەکەم هەڵوەشاندنەوەی داخرانی کولتوریو فەرهەنگییە، ئاستی دووەمیش پەیوەندییە. دنیای داخراوی کۆمەڵگە داخراوەکان دنیایەکە بۆ بچوکردنەوەی ژیانو کولتورو هزرو فەرهەنگو پەیوەندییەکان، دنیای لۆکاڵ کاردەکات بۆ بچوکردنەوەی ئینسانو بچوکردنەوەی خەونەکان، ئەو فەرهەنگەی لەپشتییەوە کۆمەڵێك خەونی گەورە ئامادەگی نەبێت کۆمەڵگەیەکی بچوکە، وەك عەلی حەرب دەڵێت: ئەورۆکە لەبەردەم شۆرشی زانیارییەکاندا ئیمکانیاتێکی بەرفراوان لەبەردەم مرۆڤدا کراونەتەوە، کە لەتوانستە کاریگەرەکاندا بۆ کردەو کارلێکردن بەرجەستە دەبێت، هیچ زیادرۆییەك نیە لەقسەکردندا گەر بڵێین جیهانێکی نوێ لەگەڵ دیاردەی جیهانگیریدا پێکدێت، هاورێ لەگەڵ دەرکەوتنی بکەری مرۆڤایەتییەکی نوێدا، کە بە رەهەندو خێرایی تیشك یان هزر کاردەکات، بەقەدەر بەکارهێنانی رێگەکانی راگەیاندنی خێراو هەمەرەنگی، یان لەگەڵ ئەو تۆرە پەیوەندییە ئاڵۆزو لەرادەبەدەرانەدا مامەڵەدەکات. مرۆڤی پەیوەندیامێز کە دەماخێکی ئالیو تەکنیکاتێکی ژمارەییو هزریو کارکردن بەرەو گەردوونگەرایی بە وێنەی کیشوەربڕو کۆمەڵگابڕو کولتوربڕی بۆ رەخساوە."

ئـەم ئەزمونـە بەرلـەوەی گەلاڵـەکردنی جیهانبینییـەکی جیـاواز بێـت، بـەرپاکردنی بیرکردنـــەوەو روانینێکــی جیــاوازە لــەدەرەوەی ئــەو دنیــا داخراوەی دەسەڵاتە داخراوەکانی ئەو نادنیابینیەی کە دەکەوێتـە نـاوەوەی حیکایەتەکانو کرۆکی رووداوەکـانو ئـەو کۆنخوازییـەی بـەردەوام لەهـەوڵی پاراستنی نـەریتی داخـراوی ئـەو سەرزەمینەدایە کەناوی نیـشتیمانە، ئـەو خەیالگەیـــەی کـــەناوی حیکایـــەتی بـــچوکە، ئـــەو دنیایـــەی کـــەناوی دووبارەبونەوەیـە، جیهـانبینی ئاڕاسـتەیەکە تـەواو پێـچەوانەی لۆکاڵیـەتو هەرێمخوازییــە، تــەواو پێــچەوانەی رەهەنــدە کــورت مــەوداکانو هــزرە نەریتییەکانــە، پێـچەوانەی کۆنخـوازیو نـەریتخوازیو ئەخلاقپەرسـتییە، ئاڕاستەیەکە لەدەرەوەی دنیای چوارگۆشەی کۆمەڵگە داخراوەکانو بازنـەی داخراوی هزرو روانینو نادنیابینییەکان.

مەودایـەکی دیکـە هەیـە لـەدەرەوەی مـەودا داخراوەکـانی رازیبـوون، لـەدەرەوەی حیکایەتـە گـەورەکان، لـەدەرەوەی نـەریتی روانـینو نـەریتی بێباکی، کە مەودای نائومێدییەکانە، کە دنیابینییەکی قوڵترە بـۆ نیگـەرانی، جەوهـەریترە. نائومێـدیی بەرلـەوەی بـارودۆخێکی سـایکۆلۆژی بێـت، پـتر بارێکی مەعریفییە، جیاوازییـەکی دیکەیـە بـۆ رەنگرێـژکردنی کلێشەیەکی دیکــەی ئــەنتۆلۆژی، ئــەوەی لەنائومێدییەکانــەوە دێــت، ئــەوەی زادەی نائومێدییەکانە زادەی نادیارێکە، کوڕی نیگەرانییەکانـە، لەبەرئـەوە ئـەوەی لەپــشت ئــەم ئەزمونەوەیــە پــتر ئــەو نیگەرانییــە گەورانەیــە لەنــەوەکانی پێــشوو، نیگــەرانی لــە دەســەڵاتە داخراوەکــان، لەجــەنگ، لــە شــەهادەت، لەدەســەڵات، لــەبێباکی، لــە پوچــی، لــە دووبارەبوونــەوەی حیکایەتــەکان، لەحیکایەتە بچوکەکان. . .تاد.

دواجار ئەو نیگەرانییە تەوژمێکی نوێیە بۆ دروستکردنی مەودایەکی دیکەی تێگەیشتن، بەڵام ئەگەر دنیابینییەکی جیاوازی لەپشتەوە نەبێت نابێتە بەرپاکەری خەیاڵدانێکی جیاواز بۆ روانین، بۆ وروژاندنی زیاترو زیاتری ئەو خەیاڵگە کۆنکرێتییەی کە پێی وایە لەدەرەوەی پەیامە داخراوەکەی ئەو شتێکی دیکە نازی، لەدەرەوەی ئەو دنیا داخراوەی هیچ روانینێکی دیکەو هیچ نیگەرانییەك بەقەدەر قەدەرەکانی ئەو نین‌و بەقەدەر ئەو رێکەوتە دیاریکراوەی ئەو نین‌و هیچ نادیارێك ناتوانێت رووە تاریکەکانی ئەو هەڵماڵێ‌و مەودایەکی دیکە زیادبکاتە سەر ئەو ناوەندە.

دنیای داخراو دنیایەکە کە ژمارەی مزگەوت‌و بارەگای حیزبەکانی سەدان ئەوەندەی زانکۆو پەیمانگەکان‌و دەزگای راستەقینەی گەنجان‌و ناوەندە رۆشنبیرییەکانێتی.

دنیای داخراو دنیایەکە بۆ رامکردنی ژیان لەچوارچێوەیەکی بچوکی ژیاریدا، دنیایەکە بۆ بەخێوکردنی بەهاو پیرۆزی لەیەکەیەکی بەرفراوانی ترادسیۆنیدا، دنیایەکی فاکتۆلۆژی(راست‌ودروستی) هەستپێکراوە، بۆ دووبارەکردنەوەی روانین‌و خەون‌و وێنە لێکچووەکان. دنیایەکە بۆ بەرهەمهێنانی خەیاڵدانێکی گشتگیر بۆ ئیرادەیەك دەستەمۆ، بۆ خەونێك وێکچوی خەونەکانی دیکە، بۆ دنیایەك لۆکاڵ‌و دیاریکردنی سنور بۆ هەر خەیاڵێکی دیکەو روانینێکی دیکە.

فەرهەنگی داخراو دابەشدەبێت بەسەر کۆمەڵێك دابەشکراوی دیکەدا، ئەو پێکهاتە دیاریکراوانەی ئەم ماشێنە گەورەیە پێکدەهێنن کە دروستکاری خودی ئەو دنیایەشن‌و بەرهەمهێنەری ئەو روانین‌و وێنانەشن کە لەخۆی کۆپیان دەکاتەوە، ئەو دابەشبوونەش خێزانی کۆنکرێتی‌و

پەیوەندی داخراوی کولتوری، وەك نەریتی داخراوی هاوسەرگیری، ئیرادەی دەستەمۆی مێگەل، پەیوەندی هاوخوێنیو هاوڕەگەزی، دەمارگیری ناوچەییو مەزهەبیو کولتوریو سیاسیو حیزبی، دامودەزگای کارتۆنیو داخراو، ناوەندی رۆشنبیریو کولتوری بازنەیی کە دەسەلاتێکی هەرەمی ئیفلیج کۆنترۆڵی دەکات، سەرەنجامی هەموو ئەو داخرانە بێدەنگیو داگیرکاری فەرهەنگی، کەلاوەیەکی مەعریفی ناتەندروست، خەیاڵێکی بچوكو ونبوونی تاکەکەس وەك ئیرادەو روانینو جیاوازی بەرهەمدەهێنێت..

هاوکات تاکەیەك مەودای دیاریکراو کۆی ئەو رەهەندانە لەخۆی کۆدەکاتەوەو لەپێکهاتەیەکی نەریتیو ئەخلاقیدا جێگیریان دەکات. لەو کۆمەلگەیانەدا کە دەسەلاتێکی داخراو و رۆشنبیرانێکی سونەتی بێشومار دەبنە بیرکەرەوەو داڕێژەری راڤەکردنی دنیا لەنێگا داخراوەکانی خۆیانەوە دەبنە بەرهەمهێنەری دووبارەکردنەوەی وێنەکانی خۆیان لە کەرنەڤاڵو فیستیڤاڵو بۆنەو موناسەبەی ساختەو داگیرکردنی ئەو ئاستە ژیارییەو خاوەنداریێتیکردنی سەرلەبەری هەر روانینێك کە دەکەوێتە بازنەی کەرنەڤاڵەکانیانەوە. ئەو جۆرە لە رۆشنبیر بێئەندازە لەهەوڵی جێگیرکردنی کەلاوە مەعریفییەکانی خۆیدایەو بەردەوام خولیایەکی گەورە بۆ داگیرکردنو مۆنۆپۆلکردنی هزرو دنیابینییە جیاوازەکان لەگەڵیدا دەژیو کاردەکات بۆ بەرپاکردنی خەیاڵدانێکی بچوك لەچوارچێوەیەکی کەرنەڤاڵی دووبارەدا.

# دەسەڵاتی خاڵی لەمەعریفە

"بەپێی دروشمی حیزب: ئەوەی رابردوو دەستەمۆ بکات، جڵەوی ئایندەی لەدەستدایەو ئەوەی بەسەر ئێستادا زاڵ بێت جڵەوی رابردووی بەدەستەوەیە."جۆرج ئۆروێل

دەسەڵاتە جاهیلەکانی دنیا تەنها دواکەوتوو نین لەڕووی سیاسیو دبلۆماسیەتی مۆدێرنو ئابوریناسیو پلانسازییەوە، بەڵکە جەهلێکی کوشندەشیان هەیە بەدنیای مۆدێرنی رۆشنبیریو دیالۆگی فەرهەنگیو هونەریی شارستانییەکان، ئەوان سەرباری ئەوەی کوشندەیەکی گەورەی رایگشتین، خەونو کوژو بیرۆکەکوژو پرۆژەکوژو هونەرکوژو رۆشنبیری کوژیشن.

ئەوە میلۆدییەکانن دەکەونە گفتوگۆو گواستنەوەی روانینو دنیابینییەکانی کۆمەڵگەیەك لەگەڵ کۆمەڵگەکانی دیکەدا، نەوەك دەزگا حیزبییەکانو بارەگا سیاسییەکان، ئەوە تابلۆکانن دەبنە سەرمایەکی رەمزیو شارستانی بۆ وڵاتو دەبنە میراتێکی فەرهەنگی

گەورە بۆ زیندوهێشتنەوەی مێژوو و ئێستامان، ئەوە جەنگەکان‌و شەڕی ناوخۆکان نین دەبنە سەرچاوەی شانازیکردن بە شارستانییەتەوە، ئەو کۆمەڵگایانەی کە تەنها شانازی بەخوێن‌و تفەنگەکانیانەوە دەکەن تاسەر کۆمەڵگەیەکی تەندروست نین‌و شەڕانگێزن، دەرەنجام کۆمەڵگەیەکی وێرانن لەڕووی فەرهەنگی‌و شارستانییەوە.

ئەوە رۆمان‌و شاکارە گەورەکانی شیعرو حیکایەتە جیاوەزەکانە دەبنە زمانحاڵێکی شارستانی‌و هونەری‌و رۆشنبیریی کۆمەڵگەو هەمیشە بەزیندوو دەمێننەوە، بەداخەوە ئەوە پیاوە سیاسیی‌و حیزبییەکان‌و مەلاکان‌و خوتبەبێژو زورناژەنەکانی دەسەڵات نیین کە بەزیندووی دەمێننەوە.

کۆمەڵگەی زیندوو، واتە کۆمەڵگەی ئەکتیڤیستە رۆشنبیری‌و فەرهەنگییەکان، واتە کۆمەڵگەی رۆماننوس‌و هونەرمەندو نوسەرو شاعیرو مۆسیقاژەن‌و قوتابخانە فیکری‌و ئەدەبییەکان، واتە کۆمەڵگەی پڕ لەمیلۆدی‌و بەتاڵ لەبێبایەخی، لێوانلێو لەرۆمانی نوێ‌و کتێبی نوێ‌و شیعری نوێ‌و تابلۆو روانینی مۆدێرن، بەلام دەبێت خاڵی بێت لەهوتاف‌و دروشمی بێبایەخکردن‌و کەمکردنەوەی نرخی نوسین‌و موزیك‌و وێنەکێشان‌و دنیابینی نوێ.

کۆمەڵگە شارستانییەکان بەرلەوەی شانازی بکەن بە سیاسەت‌و پلانی ئابوریی‌یەوە، شانازی بە هونەرمەندە شێوەکارەکانیان‌و رۆماننوسەکان‌و نوسەرەکان‌و فەیلەسوفەکان‌و مۆسیقییەکانیانەوە دەکەن، واتە شانازی بە فەرهەنگ‌و رۆشنبیرییەوە دەکەن، هاوکات

بەجیدی کاردەکەن بۆ گەشەپێدان و بەرفراوانکردنی چالاکییە فەرهەنگی و رۆشنبیرییەکان، ئەوان وەك دەسەلاتە کوشندەکان بیرناکەنەوە بۆ وێرانکردنی فەرهەنگ و دروستکردنی مزگەوت، بۆ کاولکردنی کۆمەلگە و کردنەوەی بارەگای حیزب و دەزگای سازکردنی موناسەبات، ئەوان هۆلە رۆشنبیرییەکانیان ناکەن بە تەعزیخانە، لەبری دەیان کەرنەڤالی چەواشەکردنی رۆشنبیری و سازشخانەی حیزبی چەندین کەرنەڤالی مۆدێرنی رۆشنبیری و فەرهەنگی تیادا سازدەکەن، دەسەلاتە مۆدێرنەکان لەبری ئەوەی پیاوە حیزبییەکانیان بکەن بە زمانحالی رۆشنبیری و فەرهەنگی و قسە لەسەر مۆدێرنە بکەن رۆمانوس و هونەرمەندەکان دەکەن پێشەنگ و قسەکەرو سەرپەرشتیاری فیستیڤال و کەرنەڤالەکان.

بەلام ئەگەر باوەرمان بە فەرهەنگێکی کراوە هەبێت پێویستە کاربکەین بۆ سازدانی روانینێك بەتال بێت لەحیکایەت و موقەدەساتی حیزبی، بەلام پر بێت لەمەعریفەو دنیابینی و روانینی جیاواز، بەتال بێت لەبێدەنگی، بەلام پر بێت لەگوفتارو جیاوازی و دروستکردنی فشار، پێویستە لێوانلێو بێت لەرەخنەو پێشنیارو پرۆژەی تازە، بەلام دەبێت بەتال بێت لەنوێنەری بێئیش و بێسەلیقەو کەسانی حیزبی و کۆنخوازو نەریتپارێزو عەقل داخراو. دواجار پێویستە ئەم روانینە گەلالەکاری دنیابینێکی جیاواز بێت و روحیەتێکی یاخیگەرانەی لەپشتەوە بێت، هاوکات پێوستە ئەو فەرهەنگە مۆدێرنە لەهەولی کالکردنەوەی ئەو روانینە کۆنزێرڤاتیڤانەدا بێت کە چەندین ساڵە کومەلگەیان غەرقی

گەندەڵییەکی سەرتاسەری کردووە، هەر لەگەندەڵی کۆمەلایەتییەوە بۆ گەندەڵی کولتوریو رۆشنبیریو سیاسیو ژیاری، کە ئاستی روانین لـەو ناوەنـدەدا لەهـەژارترین دۆخـی خۆیـدا دەژی، ئاسـتی تەماشـاکردنی دنیاکـانی دەرەوەی ئـەو فەرهەنگـە ئاسـتێکی کـورت مەودایەو پـڕە لەنەخوێنەوارییـەکی گـەورەوگرانو تەماشـاکردنێکی جاهیلانەیە.

ئـەوەی ئەورۆکـە دەروازەیـەك بـۆ قـسەکردنو راڤـەکردنو دیالۆگی جیاواز دەخولقێنێتو دەرەخسێنێت ئـەو نەریتـە فـەقیرەی رۆشـنبیری ئێمـە نیـە کـە خوازیـاری کـەمترین قـسەو کـەمترین راڤـەکردنو جیاوازییـە بەرامبـەر مـەوداو رەهەنـدەکانی دیو سەرسامە لەگۆرانکارییەکانـداو دەسـتەوئەژنۆ بەرامبـەر دیاردەکـانی جیهانو هزری هاوچەرخو جیهـانگیریو راڤـەکردنی نـوێ بـۆ دنیـاو دیاردەکـان دانیـشتووەو هیـچی دیـاریکراوی نیـە بیلێـتو بیکـاتو بیریلێبکاتەوە، لەناوەوەڕا ئـەو ترادسیۆنە ئاستەکانی بیرکردنـەوەو گۆڕانو جیاوازییـەکانی خەفـەکردووەو گرفتـاری سەرلێـشێواوییەکی گـەورەو خەمـساردییەکی بێئەنـدازەی کـردووە بەرامبـەر بـەخۆیو ئەوانی دیو هەڵکردن لەگەڵ سەردەمە نوێکاندا. هاوکات لەدەرەوەڕا خـاوەنی گوتـارێکی جیـاوازی نیـە بـۆ ناسـینەوەو دۆزینـەوەی شوناسـێکی دیـاریکراو بۆخـۆیو نەریتـە داخراوەکەی، ئـەو تێکـستە پیرۆزانـەش دەرئـەنجام زیـاترو زیـاتر وەهمـەکانی لـەلا گـەورەتر دەکـاتو دەیگەیەنێتـە ئاسـتێکی بێئەنـدازەی یۆتـۆپیو ئاسـتێکی گـەورەی بێئاگـایی بەرامبـەر دنیـاو دیـاردە فیکـریو فەلـسەفیو

ژیارییه نوێکان. بۆنمونه نهوهیهك لهرۆشنبیران ههیه بۆ ئهوهی لهوردهکارییهکانو راڤهکردنه جیاوازهکانو قولاییهکان خۆیان بدزنهوه ههڵئهسن بهدابینکردنی کهرهستهگهلێکی میدیایی بۆ قسهکردن لهسهر بابهتی گهورهو مهسهلهی گهوره(بهلام بهبێ رهخنهو بهبێدهنگی)، وهك کێشه نهتهوایهتییهکان، ململانێ سیاسییهکان، ئهمنی قهومی، ئاین، دهسهلات، دهولهت، شهڕی ناوخۆ...تاد. بهڵێ ئهمهش بهو مانایه نیه که قسه لهسهر ئهو بابهتانه نهکرێت، نهخێر ئهگهر قسهکردن لهسهر ئهو شتانه خوێندنهوهو ئاگاییهکی مهعریفی جیاوازی لهپشتهوه نهبوو، ئهگهر درۆیهکی گهوره لهدیووه نادیارهکانی ئهو دیالۆگهوه ئاماده بوو، ئهوا بهبێ روونکردنهوهی زیاتر لهسهر ئهم ئاسته رۆشنبیرییه، کهسانێکی بهناو رۆشنبیرمان دهستدهکهوێت که بهرژهوهندیخوازن لهرووی سیاسیو ئابوورییهوهو تارادهی ئهوپهڕی سهرلێشێواویی میتۆدی وتهزایهکی گهورهی بێئاگاییو گهمژهییمان دهستدهکهوێت، که مهحاڵه دوورکهوتنهوه لهدهرئهنجامه خراپهکانی بهتایبهتی لهرووی رۆشنبیریو کارگێڕیو خراپ تێگهیشتن لهناعهدالهتیو بێ مافیو زۆرێك لهو رههاگهراییهی که دهسهلاتێکی ناعدیلانه مافی رهوایهتی دیکتاتۆریو ستهمکاری دهبهخشێت بهخۆیو گرنتی بهردهوامبوونی خۆشی دهستهبهر دهکات. بێگومان ئهو ئاستی روانینه دوابهرههمی بێدهنگییهکانه لهسهر زۆرێك لهوردهکاریو ئهو راڤهکردنو رهخنه پێویستانهی که نهوهیهك لهنهوهکان ناتوانن خۆیان بدهن له قهرهیو قسهی جدی لهسهر بکهن.

دەستەواژەیەکی میللی‌و کۆمەڵایەتی هەیە، بەردەوام لەکاتە جیاجیاکانی ڕخنەو نارێکیدا دووبارە دەکرێتەوە، ئەویش دەستەواژەیەکە لەڕووی فەرهەنگی کۆمەڵایەتیەوە یەکێکە لەدەستەواژە پڕ ماناو دەلالەتەکانی ئەم کۆمەڵگەیە، لەبەرئەوەی دەستەواژەیەکە لەدووسێ وشە پێکهاتووەو مانای تەواوەتیش دەبەخشێت، بەڵام لەم نوسینەدا ناگەڕێین بەدوای مانا دیارو شاراوەکانی ئەم دەستەواژەیەدا، لەبەرئەوەی مەبەستی ئێمە شتێکی دیکەیە، هەرچەندە دەستەواژەی ئەم نوسینە لەڕووی ماناو مەبەستەوە زۆر نزیکە لەدەستەواژەی زلی بێ هونەر، بەڵام لێرەدا ئەم بەراوردەناکەین.

## دەسەڵاتی بێ فەرهەنگ

حکومەت پێکهاتووە لەچەند وەزارەت‌و دەزگایەکی گرنگ کەڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ پەیوەندییەکی هەمەلایەنیان هەیە بەژیان‌و گوزەران‌و فەرهەنگ‌و رۆشنبیریی هاوڵاتیان‌و کۆمەڵگەوە، بەڵام ئەوەی لێرەدا دەکەوێتە مەبەستی ئەم نوسینەوە حکومەت‌و دەزگا ڕۆشنبیرییەکانە، هەڵبەت لەکۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا بوارەکانی رۆشنبیری‌و فەرهەنگی‌و پەروەردەیی کۆمەڵە بوارێکی گرنگن بۆ حکومەت‌و دەزگاکانی، لەبەرئەوەی بەردەوام لەڕوی زانستی‌و ئەکادیمی‌و گۆڕانکاری‌و گەشەپێدانەوە بایەخیان پێدەدرێت. لەو وڵاتانەدا بەلای حکومەتەوە گرنگە تۆ رۆشنبیر بیت یان هونەرمەند یان شانۆکار بیت، سینەماکارو دەرهێنەرو

وێنـــەکێش‌و گۆرانیبێــژبیت، شــانازی بـــە نوســـەرو ڕۆمــانئوس‌و لێکۆڵـەرەوەو تۆێــژەرەوەو ئـەدیب‌و شـاعیرو هونەرمەندەکانیانــەوە دەکەن، هاوکات هەموو کارئاسانێکیان بۆ دەکـەن، بـەکردەوە ڕێزیـان لێدەگرن بەزوترین کات کتێبیان بۆ چاپ دەکەن‌و ڕیکلامی گـەورەی بۆ دەکەن، پاداشت‌و دیاری تایبەتیان پێدەبەخشن، هۆڵە ڕوناکبیری‌و هونەرییەکان دەخەنە خزمـەتی ڕۆشـنبیران‌و هونەرمەندانـەوە وەك دەسـەڵاتە نەخوێنـەوارەکان چـلەی ماتــەمینی‌و بۆنــەو مەراسـیمی حیزبی تیا ناگێڕن‌و کۆبونەوەی ستایشسازی حیزب‌و موجامەلەی تیا بەرپاناکـەن، تـا کتـێبی نوسـەرە جیـدی‌و سـەربەخۆکان وەستابێت، کتێب بـۆ پیـاوانی حیـزب‌و ئـەلبومی ڕەنگـاوڕەنگ بـۆ سـەرکردەکان چاپ ناکەن، پۆستەری دەموچاوی پڕ لەبەختەوەری سـەرکردەکانیان بـەتیراژی چـەند ملیـۆنی چاپ ناکـەن، بەڵکـە هـەزاران کەرنــەڤاڵ‌و ڤیـــستیڤاڵی ســـەربەخۆو جیـــدی‌و پـــڕ لـــەڕێزو بایـــەخ بـــۆ بـــوارە جیاجیاکـــانی هونـــەر هـــەر لەهونـــەری وێنەکێـــشانەوە بـــۆ شـــانۆ، لەڤیستیڤاڵی سینەماوە بۆ پێشەنگای شکۆدارکردنی کتێـب، هەرلـە بلاوکردنەوەی ئەلبومی گۆرانییەوە بۆ پەخشکردن‌و بلاوکردنـەوەی ڕۆمان‌و ئەدەبیاتی نوێ.

ئــەوان وەك حکومەتــە نەخوێنــەوارەکان ڕۆشــنبیران ناخەنــە پـــەراوێزەوە، ڕق لەهونەرمەنـــد هـــەڵناگرن، ئـــەوان ســـەرۆکی حکومەتەکەیان وەك سەرۆکی حکومەتە بێ هونەرەکان بیرناکەنەوە، ئـــەوان کـــە لێیـــان دەپرســـن ڕۆمانئوســـەکان‌و هونەرمەنـــدو ڕۆشـــنبیرەکانتان کـــێن، یـــەکرا نـــاوی کتێـــب‌و بەرهـــەم‌و نـــاوی

ڕۆشبیرەکانت بۆ باسدەکەن، بەڵام کاتێك لەسەرۆکی حکومەتو حیزبەکانی ئەم کەلاوەیە دەپرسی چەند کتێبت خوێندۆتەوە.. ؟ دەڵێ هیچ ..کە پێیان دەڵێی گوێت لەچەند ئەلبومی مۆزیكو گۆرانی جاد گرتوە؟ دەڵێت هەر هیچ، چەند کتێبتان بۆ ڕۆشنبیرە جیدیو سەربەخۆکان چاپکردووە؟ دەڵێن نازانم (واتە هیچێکی تر).

کاتێك تۆی نیگەرانو رەخنەگر بەسەردان خۆت دەکەیت بە پەرلەمانی کوردستاندا، یەکڕا سەرنجت بۆ چەند شتێك دەڕوات: ..ئێمە سەردانی پەرلەمانمان کرد، بەداخەوە خۆزگە نەچوینایە. لەبەر ئەم هۆیانە: لەکاتێکدا سەرجەم پەرلەمانی جیهان وەك پێشەنگایەکی شیوەکاری لێهاتووە، دیوارو ڕاڕەوەکانیان بەچەندین تابلۆو پەیکەرو دیواربەندو نەخشەسازی مۆدێرن رازێنراوەتەوە، لەبەرئەوەی شوێنێکی زۆر دیارو ئاشکراو مۆدێرنی ولاتە، هەر سەرکردەیەکی جیهانی، زوربەی شاندە سیاسیو ئابوریو رۆشنبیرییەکان سەردانی پەرلەمان دەکەن، سەرۆك پەرلەمانو ئەندام پەرلەمانی ئەو وڵاتانە شانازی بە تابلۆو ئەو بەرهەمە هونەریانەوە دەکەن کە دیوارەکانی پەرلەمانیان ڕازانۆتەوە، ڕێزی خۆیان زیاتر دەبێت، بەوەی بڵێین وڵاتەکەمان هونەرمەندی شێوەکارو پەیکەرسازی بەتوانای تێدایە. لەهەموو پەرلەمانێکدا کتێبخانەیەکی نەتەوەی هەیە، ئەم دیاردەیەش ڕووی گەشی ڕۆشبیری ئەو نەتەوەیە پێشان دەداتو مانای ئەوەیە کە کۆمەلگاکەیان خاوەنی حکومەتو پەرلەمانێکن کە ڕۆشنبیریو هونەر لەلای ئەوان جێی بایەخێکی گەورەیە، لەژێر سایەی

دەسەڵاتە دواکەوتوو داخراوو نادیموکراتو نامۆدێرنەکاندا سەرلەبەری دەزگا ڕۆشنبیری و هونەری و فەرهەنگیەکان لەژێر رەحمەتی دەسەڵاتی حیزبو حکومەتو بەرپرسەکاندایە، هەر حیزبەو بۆخۆی خاوەنی دەزگایەکی بەناو ڕۆشنبیریی حەزینە، خۆی بەخاوەنی ڕۆشنبیری دادەنێت، زۆربەی بەرپرسەکان بۆئەوەی رووی گەشی ناعەدالەتی و نابەرپرسیاریتی و گەندەڵی خۆیان بشارنەوە هەڵدەستن بەدەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤارو کردنەوەی تەلەفیزیۆن و سایتی ئینتەرنێت، زوربەیان خۆیان کردووە بە سەرپەرشتیاری وەرزشی و سەرۆکی یانە وەرزشییەکان، هەندێکیان بیر لەوە دەکەنەوە تەلەفزیۆنێک یان ڕادیۆیەك تایبەت بەخۆیان هەبێت بۆ پەخشکردنی کۆبونەوەی تێروتەسەل، مەراسیمی چلەو ماتەمینی، سەردانی تەعزێکان و باوەشکردن و دەستلەملانکرندی سەرۆك خێڵ و عەشیرەت و دیوەخانەکان بۆ پەخشکردنی زەردەخەنە پڕ لە گاڵتەجارییەکانیان بەرامبەر کۆمەڵگەو بۆ پەخشکردنی ئەو گۆرانیە بەحساب داواکراوانەی کەخۆیان حەزیان لێیانەو تامەزرۆی ئەوەن ڕۆژی لەڕۆژان ببن بەگۆرانیبێژو کچان ماچیان بۆ هەڵبدەن.

کۆنترۆڵکردن و خاوەندارێتیکردنی دەزگا ڕۆشنبیرییەکان لەلایەن حیزبو دەسەڵاتەوە، واتە داگیرکردنی ڕۆشنبیری و هونەر، مانای ئەوەیە کە من خاوەنی هەمووشتێکم تۆ خاوەنی هیچ، من شارەزای هونەرو ڕۆشنبیریم و تۆی خوێنەوارو رۆشنبیر موحتاجی دەستو مەلحمەتی منی دەسەڵاتی، مانای ئەوەیە دەسەڵات ئیتر بەمەزاجو

بێ زەوقی خۆی کتێب بۆ نوسەرەکانی خۆی چاپدەکاتو ئەلبومی مۆزیكو گۆرانی بۆ هونەرمەندەکانی خۆی بەزۆرترین تیراژو ریکلام بلاودەکاتەوە. هاوکات ئەو دەزگا حیزبییە بەناو رۆشنبیریانە سەدانجار دیوانە شیعری پڕلەستایشو پڕ لەپیاهەڵدان بۆ شاعیرەکانی خۆیان چاپدەکەن، بەلام هیچ شاعیرێکی تر بۆی نیە دێرێك لەشیعرەکانی بکات بەکتێب لەدەزگاکەی ئەودا.

هاوکات ئەم دەزگایانە پردەکرێن لەدیکتاتۆری بچوكو خنجیلانە بۆ کۆنترۆڵکردنو بێبایەخکردنی رۆشنبیریو هونەر، دەسەلات لەم فەرهەنگە هەزارەدا هەڵدەستێت بەدیاریکردنو دەستنیشانکردنی جۆرێك لەنوسەرو هونەرمەند کە بێئەندازە ستایشکارو هوتافکێشو دەربارن، دەبێت بێسنور گوێرایەڵو بێدەنگ بن، پێویستە گەورەترین قسەنکەرو بچوکترین گوێگربن، دەبێت بەڵێن بدەن کەکتێب بۆ نوسەرە جیدییەکان چاپ نەکەن، ئەگەر چاپیشیان کرد پێویستە بەکەمترین تیراژو بێ ریکلامەترین کتێب بێتو بێئەندازە وادەی چاپکردنو بلاوکردنەوەی دوابخرێت.

بەداخەوە سەرلەبەری دەزگا حکومیو حیزبیو رۆشنبیریەکانو وەزارەتو پەرلەمانیش هێندەی پڕە لەوێنەی سەرکردەکان، تابلۆی شێوەکارێك نابینیت ئەو دیوارانە بە رامانو روانینو تەماشاکردن برازینێتەوە، کتێبخانە بچوکەکانیان هێندەی پڕە لەناملکەی حیزبیو رۆژنامەی زەردهەڵگەراوی چەندین ساڵ لەمەوبەرو پڕ لەبۆکس فایلی نەکراوەی تۆزلێنیشتوو، هێندە رۆمانێکی جیدی، کتێبێکی شیعیر یان کتێبی ئەو نوسەرە جیدیانەی کە هەزاران

خوێنـەریان هەیـە تیایـدا بـەدی ناکـەیت، ئاسـتی فەرهـەنگیو رۆشـنبیری پیـاوە سیاسـیو حکـومیو بەرپرسـەکانی ئـەو دەزگـا رۆشـنبیریو هونەریانـە لەئاسـتی سـفری رۆشـنبیری دایـە، وەك بـەختیار عـەلی دەڵێـت ئاسـتی رۆشـنبیریان لەخوێندنـەوەی رۆژنامەکانی خۆیـان تێناپـەڕێت، هەنـدێکیان بێجگەلە سەیرکردنی کەناڵـەکانی سـەتەلایت، فریـان بـەگوێگرتن لـەمۆزیكو هونـەری جیدییەوە نیـەو بێجگەلـەو خولیایـە هـیچ خولیایـەکی دیکەی وەك خوێندنـەوەی کتێـبو گرنگیـدان بـە رۆشـبیریو هونـەریان نیـە، سـەرباری هـەموو ئـەو کەموکوڕییـە گـەورە مەعریفیانـە ڕێگرێکـی گەورەشن لەبەردەم کاری جیدیو شاکاری گـەورەو خـەونی گـەورەو دنیابینی جیاوازدا، هاوکات دەزگاگەلێکی هەژارن لەرووی مەعریفیو ئەکادیمییەوە، دەرەنجام هێندەی کاردەکەن بۆ شێواندنی ئـەو ئاسـتە ژیارییـە رۆشـنبیرییە، هێنـدە خـاوەنی پرۆژەیـەکی جیـدی نـین، پرۆژەکـانی ئـەو دەزگایانـە هێنـدەی پرۆژەگـەلێکن بـۆ کـاولکردنی رۆشـنبیریو هونـەریو وێرانکردنـی فەرهـەنگو بێبایـەخکردنی روانینـی مـۆدێرن، هێنـدە دەزگاگـەلێك نـین بـۆ بەرهـەمهێنانی گوتـارێکی جیـاوازی مـەعریفیو رۆشـنبیری. هێنـدەی پرۆژەیـەکی گـەورەن بـۆ بێبایـەخکردنی نوسـینو کتێـبو هونـەرو رەخنـەو قسەکردن، هێنـدە پرۆژەیـەکی بچوکی مۆدێرن نـین بـۆ گەڕانـەوەی بایەخو جیدیەت بۆ کارو ئەرکی رۆشنبیری.

دەسەڵاتە کۆشندەکان چێژ لـەرۆتینو داگیرکـردنو خاوەنـدارێتی دەبینن، چێژ لـەوێرانکردنی هونـەرو رۆشـنبیری دەبیـنن، شاگەشکە

دەبن کاتێك دەزگا رۆشنبیری و هونەرییەکان دەکەن بە بارەگایەکی حیزبی، تاسەرئێسك شەیدا دەبن بە کردنەوەی سەدان مزگەوت و کەنیسەو بارەگای حیزبی، ئەتریقێنەوە بەوەی کە زانکۆکان و پەیمانگاکان و قوتابخانەکان و دائیرە حکومییەکان پڕبکەن لەدۆست و ئەحبابی حیزب. یەکێك لەهیوایەتە گرینگ و پڕبایەخەکانی ئەم جۆرە حکومەتانە مەرگدۆستیە، واتا تامەزرۆی چلەی ماتەمینی سەرکردەو شۆرشگێرو نوسەرو هونەرمەندەکانن، هیوایەتیان ئەوەیە کاتێك کە نوسەرەکان دەمرن، یەکرا دوای مردنیان کتێبیان بۆچاپبکەن، دوای مردنی هونەرمەندەکان پیشانگەی گەورەیان بۆ بکەنەوە، هیوایەتیان ئەوەیە لەریزی پێشەوەی تەعزێکاندا دانیشن، یەکێك لەو ئەخلاقە دواکەوتوانەیان بریتییە لەشکۆدارکردنی رابردوو، سازدانی کەرنەڤاڵ و مەراسیمی گەورە بۆ پیاوە تۆزلێنیشتووەکان، هەڵواسینی وێنەی سێ بەچواری رابردووی خۆیان، کردنەوەی سەدان مزگەوت و دیوەخان و دەزگای حیزبی لەلایەن حکومەت و حیزب و سەرکردەکانەوە، کە هەموو ئەم فیعلانە بەڵگەی نەخوێنەوارییەکی گەورەوگرانە بە دنیای مۆدێرن و شارستانیەت. بەڵگەیە بۆ بێبایەخکردنی فەرهەنگ و رۆشنبیری و دنیابینی مۆدێرن، هەولگەلێکی ناتەندروست و ناشارستانین بۆ کوشتنی خەون و روانین و دنیابینییەکان و چەواشەکردنی کۆمەڵگەو بچووککردنەوەی دنیا بۆ تاکەیەك حیکایەتی دووبارە، بۆ بارەگایەکی حیزبی، بۆ دنیابینییەکی کۆنەپەرستانەی ئیفلیج لەرووی ئەکادیمی و زانستی و فەرهەنگی و ئابورییەوە.

# جەهل و دەسەڵات

## دەسەڵاتی داخراو/ دەسەڵاتی کراوە

"لەکۆمەڵگەی مۆدێرندا هەر تاکەکەسێك
دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیو پەیوەندی بە کۆمەڵگاوە
لەگیرفانی خۆیدایە." مارکس

بۆئەوەی قسە لەسەر دیموکراسی بکەین، بۆئەوەی باس لەدنیای مۆدێرنو کۆمەڵگەیەکی کراوە بکەین، بۆئەوەی لەدروشمە رەنگاڵەییەکانی دیموکراسیو مافە مەدەنییەکان دووربکەوینەوە، بۆئەوەی بەخەیاڵێکی ئایدۆلۆژی یان حیزبی یان مەزهەبی ئەو چەمکانە وەرنەگێڕینە سەر دنیای خۆمانو بیکەین بە هوتافکێشانو قسەی زل، دەبێت بەرلەهەرشتێك بگەڕێینەوە سەر جیاکردنەوەی ئەو تێکەڵکردنە نالۆژیکییەی هەردوو چەمکی دیموکراسیو دیکتاتۆریی، بەواتایەك بەبێ تێگەیشتن لەو دنیا داخراوەی کە بەرهەمی ئەو دەسەڵاتانەن لەدنیادا، قسەکردن لەدیموکراسیەت لەگێڕانەوەی حیکایەتێك دەچێت، لەبەرئەوە

بۆئـەوەی دوربکەوینـەوە لەحیکایەتـەکانی دنیـای مـۆدێرن و کـەمێك نزیکبینـەوە لەلایەنـە پراکتیکـی و کرداریـیەکانی دنیـای مـۆدێرن، دەبێت ئەو دروشمە بەتاڵانە قبوڵنەکەین کە لـەڕێی ئایـدۆلۆژیاکان و حیزبـە تەقلیدییـەکانی کۆمەڵگـە داخراوەکانـەوە بانگەشـەی بـۆ دەکرێـت، لەبەرئـەوەی بانگەشـە بـۆ دنیـای مـۆدێرن هـەموو شـتێکە بـەس دروشـم نیـە، ئـەوەی دەبێتـە دروشـم و هوتافکێـشانی بـەتاڵ دەبێت بە درۆیەکی گەورەو حیکایەتی رامکردنی کۆمەڵگە.

دیموکراسـی لەسـەر بنـەمای وتوێـژی ئـازادو قەناعـەتپێکردن و دیالۆگ دامەزراوە. جەختکردنی دیموکراسی لەسەر دیالۆگ و بەتەنها قـایلبوون نیـە بـەجیاوازی بـیروڕاو جیـاوازی بەرژەوەندییـەکان لەزۆربەی پرسە سیاسیەکاندا، بەڵکە ئەوەش دەردەخات کە دەبێ بۆ دەربڕینی ئەو جیاوازیانەو گوێگرتن لێیان ڕێز دابنێین. کەواتە پێش گریمانـەی دیموکراسـی قبـوڵکردنی هـەبونی فرەیـی و جۆراوجـۆریی کۆمەڵگەو یەکسانی هاوڵاتیـەکانێتی و، کـاتێکیش ئـەو جۆراوجۆرییـە دەردەکـەوێت کـە کێـشەکان بـە ڕەوشـێکی دیموکراسـیانە چارەسـەر دەکرێن، واتە لەڕێگەی وتوێژو قەناعەتپێکردن و سازشکردن نـەوەك بەداسەپاندنی ملهوڕانەی باوەڕ یان دەرخستنی دەسەڵات.

## ئازادییە سەرەتاییەکان

دیموکراسی پارێزەری ئازادییـە سـەرەتاییەکانە. نـاکرێ وتوێـژی ئـازاد وەك میتۆدێـك بـۆ دەربـڕین و چارەسـەرکردنی کێـشە

کۆمەڵایەتییەکان بەبێ هەبونی ئەو ئازادییانە بەدیبێت کە لەیاسای مافە مەدەنیو سیاسییەکاندا رەچاو دەکرێت. ئەم مافانە بریتین لە:

ئازادی رادەربڕین، ئازادی کۆڕوکۆبونەوەکانو ئاسایشی تاکەکەسو ئازادی سەفەرو کۆچکردن، ئازادی بیروڕاو بیرکردنەوە، چالاکی فەرهەنگی، ئازادی داواکردنو لێپرسینەوەو دورستکردنی فشارو داکۆکیکردنو خۆپیشاندانو رێپێوانو مانگرتن، ئازادی دروستکردن گروپی فەرهەنگیو سیاسیو ئابوریو رۆشنبیری...تاد

دیموکراسی دەتوانێت پشتیوانی پاراستنی ئەم مافانە بکات، چونکە هەبونی ئەوانە بۆ پاراستنو مانەوەی دیموکراسی زۆر پێویستەو، ئەو مافانەش لەباشترین دۆخدا دەستەبەرکەری گەشەکردنی تاکەکانی کۆمەڵنو دەبنەهۆی دروستبونی روحیەتی بڕیاردانی بەکۆمەڵ کە خۆیلەخۆیدا پێوەرێکە بۆ دیاریکردنی بەهاداریی بەڵگەهێنانەوەکانو بەڵگە جۆراوجۆرەکانو شکاندنی ئەو تەوقە داخراوەی دەسەڵاتو ناوەندەکانی بڕیار.

## هەڵبژاردن وەك گەمەیەکی درێژخایەنو پەکخستنی هێزی رایگشتی

### کۆنترۆڵکردن لەرێگەی هەڵبژاردنەوە:

سادەترین وەڵام بۆ ئەم پرسەی سەرەوە ئەوەیە کەسیستمی پەرلەمانی باشترین سیستمە کە تائێستا بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت گەڵاڵە کراوە، ئەویش لەهەلومەرجێکدا کە رێژەی دانیشتوان دەگاتە

چەندان ملیۆنو خەڵكیش دەرفەتی ئەوەیان نیە بەشێوەیەكی بەردەوام هەمووو كاتی خۆیان بۆ پرسە سیاسیەكان تەرخانبكەن. ئەم تیۆرە پێیوایە كە لەم سیستمەدا خەڵكی لەتەك هەڵبژاردنی سەرۆكی حكومەت (سەرەك كۆمار یان سەرەك وەزیران)و هەڵبژاردنی ئەندامانی دەسەڵاتی یاسادانان، دەتوانن چاودێری حكومەت بكەن، چونكە پەرلەمان بەكەڵكوەرگرتن لەدەسەڵاتی خۆی بۆ پەسەندكردن یان رەتكردنەوەی یاساكانو شێوەی داراییبەندی، دەتوانێت بەردەوام لەرێی خەڵكییەوە چاودێری حكومەت بكات. ئەمەی باسمان لێوەكرد تەنها ستانداردێكی جیهانییەو لەدنیای مۆدێرنو لەنێو كۆمەڵگە كراوەكاندا كاریگەری خۆی هەیە، بەڵام پەرلەمان لەكۆمەڵگە داخراوەكاندا یان تەمەڵخانەیەكی گەورەیە، یان دەزگایەكی كارتۆنییە، هاوكات حكومەتو دەسەڵاتی جێبەجێكردنیش حساب بۆ هاوڵاتیان ناكەنو زیاترو زیاتر لەهەوڵی بچوكردنەوەی ژیانی مەدەنیو جیاوازییەكاندان.

## رایگشتیی

گەرچی هەڵبژاردن سەرەكیترین ئامرازە كە خەڵكی لەرێگەی ئەوەوە ئازادی بریاردان سەبارەت بە سیاسەتەكانی حكومەت لەسیستمێكی پەرلەمانیدا بەدەست دێنێت. بەڵام تاكە ئامرازیش نیە. بۆنمونە خەڵكی لەسیستمە دیموكراسیەكاندا دەتوانن بۆ تێكۆشان لەدژی گۆرین یان نەگۆرینی یاساكان پەیوەندی بە ئەنجومەنە جۆراوجۆرەكانەوە بكەن، یان ببنە ئەندامی حزبە

سیاسیەکان‌و هەروەها دەتوانن بەتایبەت دەسەڵاتی خۆیان بەسەر نوێنەرەکانیاندا بسەپێنن. حکومەتەکانیش ئەرکی سەرشانیانە بەنۆبەی خۆیان لەتەك کەسانێکدا کە سیاسەتەکانی حکومەت کاریگەرییان لەسەر دادەنێت، یان لەتەك ژمارەیەك لەخەڵکی وەك نمونەی ئەو کەسانەی کە دەنگیانداوە گفتوگۆو راوێژ بکات. بەکردەوە جگە لەژمارەیەکی کەم لەحکومەتە هەڵبژێردراوەکان ئەوانی دیکەیان لەکاتی دەرکەوتنی رایگشتیدا لەئەماندا نین. رایگشتی بەشێوەیەکی بەردەوام لەرێگەی دەرئەنجامی راپرسیەکان یان لەرێگەی چاپەمەنی‌و رادیۆو تەلەفزیۆنەوە بەحکومەت دەگەیەنرێت، بەڵام دواجار کارامەبونی تەواوی ئەم کەناڵە کۆنترۆڵکراوانەی خەڵکی بەندە بەکارامەبونی پرۆسەی هەڵبژاردن‌و راپرسی‌و گەڕانەوە بۆ رایگشتی، بەڵام ئەم پرۆسەیە لەژێر دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری‌دا یان تۆتالیتاری وەك سەردەمی هێتلەرو مۆسۆلۆنی‌و ستالین‌و بینۆشیەو سەدام حوسێندا نەك هەر بوونی نەبووە، بەڵکە ئەو دەسەڵاتانە بە وردی کاریان لەسەر کوشتنی فەردانییەت‌و رایگشتی‌و رۆحی مرۆڤ کردووە، بەردەوام لەهەوڵی سڕینەوەی جیاوازی‌و دنیابینییە جیاجیاکاندا بوون.

حکومەتەکان تەنها لەکاتێکدا بەجددی بایەخ بەرای گشتیی دەدەن، کاتێك دەگەنە ئەو باوەڕەی کە بزانن لەکاتی گوێ پێنەدانیان بەم بیروڕایە، لابردنیان لەسەر پۆستەکانیان شتێکی حەتمییە. ئەم گوێگرتنەش کاتییەو هەوڵێکە بۆ چەواشەکردنی هێزە مەدەنییەکان.

# قبوڵكردنی جیاوازی

دیموكراسی بەبێ قبوڵكردنی جیاوازییەكان دەرئەنجامێكی پێشكەوتوی شارستانی نابێت، كۆمەڵگای مۆدێرن ئەو كۆمەڵگەیەیە كە یەكتر قبوڵكردنو ئازادی رادەربڕینو رایگشتیو جیاوازییە فەرهەنگیو كۆمەڵایەتیو رەگەزیو نەژادییەكانی تیادا قبوڵدەكرێت، بوارێكی كراوەو بەرفراوانی ژیاری لەئارادایە بۆ سەرجەم چینو توێژو دەستەو گروپە جیاوازەكان، بۆیە بەبێ گفتوگۆو دیالۆگی شارستانیو فەرهەنگی لەنێوان ئەو ناوەندە كۆمەڵایەتیو فەرهەنگییە جیاوازانەدا ئەركێكی گەورەی مەدەنیو دیموكراسی سەرلەبەری رێكخراوو ناوەندو هێزە مەدەنییەكانە.

ئەورۆكە كۆمەڵگەی عێراقی لەڕووی سیاسیو كۆمەڵایەتیو فەرهەنگیو مەزهەبیو ئیتنییەوە لەساتەوەختێكی زۆر جیاوازو ئاڵۆزو ناهەمواردا دەگوزەرێ، ئەگەر بەخێرایی بگەڕێینەوە بۆ ئەو فلاشباگە سیاسییەی كە عێراقی سەردەمی دیكتاتۆریەتی پیادا تێپەڕیوە، ئەوا ناتوانین بڵێین دەوڵەتی عێراقی دەوڵەتێكی دیموكراتیو مەدەنیو مۆدێرن بووە، لەبەرئەوەی ئەو دەسەڵاتەی لەعێراقدا هەبووە دەسەڵاتێكی دیكتاتۆریو تۆتالیتاری بووە، دەسەڵاتێك بووە بۆ بە ئۆردوگاییكردنی كۆمەڵگاو بەزیندانیكدنی كۆمەڵگاو جینۆسایدو مۆنۆپۆلیزەكردنی سەرلەبەری سەرچاوە ئابوریو سیاسیو فەرهەنگیو كۆمەڵایەتیو ئیتنییەكانو دەسەڵاتێك بووە بۆ بچوكردنەوەی كۆمەڵگاو شارستانییەتو ناوەندەكانی ژیان، دەسەڵاتێك بووە بۆ بەزەبر

هێشتنەوەی ئەو هێزە خەفەکراوەی قبوڵنەکردنی جیاوازییەکانو ئەو نابەرابەرییە کولتوریو ئیتنیو مەزهەبییەی کە بە زەبری چەكو زیندانو مۆنوپۆلیزەکردنو جینۆساید راگیرابوو، ئەورۆکە پاش روخانی رژێمی دیکتاتۆرو نەمانی ئەو دەسەڵاتە کاریزمییە، ئەو زەبرو زەنگە سیاسیو کولتورییە نەماوە بۆ خەفەکردنو لەناوبردنی جیاوازییەکانو یەکترقبولکردن، بەلام ئەم بارودۆخە هێندە گەشبینانە نیە، پاش خەفەکردنی سەرجەم ئەو جیاوازییە فەرهەنگیو ئیتنیو مەزهەبیانە لەماوەی ئەو (35)ساڵەی ئەو دەسەلاتە دیکتاتۆرو تۆتاتلیتارییەدا چەند خۆشبەختانەیە بۆ ژیانێکی ئازاد هێندەش بارودۆخێکی ئالۆزو ناهەموارە بۆ یەکتر قبولکردنو دیالۆگی شارستانیانە، چونکە ئەو دەسەلاتی زەبروزەنگەی دیکتاتۆری بەزەبرو مەرگو زیندانییکردنو بەماشێنکردنی سەرلەبەری کۆمەلگەی عێراقی جیاوازییە ئیتنیو کولتوریو مەزهەبییەکانی خەفەکردبوو، بەلام ئەوەمان لەبیرنەچێت پاش نەمانی ئەو زەبرە سیاسییە هێزە جیاوازە فەرهەنگیو مەزهەبییەکان دێنە ئاراوە، سەرجەم مەزهەبو هێزە کولتوریو ئیتنیو حیزبییەکان دەکەونە ململانێوە، هەڵبەت چەمکی ململانێش لەناوچە داخراو و دواکەوتوەکانی دنیادا، زیاتر گوزارشت لەیەکتر قبولنەکردنو نالێبوردەییو دەسەلاتی زاڵبوونو حساب نەکردن بۆ ئەوی بەرامبەر دەکات. لەبەرئەوە بۆئەوەی ئێمە زیاترو زیاتر ئەو روحییەتی یەکتر قبولکردنەو ئەو تێزی ململانێ شارستانییە سیستماتیزە بکەین دەبێت کار لەسەر دروستکردنی ئەو روحیەتە بکەین لەرێی هۆشیارکردنەوەی هاولاتیان بە چەمکی کۆمەلگەی مەدەنیو هەڵسوکەوتی شارستانیو

یەکتر قبوڵکردنو لێبوردنو دروستکردنی دیالۆگی مەدەنیانەو دیموکراسیانە لەنێوان مەزهەبە جیاوازەکانو کولتورو رەگەزو نەژادە جیاوازەکان. بەلاّم ئەم پرۆسەیە لەکۆمەڵگەیەکی داخراودا کە پڕە لەهێزی دۆگماو نادنیابینیو تایەفەگەریو سەلەفیەتو تیرۆرو بازرگانی سیاسیو عەقڵی داخراو و عەشیرەو قەبیلەی تەوتەمیو ناوەندو دەزگای میلیشاییو بوونی سەدان هەزار دیکتاتۆری بچوك مەحاڵە، تادەسەلاّت نەگاتە قەناعەتێکی زانستی بەدیموکراسییەت، تا کۆمەڵگەش نەگاتە بارێکی گەورەی بەرپرسیارێتی نە جیاوازییەکان قبوڵدەکرێت، نە دەسەلاّتە داخراوەکانیش بەرەو کرانەوە دەڕۆن.

## هاولاّتیانو دەسەلاّت

لەنێوان هاولاّتیانو دەسەلاّتی حکومەدا پەیوەندییەکی هەمەلایەن هەیە، کە پەیوەستە بە جۆری سیستمی حوکمو شێوازی بەڕێوەبردنی دەوڵەتو دامودەزگاکانیەوە، هاوکات هاولاّتیانیش بەشێوەیەك لەشێوەکان پەیوەستن بەحوکمەتو دامەزراوەکانییەوە.

دەبێت ئێمە ئەوە بزانین کە هاولاّتیان بەسەر چینو توێژەکانی کۆمەڵگادا دابەشبوون، کەسانێك مامۆستان، هەندێکی دیکە کرێکار، خوێندکار، جوتیار، فەرمانبەر، ئەفسەر، پۆلیس، کارمەندی دەوڵەت، سەرباز، پیاوانی ئاینی، هونەرمەند.... تاد؛ تەواوی چینو توێژەکانی کۆمەڵگە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە دەوڵەتو دەسەلاّتو سیستمی حوکمەوە هەیە، لەبەرئەوە لێرەوە دەگەینە ئەو باوەڕەی کەهەموو یەکێك لەئێمە بەشێوەیەك لەشێوەکان پەیوەندیمان

بەدوڵەتەوە هەیە. سەرباری ئەوە ئێمە وەك مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتین، لەبەرئەوە ئێمە لەڕووی کولتوری و کۆمەڵایەتی و ئابوری و شارستانییەوە پەیوەندییەکی ئەوتۆمان هەیە بەژیان و گوزەران و گۆڕانکاری و پێشکەوتنەوە هەیە، هاوکات هەموو کۆمەڵگەیەك لەدنیادا خاوەنی خاك و نیشتمان و زمانی هاوبەشی خۆی و سیستمی بەڕێوەبردنی خۆیەتی، ئێمەش بەشێکین لەجیهان، کەواتە ئێمە هاوڵاتییەکی ناوچەیەکی دیاریکراوین و هاوڵاتیەکی جیهانیشین، لەبەرئەوە هەموو یەکێك لەئێمە خاوەنی مافی هاوڵاتیبون و مافە شارستانیەکانە، کە پێویستە هەموو هاوڵاتیەکی شارستانی ئەو مافانەی هەبێت و داکۆکی لێبکات، هەروەها دابینکردنی ئەو مافانەش بەپلەی یەکەم دەکەوێتە سەرشانی دەوڵەت و دامودەزگا خزمەتگوزاری و ئابوری و ژیارییەکانی.

لێرەوە ناکرێت ئەوە لەیادبکەین کە ئەو دەوڵەتانەی رژێمێکی دیکتاتۆری و ستەمکاری دەیبات بەڕێوە، هاوڵاتیان تیایدا بچوکترین مافی هاوڵاتیبونی خۆیان نیە، بۆنمونە تەواوی هاوڵاتیان بەشێوەیەك لەشێوەکان دەچەوسێنەوە، ئەو چەوسانەوەیەش بەتەنها بریتی نیە لەچەوسانەوەی جەستەیی، بەڵکە پێکهاتووە لەچەوسانەوەی ڕۆحی و دەرونی و پێشێلکردنی مافەکانی تاکەکەس و هاوڵاتیان بەگشتی و ستەمکاری و خەفەکردنی ڕایگشتی هاوڵاتیان و چەوسانەوەی ئابوری و فەرهەنگی و چەوسانەوەی شارستانی.

لەبەرئەوە هەموو یەکێك لەئێمە بەرپرسیارە بەرامبەر مافەکانی هاوڵاتیبونی خۆی و تەواوی هاوڵاتیان، هاوکات بەرپرسیاریشین بەرامبەر حکومەت و گۆڕانکارییەکان، کەواتە ئەو

پردی پەیوەندیەی کە لەنێوان هاوڵاتیان و دەوڵەتدا لەئارادایە وەستاوە لەسەر بەرپرسیارێتی حکومەت و دامودەزگاکانی بەرامبەر هاوڵاتیان و دابینکردنی مافە بنچینەییەکانی هاوڵاتیان و ئەو بەرپرسیارێتیە دولایەنەی کە لەنێوان هاوڵاتیان و دەوڵەتدا دروستدەبێت بۆ بەرهەمهێنانی پەیوەندیەکی تەندروست و شیاو، لێرەدا ناکرێت ئەوە لەیادبکەین کە ئەگەر حکومەت گوێ لەڕایگشتی هاوڵاتیان نەگرێت و لەوەش خراپتر بەدەنگ ڕەخنەو داواکاری و پێویستیەکانی هاوڵاتیانەوە نەچێت و خۆی بە بەرپرسیار نەزانێت، دەرەنجام شتێك نامێنێت ناوی پردی پەیوەندی بێت لەنێوان هاوڵاتیان و دەوڵەتدا، هاوکات ئەم گوێپێنەدانەی حکومەت و دامودەزگاکانی ڕێخۆشکارێکی باشە بۆ لەدایکبونی دیکتاتۆرەکان و گەندەڵی ئیداری و بەڕێوەبردن.

دواجار دیموکراسی تەنیا پرۆسەیەکی حکومکردن نیە، واتە تەنها بەڕێوبردنێکی کارگێڕیی دەوڵەت و دامەزراوەکانی نیە، بەڵکو دیموکراسی لەناخی خۆیدا سیستمێکی یاساییشە. یاسا توخمێکە لەپێویستیەکانی دروستکردنی پرۆسەی بە دیموکراسیکردنی دەوڵەت و دابینکردن و داکۆکیکردن لەمافەکانی هاوڵاتیان و دروستکردنی ئەو پردی پەیوەندییە مۆدێرن و تەندروستەی کە پێویستە لەنێوان هاوڵاتیان و دەوڵەتدا دروستبێت. هاوکات حکومەتی مۆدێرن ئەو حوکمەتە شەفاف و عادیلەیە کە لەهاوسەنگییەکی دروستدا کلێشەیەکی دەستوری و یاسایی و مەدەنی هەیە بۆ بەڕێوەبردنی هاوڵاتیان و پاراستنی مافە مەدەنی و سیاسی و

فەرهەنگیو کۆمەڵایەتیو ئابورییەکانی تاکەکەسو کۆمەڵگە. هەر کەموکورییەك هەبێت لەم هاوسەنگییەدا کلێشەکە تێکدەچێتو ئاراستەی کارکردنی دەوڵەت یان بەرەو ستەمکاریی یان بەرو ئۆلیگاریشی یان بەرەو دیکتاتۆری ملدەنێت.

ئەو دەسەڵاتەی بەردەوام لەهەوڵی داگیرکردنی پانتاییەکاندایە بۆ کۆکردنەوەی هێزەکانو بەکاربردنی ئەو هێزانە لەکارگەلێکی پراکتیکی ژیاریدا بۆ خاوەنداریێتیکردنی سەرلەبەری ژیانو سەرچاوە ئابوریو فەرهەنگیو سیاسییەکان، هەڵبەت ئەو دەسەڵاتە ستەمکارە تەنها لەسەر ئەوە رانەوەستێت، بەڵکە خۆی دەکات بەتەواوی کەناڵە جیاوازەکاندا، بەواتایەك ئەو خۆی دەکات بەناو کۆمەڵگەو دامودەزگاکانداو خۆی دەکات بە ناوەندە هەستیارەکانی بەڕێوەبردنو کارگێڕیو ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکانو گروپو کۆمەڵەکان، هاوکات تەواوی کایەو پێکهاتەکانیش بێبەش نابن لەکاریگەرییەکانی هێزو ئەرکی پراکتیزەکردنی دەسەلات لەسەر رووبەرە جیاجیاکانی ژیانو کولتورو ئاینو هۆشیاری گشتیو میدیاکانو سەندیکاو دامەزراوەکانو تاکەکەسەکان. بەمپێیە ئەوەی دەسەلات دەخاتە بەرگێکی دیکەی راڤەکردنەوە ئەو کلێشە نوێیەی دنیای مۆدێرنەیە بۆ هەژمونگەری دەسەلاتو دەسەلاتی هەژمونگەر لەسەردەمی سەرمایەداریو دنیای نویو سەرمایە جیاوازەکان، هاوکات کاتێك باس لەپراکتیزەکردنی دەسەلات دەکەین لەخانەو پێکهاتەکانو ئەو ئاستە ژیارییەی کە لەبەریەککەوتنێکی سەرتاسەریدا دەگوزەرێت، ناکرێت باس لەدنیابینییە جیاوازەکانو

ئــەو جیاهانبینییــە نەکەیــەن کــە لــەدەرەوەی ئــەو ستراکــچەرە داخراوانەو لەدەرەوەی دەسەلاّتە نەریتییەکانو لەدەرەوەی کۆمەلگە داخراوەکــان روانینێکــی دیکــە گەلاّلّەدەکــەن بــۆ رەنگرێــژکردنی ئاستێکی دیکەی شارستانی کراوەتــرو جیاوازتر لــەوەی کــە هەیــە، بەواتایەك رازیبوون بە سنوری دنیا داخراوەکانی خۆت رازیبوونیشە بەو قەدەرەی کە دنیاکانی ترو خەیالگەکانی تر لەدەسەت دەدەیت.

بۆ نوسینی ئەم وتارە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

1/ئالان تۆرین ، دیموکراسی چییە

2/ئاسۆ جەبار، کۆمەلگەی مۆدێرن

3-دیموکراسی چییە، دیڤید بێتهام، کوین بۆیل

# رابگشتی و دەسەڵاتی داخراو

"دیموکراسی دەستپێکەری مێژوویەکە کە مرۆڤ تیایدا لەوپەڕی
گوماندایە لەبارەی بنەماکانی دەسەڵات، یاساو مەعریفەوە،
هەروەها بنەماکانی پەیوەندی یەکێك بە ئەوی دیکەوە لەگشت
شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا." رامین جەهانبەگلو

کەواتــە تاکەکــەس ئــەو خودەیــە کــە هەڵــسوکەوتو رەفتــاری
لەنێوان ویستی ئازادیو پەیوەستبوون بـە رۆشـنبیریو بانگەشـە بـۆ
عەقڵ کۆدەکاتەوە؛ هەروەها دەبێتە کۆی ئەم سێ بنەمایـە: بنـەمای
تاکەکەسـایەتیو بنــەمای تایبەتمەنــدیو بنــەمای کۆمەڵگەیــەتی.[5]،
دنیای مۆدێرن دنیـای مرۆڤـە جیاوازەکانـە، دنیـای یەکلایکردنـەوەی
ئازادییەکانی مرۆڤو بەبەرستەکانی بەردەم هەموو ئەو ئازادییانەیە،
دنیــای پرســیارە گەورەکانــە لەدیموکراســیو مافــە مەدەنییــەکانی
هاولاتیو دنیای خۆشگوزەرانی زیـاترو دنیـای کاڵبونـەوەی سیـستمی
دیکتــاتۆریو تۆتالیتــاری، هاوکــات دنیــای گرنگیدانــە بــە مــرۆڤو
تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ، دنیای پەیوەندیو کرانەوەو تێکەڵاوبونی

[5] ئالان تۆرین، ماهیة الدیموقراطیة، ل

فەرهەنگەکانە. هەڵبەت لەڕووی کرداریشەوە دنیای پراکتیزەکردنی سەرجەم ئەو چەمکانەیە کە پەیوەندییەکی راستەوخۆی هەیە بە دیموکراسیو شەفافیەتو کۆمەڵگەی مەدەنیو کرانەوەو قبوڵکردنی جیاوازیو خۆشگوزەرانی زیاتر بۆ مرۆڤو دڵنیاکردنەوەی لەژیانێکی ئاسودەو تایبەتمەندیی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیو تاکەکەسی باشتردا.

ئالان تۆرین لەبارەی پەیوەندییە فەرهەنگیو دیموکراسییەکانی تاکەکەسەوە کار لەسەر کلێشەیەکی دیکە دەکات، هەڵبەت یەکێك لەو تێزە گرنگانەی کە هاوڵاتی داناماڵێت بۆ تەنها کۆمەڵە مافێکی دیاریکراو تێزەکەی ئەم بیرمەندەیە، لەبەرئەوەی ئەو پێیوایە خاڵیکردنەوەی مرۆڤ لەهەر گۆڕانو وەرچەرخانێکی گەورەو لەهەر خەونێکی جیاواز بۆ ژیانو شارستانیەت، واتە بەتاڵکردنەوەی کۆمەڵگە لەگۆڕانو داخرانی زیاتری فەرهەنگیو سیاسیو ژیاریو دەڵێ: "دیموکراسی مرۆڤایەتی داناماڵێت بۆ تەنها هاوڵاتی، بەڵکە وەك تاکەکەسێکی ئازاد دانیپیادەنێت، بەڵام هەروەها وەك تاکەکەسێکی پەیوەست بە کۆگەلە ئابوری یان رۆشنبیرییەکانیش ئیعترافی پێدەکات."[6]

هاوکات قبوڵکردنی جیاوازیو فرەچەشنی سیاسیو روانینو دنیابینی فەرهەنگیی جیاجیا کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی مۆدێرننو تەنها لەکۆمەڵگە کراوەو مۆدێرنەکاندا جێی رێزو حورمەتی زیاترن، بەواتایەك رێزگرتن لەجیاوازییەکانو گەڕانەوەی ئیعتیبارو

---

[6] ئالان تۆرین، ماهیة الدیموقراطیة،

بەهای تایبەتمەندی یەکێکە لەبنەما هەر بنەڕەتییەکانی ژیانی دیموکراسیو مەدەنی هاوڵاتیان، هەروەها یەکێکیشە لەرێکخەرە هەرە پڕ بایەخەکانی دەوڵەتی دامودەزگاییو کلێشەسازییەکی مۆدێرنیشە بۆ راگرتنی هێزو تایبەتمەندی لەنێوان هاوڵاتیان وەك تاکەکەسو دەوڵەت وەك خزمەتگوزارو راپەڕێنەری ژیانی هاوڵاتیان. هەر بۆیە ئالان تۆرین ئەو رێکخەرە بەمشێوەیە باسدەکات:"سیستمی دیموکراسی بریتیە لەدارشتەیەکی ژیانی سیاسی کە ژمارەیەکی زۆر بەزۆرترین ئازادی تەیار دەکات، هاوکات دارشتەیەکە کە پارێزگاری لەفراوانترین هەمەچەشنی پێویست دەکاتو دانیپێدا دەنێت."[7]

هەر لەرێی قبولکردنی جیاوازیو رێزگرتن لەفرەچەشنیو تایبەتمەندییە سیاسیو ئاینیو فەرهەنگیو کۆمەلایەتیەکانەوە، دەگەینە قۆناغێکی دیکەی دیموکراسیو جیاکردنەوەی ئەو تایبەتمەندییە لەدیکتاتوریەتو سیتمی تۆتالیتاری، واتە ئەوەی دەناسرێتەوە لەسیتمی دیموکراسیدا دروشمەکانو هوتافکێشانەکان نیە بۆ دیمکراسی، بەلکە پراکتیزەکردنو وێناکردنێتی لەرووی کردارییەوە لەناو کۆمەلگەو ژیانی تاکەکەساندا.

دواجار دیمکراسیو گرنگیدانە بە مرۆڤو بەرقەراکردنی مافەکانی تاکەسو رێزگرتن لەجیاوازییەکان، بریتینیین لەزالکردنی ئاینێك لەئاینەکان بەسەر تەواوی کۆمەلگەو فەرهەنگو مرۆڤەکاندا، بەهەمانشێوە ناکرێت فەرهەنگی یەکێك لەنەتەوەکان

---

[7] ئالان تۆرین، ماهية الديموقراطية،

بالأدەست بێت بەسەر تەواوی کۆمەڵگەدا، "بیرۆکەی ئاینی دەوڵەت، ئەگەر هاتوو بەمانای داسەپاندنی ژمارەیەك لەبنەما ئاکاری‌و فیکرییەکان بوو، ئەوا دەچێتە سەرلوتکەی ئەو هزرانەی کە دەبێتە نەیاری دیموکراسی."[8] ئەو ئاستەنگ‌و گرفتە گەورانەی کە کۆمەڵگە داخراوەکان‌و فەرهەنگە هەزارەکانی گرفتارکردووە تەنها لەتێنەگەیشتنیانەوە بۆ دیموکراسی‌و دنیای مۆدێرنەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکە کێشەی هەرە گەورەی ئەم دەسەلآتانە لەستراکچەری پێکهاتەی سیاسی‌و حیزبییەوە دێتە ئاراوەو دەبنە خاڵی وەرچەرخانی ناعەدالەتی‌و نەبوونی سەروەری یاساو گەندەڵی لەکۆمەڵگەیەکی وەستاودا، هاوکات ئەو دەسەلأتانە راڤەکاری‌و شیکاری تایبەتی خۆیان هەیە بۆ چەمکە مۆدێرنەکانی وەك لیبرالیزم‌و دیموکراسی‌و کۆمەڵگەی مەدەنی‌و بازاڕی ئازادو ماف‌و ئازادییەکانی تاکەکەس.. بۆنمونە زۆرجار ئەوان دەگەنە باوەڕێکی رەها دەربارەی ئەوەی دیموکراسی واتە حساب نەکردن بۆ رایگشتی‌و راوبۆچونی هاولأتیان یان بێبایەخکردنی قسەکردن‌و رەخنەو جیاوازی، ئەمەش بۆخۆی لەجەهلێکی گەورەوە بە دیموکراسی‌و دنیای مۆدێرنەوە سەرچاوە دەگرێت، هەڵبەت ئەو دەسەلأتەی بە کردار کار لەسەر بێبایەخکردنی راوبۆچونی هاولأتیان‌و رەخنەی رۆشنبیران‌و ناوەندە جیاوازەکان دەکات دەسەلأتێکی هەمەجی‌و دواکەوتووە، ئێمە لەبەشەکانی دیکەدا پتر ئەو سەرزەمینە پڕ لەجەهلەی ئەو دەسەلأتە هەمەجیانە دەخەینە بەرباس‌و راڤەکاری‌و رەخنە.

---

[8] ئالان تۆرین، ماهیة الدیموقراطیة،

سەرباری ئەوەی تەواوی کۆمەڵگە مافی ژیانێکی باشترو پێشکەوتنێکی گونجاوی هەیە لەخزمەتگوزارییەکی باشترو خۆشگوزەرانێکی شیاودا. تاکەکەسەکانی کۆمەڵگاش بەهەمان شێوە هەموو ئەو مافانەیان بەردەکەوێت کە پێویستەو دەبێت لەلایەن حکومەت‌و ناوەندەکانەوە یاسایەکی یەکسان‌و عادیلانەی بۆ دابنرێت‌و بکرێتە سەرەتای دیموکراسیەت‌و پێشخستنی کۆمەڵگا. هەندێك لەزانایانی بواری دیموکراسی پێیانوایە؛ دابینکردنی مافەکانی تاکەکەس پێش مافەکانی کۆمەڵگا دەکەوێت، واتە سەرەتایەکە بۆ پێشخستنی کۆمەڵگاو دروستکردنی هەڵسوڕانێکی شارستانی بۆ تەواوی کۆمەڵگا، بەڵام هەندێکی دیکەیان باس لەوە دەکەن، دەبێت کۆمەڵگە بەتەواوی هاوڵاتیانەوە گەشەی پێ بدرێت‌و کاری لەسەر بکرێت، دواتر گرنگی بدرێت بە تاکەکەس‌و یەکبەیەکی هاوڵاتیان، لەراستیدا هەردوو هاوکێشەکە لەڕووی کردارییەوە دروست‌و شیاوی کارکردنن، بەڵام لێرەدا ئەوە گرنگە ئێمە بە چ شێوازێك‌و بە چ ئالیاتێك کاریان لەسەر دەکەین.

زامنکردنی مافەکانی هاوڵاتیان‌و داکۆکیکردن لەو مافانە لەڕێیی کۆمەڵێك گۆڕانکاری شارستانیەوە ئەنجامدەدرێت، کە بریتین لە:

هێزە جیاوازەکانی دەرەوەی دەسەڵات: ئەو هێزانەی کە دەکەونە دەرەوەی دەسەڵات کۆمەڵە هێزێکی سیاسی ئۆپۆز[illegible]ۆن‌و کۆمەڵایەتی‌و پیشەیی‌و کولتوری‌و رۆشنبیرین، لەدنیای مۆدێرندا سەرلەبەری ئەم هێزانە دەبنە ناوەندگەلێکی چاودێر بەسەر

دەسەڵاتو دابینکردنی مافەکانی هاوڵاتیانو هەروەها دەبنە هێزێکی ڕەخنەیی بۆ بەرزکردنەوەی ڕەخنەکان بۆ دەسەڵاتو ناوەندە بەرپرسەکان، بەڵام لەدنیای دەسەڵاتە داخراوو کۆمەڵگە داخراوەکاندا، کە دەسەڵات سەرلەبەری سەرچاوە سیاسیو ئابوریو فەرهەنگیو ڕۆشنبیرییەکان داگیردەکات، کار لەسەر گەندەڵکردنو بێباخکردنو بێدەنگکردنو تاڵانکردنی فەرهەنگو بیرکردنەوەی ئەو ناوەندانە دەکات، دواجار ئەو ناوەندانە نەك هەر نەبوونەتە هێزو فشار، بەڵکە ناوەندگەلێکی بێدەسەڵاتو معاشخۆرو پاشکۆی دەسەڵاتن، بەواتایەك ناوەندگەلێکی کارتۆنینو هیچی تر. هاوکات زۆرجار دەبنە بەربەست لەبەردەم هاوڵاتیانو دەسەڵاتدا، لەبەردەم دەنگی جدیو ڕای جیاوازدا. ئەم تاکتیكو ستراتیژە جاهیلانەیە تەنها لەکۆمەڵگە هەرە دواکەوتووەکانی دنیادا پیادەدەکرێتو بەرپرسی سیاسی جاهیلو حیزبی کۆنەپەرستو بێئاگای لەپشتەوەیە کاردەکەن بۆ وێرانکردنو ئیفلیجکردنی ئەو هێزانە، ستەمکاری گەورەو پێشێلکاری گەوەری لەپشتەوە ئامادەیە.

1-میدیای ئازاد: دنیای مۆدێرن دنیای گفتوگۆو پەیوەندییە، دنیای جیاوازیو ڕەخنەو بەدواداچونە، پتر دنیایەکە بۆ ڕەخساندنی بەرپرسیارێتی. هاوڵاتیان بۆئەوەی دەنگدانەوەی خۆیان لەناو کۆمەڵگەدا ببیستنەوە، بۆئەوەی ڕەخنەو نارەزاییو ڕای جیاوازی خۆیان دەربڕن پێویستیان بە میدیایەکی ئازاد هەیە کەبریتین لە: ڕۆژنامەی ئازاد، تەلەفیزۆنی ئازاد، بڵاوکراوەی ئازاد.....تاد. لێرەدا مەبەست لەوشەی ئازاد، تەنها ناو نیە، هەموو حیزبو لایەنێك دەتوانن

ناوی ئازاد لەخۆیان بنێنو باس لەئازادی رۆژنامەوانی بکەن، بەلام میدیای ئازاد شتێکی دیکەیە جیاوازتر لەهەموو ئەو ناوەندانەی حکومەتو گروپی ناپسپۆرو خزمایەتیو ناسیاویو بێئاگاییەکی لۆکالیو نادنیابینییەکی دەستەگەراییو حیزبایەتیو ئاینیو خێلەکیو عەشرەتیو ئایدۆلۆژی، کە هەموو ئەمانە ناتوانن ببنە میدیای ئازاد، بەلام دەتوانن ببنە بازرگان یان ئۆرگانی حیزبی یان کۆمپانیا، بەلام جیاوازتر لەدەزگاکانی حیزب. میدیای ئازاد پردێکی پەیوەندی رەخنەگرانەو چاودێرانەیە لەنێوان هاولاتیانو دەسەلاتدا، هاولاتیان تەنها لەرێی ئەو میدیای ئازادانەوە دەتوانن رای خۆیان بە ئازادی دەربڕن. بەلام لێرەدا تەنها ئەوە گرنگ نیە تۆ وەك هاولاتیەك رای خۆت بە ئازادی دەربڕیت، بەلام گرنگ ئەوەیە تا چەند حکومەتو دەسەلات بایەخ بە رایگشتیو رەخنەو گازەندەکانی هاولاتیان دەدەن، لەوەش گرنگتر دەسەلاتی رەخنەییو کارامەیی ئەو ناوەندە ئازادانەی راگەیاندنە، هاوکات لەهەموی گرنگتر چۆنێتی دروستکردنی فشارە لەسەر دەسەلاتو حوکمەتو ناوەندەکانیان، ئایا هاولاتیان چۆن دەتوانن فشار دروستبکەن، چ شێوازێك بەکاردەهێنن بۆ ناچارکردنی حوکمەتو دامودەزگاکانی، دواجار ناچاریان دەکەن چارەسەری کێشەکانیان بکەن؟ هاوکات دەبێت میدیای ئازاد کۆمەلە میکانیزمێکی مۆدێرن بەکاربهێنێت بۆ بڕینی دیوارە قورقوشمییەکانی دەسەلاتو کردنەوەی دەرگا داخراوەکانو ناوەندە کۆنکرێتییەکانی بەرپرسەکان. نابێت میدیای ئازاد تەنها ناوەندێك بێت بۆ بلاوکردنەوەو پیشاندانو پێشکەشکردن، واتە تەنها نمایشگەیەکی هەرزازانفرۆش بێت، هاوکات

دەبێت ببێتە ناوەندێکی گەورە بۆ کۆکردنەوەی روانینە جیاوازەکانو هێزە جیاوازەکانی دەرەوەی دەسەڵاتو پردێکی پەیوەندی رەخنەئامێز لەنێوان ئەوانو دەسەڵاتدا دروستبکات، دواتر دەبێت پەیامێك بێت لەهاوڵاتییەوە بۆ هاوڵاتی، دەرخەری تواناو بیرکردنەوە جیاوازەکان بێت بۆ دروستکردنی گفتوگۆو بەرپرسیارێتی. بەڵام بەبێ سەروەری یاساو دەسەڵاتی سەربەخۆی دادگاو دادوەری گشتی پۆسەیەکی قورسو گرانی لەپێشدایە.

2-گروپی فشار: لە هەموو کۆمەڵگایەکدا گروپی جیاجیا هەیە. گروپی فەرهەنگیو سیاسیو کۆمەڵایەتیو کولتوریو رۆشنبیریو ئابوریو خزمەتگوزاریو...تاد، بەڵام چۆن هەموو ئەم جۆرە گروپانە پێویستیەکی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیین بەهەمان شێوە گروپەکانی فشاریش یەکێکن لەپێویستیە هەرە گرنگەکانی کۆمەڵگا بۆ هاوڵاتیانو تاکەکەس، کەواتە گروپی فشار چییە؟ هاوڵاتیان بۆئەوەی سەرزەمینێکی لەبار بڕەخسێنن بۆ کۆکردنەوەی رەخنەو نارەزاییەکانیان دەبێت خۆیان لەرێکخەرێکی کاتی(نا دامەزراوەییدا) یان دامەزراوەییدا رێکبخەن بۆ کۆکردنەوەی دەنگە نارەزاکان یان رەخنەییەکانو فشار لەسەر حکومەتو دامەزراوەکانی دروستبکەن، جاری واهەیە رۆژنامەیەك دەبێتە گروپێکی فشار، هاوکات رێکخراوێکی ناحکومی دەتوانێت ببێتە گروپی فشار، گروپێکی فەرهەنگی یان رۆشنبیری دەتوانن ببنە گروپی فشار، رۆشنبیرانو هونەرمەندانو پیشەوەرانو سەندیکاکانو دەستەو گروپە فەرهەنگیو ئابورییەکانیش دەتوانن ببنە گروپەکانی فشار.

لەراستیدا ئەگەر ئەم گروپانە بەشێوەیەکی مۆدێرن رێکخرابن‌و بەئاگابن لەداواکاری‌و پێویستییەکانیان. جائیتر ئەم داواکاریانە داواکاری هاولاتیان بێت بەگشتی یان چین‌و توێژێکی تایبەت بێت گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە تۆ بزانیت داوای چی دەکەیت‌و داکۆکی لەچی دەکەیت‌و رەخنە لەچی دەگریت‌و چ چارەسەرێك‌و پێشنیارێکت پێیە. ئەم گروپانە دەتوانن بەشێوەی کۆکردنەوەی ئیمزا، یان بلاوکردنەوەی پۆستەر‌و بەیاننامە، یان لەرێی بەرزکردنەوەی یاداشت‌و نارەزاییینامە بۆ حکومەت‌و دەسەلات، یان لەرێی رێپێوانی هێمنانە یان لەرێی کاری هونەرییەوە یان لەرێیی شێوازە جیاجیاکانی خۆپیشاندان‌و مانگرتنەوە فشار دروستبکەن. ئەم گروپانە ئەگەر بەشێوەیەکی تەندروست‌و مۆدێرن رێکخرابن ئەوا دەتوانن حکومەت‌و ناوەندە بەرپرسەکان ناچاربکەن کە گوێیان لێبگرن‌و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، ئەگەرنا ئەو گروپانە دەتوانن شێوازی جیاجیای دیموکراسی بگرنەبەر، وەك مانگرتن‌و رێپێوانی هێمنانەو وەستاندنی کار، هەلمەتی داکۆکیکردن‌و بەرزکردنەوەی داوای یاسایی...تاد.

3-<u>رێکخراوە مەدەنیەکان یان ناحکومیەکان:</u> رێکخراوە مەدەنییەکان چین؟ ئەو رێکخراوە ناحکومی‌و ناحیزبیانەن کە پێکهاتوون لەکۆمەلە ئەندامێك بۆ داکۆکیکردن لەمەسەلەیەکی دیاریکراو یان چەند بابەتێکی دیاریکراو یان پرۆژەی دیاریکراویان هەیە بۆ پێشخستنی کۆمەلگاو هۆشیارکردنەوەی هاولاتیان‌و گەشەپێدانی فەرهەنگی یان سیاسی یان ئابوری یان کۆمەلایەتی، هەروەها رێکخراویش هەیە دەبێتە پردی پەیوەندی لەنێوان

هاوڵاتیان‌و حکومەتدا، هاوکات لەسەر کۆکردنەوەی رایگشتی کاردەکەن‌و فشار دروستدەکەن. بەگشتی رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵ رێکخراوێکی خۆبەخش‌و کاراو ئەکتیڤن‌و موچەخۆرو بێدەنگ نین، دەبێت چاودێربن بەسەر دەسەڵات‌و پەرلەمان‌و حکومەتەوە، هاوکات دەبێت هێزگەلێکی ئامادەو کارا بن بۆ داکۆکیکردن لەهاوڵاتیان‌و گۆڕینی یاساو روبەڕوبونەوەی ناعەدالەتی‌و گەندەڵی‌و پێشێلکردنی مافی مرۆڤو کەمتەرخەمی دەسەڵات‌و ستەمکاری‌و بەشێوازی ئاشتیخوازانەو ناتوندوتیژانەو مەدەنیانە.

لەراستیدا هاوڵاتیان لەرێی ئەو سێ کەناڵەوە مافە بنچینەییەکانی خۆیان دەناسن‌و دەزانن پێویستی‌و داواکارییەکانیان چییەو چۆن داکۆکی لەسەردەکەن، بەڵام ئەو کەناڵانە، واتە گروپەکانی فشارو میدیای ئازادو رێکخراوە مەدەنییەکان دەتوانن هاوڵاتیان هۆشیاربکەنەوەو کار لەسەر رێکخستنی خۆیان بکەن لەرێکخەرێکی جیاوازو کارادا بۆ داواکردنی مافەکانیان‌و دروستکردنی پردێکی پەیوەندی مۆدێرن‌و رەخنەیی لەنێوان هاوڵاتیان‌و حکومەتدا.

یەکێك لەمافە هەرە سەرەتاییەکانی هاوڵاتیان بریتییە لەئازادی رادەربڕین، بەواتایەك هەموو مرۆڤێك لەکۆمەڵگەدا ئازادە لەوەی راوبۆچون‌و گوزارشتەکانی خۆی دەربارەی هەر بابەت‌و بڕیارو گۆڕانکارییەك دەربڕێت، هاوکات ئازادە لەداواکردنی ماف‌و داواکاری‌و پێداویستییەکانی خۆی‌و هاوەڵانی لەرێی کەناڵە

جیاجیاکانـەوە، ئـەو کەنالآنـەش کـە هاولآتیـان دەتـوانن بـەبێ هـیچ سانـسۆرو چـاودێرییەك لەڕێیانـەوە ڕای خۆیـان بـەئازادی دەربـبڕن، بـریتین لەکەناڵـەکانی ڕایگـشتیو سـەنتەرەکانی ڕاپرسـی ئـازاد، یـان میـدیای ئـازادو کەناڵـە جیاجیاکـانی، هـەروەها گروپـەکانی فـشارو نێوەنـدەکانی گفتوگـۆ، کـە ئەمانـە هـەموی سـەرەتایەکی باشـن بـۆ گەشـــەپێدانی دیموکراســـیو کۆمەلگـــەی مـــەدەنیو دروســـتکردنی پردێکی پەیوەندی ڕەخنـەئامێزو گفتوگۆئـامێز لـەنێوان هاولآتیـانو دەسـەلآتدا، لـەنێوان هاولآتیـانو سـەرلەبەری دامودەزگـاو وەزارەتو ناوەندە خزمەتگوزاریو مەدەنییەکاندا.

# جەهلی مۆدێرن

" کۆمەڵگەی نادیموکراسیو خێڵەکیو حیزبکوێر بریتییە
لەکۆمەڵگەی شەڕی حیزبە وەك یەکەکان، شەڕی ئەو
هێزانەی کە تەنیا قازانجی تەسكو کورتبڕی دەسەلاتو
ئابوری لەیەکیان جیادەکاتەوە."بەختیار عەلی

دنیای مۆدێرن دنیایەکە لەدەرەوەی خەیاڵدانی نەوەکانی پێشوو، خەیالگەیەکە بەسەر روانینە جیاوازەکاندا دابەشدەبێتو مەودایەکی دیکەی بەرفراوانی گفتوگۆو تێگەیشتنە، دنیای پاش حیکایەتە گەورەکانەو دنیای جیهانبینیو خولیا جیاوازەکانە، کلێشەیەکی دیکەی ژیانە بۆ دورخستنەوەی مێژوو، هاوکات دنیای گۆڕانکاریو گەشەپێدانو سازکردنی کلێشەیەکی دیکەی روانینو دنیابینییە، بەلاّم دنیای نەوەکانی پێشوو دنیای پڕ لەموقەدەساتی بەتاڵو پڕ لەرەمزی دوبارەو پڕ لەبۆنەو موناسەبەی هەلاهەلاو پڕ لەکۆلاجی نەتەوە-ئایدۆلۆژیا، دنیایەکی داخراوە، بەواتایەك خەیالگەیەکی بازنەیی دیاریکراوەو تاکەیەك رەهەندی بیرکردنەوەو

تاکەیەك راڤەکردن بۆ دنیاو خولیای ئیرادەیەکە دوبارە، خولیای کۆمەڵگەیەکە لەناو کۆمەڵێك موقەدەساتی بەتاڵدا غەرقی جەهل و دوبارەبونەوەو خۆشاردنەوە بووە.

کەواتە دنیای بەتاڵ چییە؟ دنیای بەتاڵ دنیایەکی داخراوە، دنیایەکە ژیان تیایدا سنوری شارێك و گەرەکێك و کۆڵانێکی بێدەروازەو بێکۆتاییە لەداخرانی زیاترو قۆزاخەسازی فەرهەنگ و تاڵانکردی شارستانی و بێبایەخکردنی دنیابینییە جیاوازەکان، لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئەم دنیا داخراوە فەرهەنگییە پڕە لەموقەدەسات و دنیای شتە پیرۆزەکان و پڕە لەرەمزو بەها نەریتی و ئەخلاقی و سیاسی و ئاینی و کولتورییە هاوشێوەکان، بەلاّم ئەگەر بڕوانینە کۆی ئەو ستراکچەرەی کە بیرکردنەوەو هزری ئەو دنیا داخراوە کلێشە دەکات، ئەوا سەرلەبەری ئەو جومگانەت بۆ دەدۆزرێتەوە کە ئەو دنیا دۆگمایە لەکلێشەسازییەکی وەهمیدا گرفتاری دوبارەبونەوەیە، دنیای دوبارە دنیایەکە پڕە لەموقەدەسات و دنیای شتە پیرۆزەکان و رەمزەکان، لەراستیدا بەتاڵە لەموقەدەساتی نوێ و لەرەمزی مۆدێرن و بەهای نوێ، ئەوەی بەردەوام لەدوبارەبونەوەکانەوە دەخولقێ بەتاڵە لەهەر روانینێکی جیاواز بۆ جیهانبینی و بینینی دەرەوەی ئیرادەی سەرتاپاگیر، واتە دەرەنجامی دوبارەبونەوە گەڕانەوەیە بۆ خاڵی دەستپێکردن و وتنەوەی هەمان ئەو دەستەواژانەی کە بەر لەئێستا وتران و کراون و دوبارەی دەکرێنەوە.

دنیای کۆنکرێتی کۆمەڵگە داخراوەکان دەرەنجامی ئەو پەیوەندییە داخراو و دۆگمایانەیە کە لەبازنەیەکی بچوکدا سەرلەبەری ئەوەی لەلای نەوەکانی پێشوو موقەدەسەو رەمزو

بەهایە جارێکی دیکە هەرزان فرۆشدەکرێت، بەواتایەك پانتاییەکە بۆ غەرفکردنی هەموو گۆرانکاریو خەیاڵێکی نوێو روانینێکی دیکە لەدەریایەکدا کە پڕە لەدوبارەبونەوەی بەتاڵو کۆپیکراوی هاومانا و هاوواتا.

## دەسەڵاتی بەتاڵ

ئەو دەسەڵاتە داخراوانەی دنیا کە زادەی نادنیابینییەکانی کۆمەڵگە داخراوەکانە، دەسەڵاتێکە بەتاڵە لەهەر گۆڕانکاریەكو وەرچەرخانێکی مۆدێرن، بەڵام پڕە لەدوبارەکردنەوەی خۆیو دۆگماکردنی ژیان، دەسەڵاتێکە پڕە لەموقەدەساتی ساختە، بەڵام بەتاڵە لەهەر روانینێك لەدەرەوەی دنیای داخراوی لۆکاڵەیتو زادگەخوازیو نەتەوەپەرستیو تایەفەخوازیو مەزهەبخوازی، واتە لێوانلێوە لەو جەهلە، دەسەڵاتێکە دەکەوێتە نێو کلێشەسازییەکی یەکپارچەوە، بەواتایەك دەبێتە ماشێنێکی بچوك بۆ بەرهەمهێنانەوەی خۆیو داگیرکردنی پانتاییەکانی دەرەوەی خۆی.

ئەو دەسەڵاتە بۆئەوەی بەردەوام هەستی بەتاڵبونەوە لەخۆیدا بکوژێت، بەردەوام لەهەوڵی گێڕانەوەی حیکایەتەکانو دۆزینەوەی فیگەرە پیرۆزەکانە بۆ هێشتنەوەی هەموان لەحیکایەتێکی گەورەی هاوبەشدا، ئەو بۆئەوەی لەتاکەیەك حیکایەتدا تەواو نەبێت، بەردەوام لەهەوڵی بەرهەمهێنانی حیکایەتی بچوکدایە، ئەو دەسەڵاتەی پڕە لەموقەدەساتو بەتاڵە لەدنیای مۆدێرن، دەسەڵاتێکی هەمەجیو دۆگمایە، ئەو دەسەڵاتەی کە ناتوانێت خۆی فڕێبداتە نێو خولیاکانی مرۆڤەوەو کلێشەیەکی نوێ بۆ بایەخدان بەمرۆڤ بەرهەمبهێنێت، دەسەڵاتێکە تەنها

بۆ حیکایەتەکانی خۆی دەژیو دەبێتە ماشێنێکی گەورەی بەرهەمهێنانی دۆگمایی‌و ناعەدالەتی‌و خۆدوبارەکردنەوەو سازکردنی ستەمخانەیەکی فەرهەنگی‌و ئابوری‌و سیاسی‌و رۆشنبیری.

## جەهل و دەسەڵات

ئەگەر جەهل ئەو سەرزەمینە بێباکییەی بێهودەیی بێت لەدەرەوەی حیکایەتەکان، ئەوا کەمێك شاعیرانەترە وەك میلان کۆندێرا لەرۆمانی جەهلدا وێنەی دەکێشێ، جەهلێکە لەدەرەوەی حیکایەتەکان، بەلاّم لێرەدا ئێمە باس لەو جەهلە ناکەین، بەڵکە باس لەو جەهلە کلاسیکییە دەکەین کە زادەی حیکایەتەکان‌و خولقاوی دەستی دەسەلاّتێکی رەهاگەرانەو هەمەجیانەی خەیاڵدانێکە بۆ داگیرکردنی ژیان.

جەهل بەبێ حیکایەتی گەورەو یاداشتنامەی نەوەکانی پێشوو نابێتە جەهل، دەسەلاّتی جەهل دەسەلاّتێکە جەهلێکی گەورەی هەیە بەرامبەر ژیانی مۆدێرن‌و دنیابینی جیاوازو گۆڕانکاری‌و خەیاڵ‌و خولیای کرانەوە، دەسەلاّتێکە دەیەوێت رازیمانبکات بە حیکایەتەکانی‌و لەسەرزەمینە بەتاڵەکانی خۆیدا پڕمانبکاتەوە لەموقەدەسات‌و رەمزی ساختەو بەهای بەتاڵ‌و ئەخلاقیاتی بێباکی‌و ئەو دەیەوێت لەزەمهەریرە بەباچوەکانی خۆیدا غەرقی جەهلێکمان بکات تا روانین‌و خەونەکانی دەرەوەی خۆی زیاترو زیاتر کاڵببنەوە، لەکۆتایدا ئەو جەهلە لێوانلێو دەبێت لەعیشوەی بچوکردنەوەی خەیاڵ‌و خەون‌و خولیاکانی مرۆڤ.

دنیابینییەکانی جەهل کۆمەڵێك دنیابینی سنوردارن‌و مەودای حیکایەت‌و موقەدەس‌و رەمزە بەتاڵەکان تێناپەڕێنن، ئەو کە تامەزرۆی بەتاڵکردنەوەی ژیانە لەهەر ماناو بەهایەکی مۆدێرن‌و مرۆڤگەرانە، هاوکات بێئەندازە تامەزرۆی پەخشکردنی جەهل‌و نەریتی بیرکردنەوەیەکە لێوانلێو لەبچوکی، ئەو دەسەڵاتە تاکەیەك ستراتیژی هەیە کە جەهلە، دەسەڵاتێکە سادیستە، بۆ بچوکردنەوەی ژیان لەخولیاکانی خۆیدا، بۆ بچوکردنەوەی خەون لەسەرزەمینە بەتاڵەکەی خۆیدا، تامەزرۆی دابەشکردنی رەمزو بەها رزیوەکانە بەسەر تەواوی مرۆڤەکاندا.

ئێمە لەزۆر شوێندا باسمان لەمۆنۆپۆلیزەکردن‌و داگیرکردنی پانتاییە سیاسی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتییەکان کردوە لەلایەن دەسەڵاتە داخراوەکانەوە، لێرەدا تەنها بەخێرایی ئاماژە بەوە دەدەین، بەرهەمی ئەو جەهلەی کە دەسەڵاتە داخراوەکان تیایدا دەژین‌و سەرلەبەری ژیان‌و خەونەکان داگیردەکەن‌و دنیایەك وەزارەتی بەتاڵ‌و پەرلەمانتاری تەمەڵ‌و بەڕێوبەری سەلەفی دروستدەکات، ئەو دەسەڵاتە دەبێتە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ بەرهەمهێنانی ناعەدالەتی‌و غەرفکردنی جیاوازییەکان لەیەکەیەکی دۆگمایی خولیاکانی خۆیدا. ئەو دەسەڵاتە تەنها لەحیکایەتەکاندا دەژی‌و بەردەوام لەدوبارەکردنەوەی خۆی‌و موقەدەساتەکانیدا دەسوڕێتەوە، دەسەڵاتێکە سیخناخە لەجەهلاو لێوانلێوە لەساختەکاری‌و ناعەدالەتی، بەڵام بەتاڵە لەدنیابینی‌و قبولکدنی ئەوی دی‌و خەون‌و خولیای مۆدێرن.

هاوكات دەسەلاتی جاهل لەرووی سیاسیو فەرهەنگییەوە ئەو دەسەلاتەیە كە: گرنگی نادات بەڕایگشتی، بەمرۆڤ، جیاوازیو دنیابینییەكانی ئەویدی، تامەزرۆی هەرێمخوازیو تایەفەخوازیو عەشرەتخوازیو میلیشیاخوازییە، دەسەلاتێكە راوێژكارو پسپۆرە بێئیشەكانی دەیان ئەوەندەی پەرلەمانتارو وەزیرەكانێتی، ولات پڕ دەكات لەسەدان دیكتاتۆری بچوك وەك بەڕێوبەری نەخوێنەوار، پەرلەمانتاری بێدەنگ، مەلاو خوتبەبێژی حیزبی، شاعیری دەربار، زورناژەنی حیزبی، نوسەری ئیفلیج، رۆژنامەی سەربازی، تەلەفیزیۆنو رادیۆی درۆزنو پەخشكاری وەهمو بەلێنی ساختە، دەسەلاتێكە ولات پڕدەكات لەبۆنەو موناسەبەو فیستیڤالی ساختە، باوەڕی بە رێپێوانو نارەزایی نیە، بۆی بكرێت لیژنەی ئیعدام بۆ هەموو هاولاتییەكی نارەزا دەردەكات، دەسەلاتێكە بەردەوام خوازیاری خۆدەولەمەندكردنو بازرگانیكردنە بەهەموو شتێكەوە، بەرپرسەكانی ساتێك دەبن بە جەنەرالو ساتێك بە زەنگینترین پیاوی دنیا ساتێك بە جاهیلترین پیاوی دنیاو ساتێك بە مەلا، بە مامۆستا بە رۆشنبیرو ساتێك بەتاجرو وەرزشەوانو كاپتنو ساتێك بە هارونە رەشید.

## حكومەتی فاشل

حكومەتە نادیموكراتیەكانی دنیا سەدەرسەد لەڕووی كردارییەوە حكومەتگەلێكی فاشلو نابەرپرسیارن، ئەو حكومەتەی بەرپرسیارنەبێت بەرامبەر داواكاریو مەینەتییەكانی هاولاتیان

حکومەتێکـــە تاسەرئێـــسك بێئاگایـــە بەرامبـــەر خـــودی ژیـــانو گۆڕانکاریو ئەو پێشکەوتنو پێشهاتە سیاسیو ئـابوریو کولتـوریو کۆمەڵایەتیانەی کە راستەوخۆ یـان ناڕاستەوخۆ کاریگـەرییان هەیـە بەسەر کۆمەڵگەو دەسەڵاتو هاوڵاتیانەوە.

## حکومەتو بەرەڵایی

حکومەتـــە نادیموکراتییـــەکان لـــەڕووی کرداریـــیـەوە پێیانوایـــە دیموکراسـیو ژیـانی مـەدەنی واتـە بـەرەڵایی بـازاڕو بازرگـانیکردنێکی هەمەجیانـە بەسـەر هاوڵاتیـانو داهـاتی مـادیو مەعنـەوی کۆمەڵگـە. بۆنمونـە ئـەو جـۆرە حکومەتانـەی کـە ئاسـان نیـە دەسـەڵاتی حیـزبو میلیشیاو پەرلەمان لەیەکتری جیابکیتەوە، روانینو دنیابینیشیان هێنـدە بچوکە کە لەئاست داواکاریو داخـوازیو بەرپرسیارێتیدا نیـە، لەلایـەك ئـەوان پێیانوایـە گرانـیو بەرزبونـەوەی نرخـی شـتومەك لەبازاڕەکانـدا پەیوەستە بە دیاردەی بازاڕی ئازادەوە کە هیچی لەبارەوە نازاننو جاهلین بەرامبەر هەر دیاردەیـەکی نـوێی دنیـای مـۆدێرن، بـەڵام ئـەم تێڕوانینـە سـەقەتە تـەواو پێـچەوانەی هـەموو بنەمایـەکی زانـستیو ئـابوریو سیاسیە(لەڕاستیدا بەقاڵەکانو کاسپکاران زۆر لەحکومەت زیـرەکترن لـەو بارەیـەوە، لەبەرئـەوەی حکومەتـە نادیموکراتـەکان خـاوەنی دەیـان موستەشاری بێئیشو وەزیرو پەرلەمانتاری تەمـەڵنو خـاوەنی تاکەیـەك لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەی ئـەکادیمی نـین بـۆ هـەر گـۆڕانو پێـشهاتو دیاردەیەك لەناو کۆمەڵگەدا)، لەڕاستیدا بازاڕی ئازاد بەو مانایـە نیـە کـە هەرکەسەو بۆخۆی بەیاسایەکی جەنگەڵی یاری بەبازار بکات، واتە بازاڕی

ئـــازاد بـــەڕەڵایی‌و ئیـــستیغلالکردن‌و نابەرپرســـیارێتی حکومـــەت‌و دامودەزگاکـانی ناگەیـەنێت، هاوکـات ناکرێـت ئـەوەش لەیادبکـەین کـە حکومـــەت ئـــەو حکومەتەیـــە کـــە لەتوانایدایـــە ژیـــانی هاوڵاتیـــان دەوڵەمەنـدبکات، نـەوەك سـەرقاڵی خۆدەوڵەمەنـدکردن‌و زەنگینکردنـی بەرپرسـە حیزبییـەکانی بێـت بەتـەنهاو سـەرقاڵی رازاندنـەوەی خۆیـان‌و بازرگـــانیکردن بـــن‌و لەهـــەوڵی خۆدوورخـــستنەوەدا بـــن لەهـــەر بەرپرسیارێتییەکی کاراو کاریگەر.

لەکاتێکدا داهاتی مانگانەو ساڵانەی تاکەکەس بەرامبەر بەرزبونەوەی نرخـی شـتومەك‌و کاڵاکـان نیـەو هاوکـات دەیـان هێنـدەی ئاستی خراپـی بـژێوی هاوڵاتیانـە، بۆنمونـە ئـەو یاسـا جەنگەڵییـەی بـازاڕ لەکوردسـتاندا هەیە، یاسایەکە بێگومـان دەیـان بەڵگـە لەپـشتییەوە هەیـە کـە حکومـەت خـۆی لێئەدزێتـەوەو بەکێشەی هاوڵاتیـانی دەزانێـت نـەوەك بـە کێـشەی یەکەمی خۆی.

حکومەتـە نـادیموکرات‌و نابەرپرسـەکان بـەردەوام لەهـەوڵی دوورخـستنەوەی کێـشەو ململانێکـانن لـەخۆیان، واتـە حکومـەت بۆئەوەی داواکارییەکانی تۆی هـاوڵاتی پەیوەسـت نـەکات بەخۆیـەوە، بـــەردەوام کێـــشەکانی تـــۆ پەیوەندیـــدار دەکـــات بـــەبازاڕەوە، یـــان دەیگەڕێنێتەوە بۆ دەسەڵاتێکی غـەیبانی نادیـارو نابەرجەستە، یـان دەیگەڕێنێتـــەوە بـــۆ دیاردەیـــەکی شارســـتانی کـــە هیـــچی لـــەبارەوە نازانێـت‌و غـەرقی جەهلێك بـووە بەرامبـەر هـەموو ئـەو دیـاردە نوێیانەی دنیا وەك بازاڕی ئازاد، ئەو حکومەتەی کـە چـەندین سـاڵە لەسەر گـومرگ‌و بازرگـانی‌و کۆکردنـەوەی بـاج دەژی، سـەرباری ئـەو

بودجه زۆرەی کە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆی دەردەچێت، تا ئەورۆکەش گومرگ و باجی زۆری خستۆتە سەر کالاکانو بەکرێدانی شوێنگە تایبەتییەکانی کرینو فرۆشی، لەراستیدا حکومەتی بەرپرس دەبێت ئەم رێگەچارانە بگرێتەبەر:

1/کۆنترۆڵکردنی بازارو بازرگانەکان.

2/کۆنترۆڵکردنی موچەی هاولاتیانو سرینەوەی ئەو ناعەدالەتییە ناشرینەی کە بەهیچ پێوەرێکی شارستانی پێوانە ناکرێت، بێجگە لەپێوەری جەنگەڵیو مشەخۆری کە لەکاتێکدا موچەی وەزیرێك (35)ئەوەندەی فەرمانبەرێکی ئاساییەو بەڕێوبەرێکی گشتی (12)ئەوەندەو هاوکات تەنها خوا ئەزانێت موچەو نەسریەو ئەو بەرەکەتە بەهەشتییەی کە بەرپرسە سیاسییەکان هەیانەو بازرگانیشی پێوەدەکەن، بەلام هاولاتیان هەر بێدەنگن، دەرەنجام ئەوانیش دەسکراوەترن لەناعەدالەتی.

3/دانانی سنورێك بۆئەو بەرلایی بازارەو پەشیمانبونەوەی حکومەت لەو قسەیەی خۆی کە ئەم جەنگەڵە بازاری ئازادە.

4/کۆنترۆڵکردنی گەندەڵی حیزبیو بەرپرسو وەزیرو کاروباری حکومی.

5/بەکارهێنانی سیستمی کۆمەڵی هەرەوەزیو سوپەرمارکێتی حکومیو داشکاندنی نرخ.

6/گرنگیدان بە سیتمی خودژیانیو بەربوومی خۆماڵی کە بەهۆی دامەزراندنی بێسەروبەری زۆرێك لەهاولاتیانو کردنی زوربەی خەڵکی گوندەکانو دەرەوەی شارە گەورەکان بە

موچەخۆر(وەك فەرمانبەرو پۆلیس‌و ئاسایش‌و ئەندامی حیزبی) کە بەتەواوەتی کاریکردۆتە سەر ئەو داهاتە نەتەوەییەی کە لەڕێی بەربومی کشتوکاڵییەوە هاوسەنگییەکی باش دروستدەکات لەنێوان بەربوومی خۆماڵی‌و هاوردەکاندا، لەبەرئەوەی هیچ مەعقول نیە تەماتە لەمیسرو سوریاوە بۆ ئێمە بێت لەکاتێکدا زەویزارەکانی خۆمان وەك هەمو ناوچەکانی دنیا بەپیتوبەرەکەتن. ناکرێت ئەو راستییەش لەیادبکەین کە چەند پۆلیس‌و ئاسایش‌و مامۆستاو فەرمانبەر گرنگن بۆ وڵات هێندەش جوتیارێك گرنگە، بەڵام ئەم حەقیقەتە سادەیە هیچ بەرپرسێکی حیزبی‌و حکومی بە سەرۆکی حکومەت‌و وەزیرەکانیشەوە هیچی لەبارەوە نازانن.

## دەسەڵاتی فاشل

ئێمە لێرەدا باس لەهیچ حکومەتێکی دیاریکراو ناکەین.

لەڕاستیدا ئەو حکومەتەی کە هیچ بەرنامەیەکی زانستی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتی مۆدێرنی نەبێت بو بەڕیوەبردنی وڵات، بێجگە لەتەمەڵخانەیەکی گەورە هیچی تر نیەو لەجەهلێکی بێوێنەدا دەژی. ئەو حکومەتەی دوردەکەوێتەوە لەبەرپرسیارێتی‌و گرنگیدان بە هاوڵاتیان‌و کۆنترۆڵکردنی بازاڕو داهاتی شاهانەی مەسئولەکان‌و دەیان کێشەو گرفتی نیشتەجێبون‌و نزمبونەوەی ئاستی بژێوی ژیان‌و گوزەران حکومەتێکە تاسەرئێسك غەرقی جەهل‌و فەشەل‌و بێئاگایی بووە. بێگومان هەر حکومەتێك ئەو تایبەتمەندییە ناشرین‌و ناعادیلانەی تیادا بوو حکومەتێکی فاشلە.

لەراستدا دیموكراسی تەنها ڕێدان نیە بەئازادی بیروڕاو ڕێپێوانو بەرزكردنەوەی ناڕەزاییو قەدەری گوێگرتن یا گوێنەگرتنی حكومەتو پشتگوێخستنی داواكارییەكان، بەڵكە ئەلفوبێكانی ژیانی دیموكراسیو مەدەنی بایەخدانی حكومەتە بە رایگشتیو ناڕەزاییەكانو بەدواداچونو چارەسەركردنی بە پەلەی كێشەو گرفتەكانی هاولاتی نەوەك چاوەڕوانیو خۆدزینەوەو نابەرپرسیارێتی.

دیموكراسیو ژیانی مەدەنی هاولاتیان وەستاوە لەسەر دابینكردنی مافەكانیانو وەلامدانەوەی داواكاریو داخوازییەكانیان، لەبەرئەوە دیموكراسیو ژیانێكی نوێی مەدەنی تەنها دروشمو لافتە هەلواسینو هوتافكێشانی تەلەفزیۆنەكانو كۆڕكۆبوونەوە نیە بە عەشایرو رازاندنەوەی سفرە بۆیانو دروستكردنی بێدەنگی. هاوكات پاوانكردنی دەسەلاتو داخستنی سەرجەم دەروازەكانی گفتوگۆو دیالۆگ بەسەر هاولاتیانداو گوێنەگرتنو وەلامنەدانەوەی داواكانیان نیە.

# ناشرینکردنی ژبان

# بەناوی دیموکراسیەتەوە

"لەبەرئەوەی دەسەلأت لەحەقیقەت دەترسێت، هەربۆیە
دەبێت سەرکوتی بکات" هیوبرت دریفۆس/پل رابینۆ

کاتێك دەسەلأتی رەهای حیزب یان گروپێکی سیاسی جاهیل بە دیموکراسیو دنیای مۆدێرن دەبێتە دەسەلأتێکی سەروەرو بێقسە بەسەر حکومەتو پەرلەمانو سەرلەبەری دامەزراوەکانو ناوەندەکان، ئەوکاتە قسەکردن لەسەر دیموکراسیو ژیانی مۆدێرنو کرانەوە بەرووی دنیادا بێگومان دەبێتە درۆیەکی گەورەو هێندەی قسەکردنە لەسەر دیکتاتۆریی هێندە قسەکردن نیە لەسەر روانینێکی کراوە بۆ دنیا.

لەکۆمەلگە نادیمکراسییەکاندا هەزاران رۆژنامەنوس دەبن بە عەریزەنوسی حیزبو دەبن بە هوتافکێشی گەندەلیو کار لەسەر جوانکردنی ناعەدالەتیو گەندەلی دەکەن، دەیان شاعیر دەبنە واعیزو خوتبەبێژی دەسەلأت، سەدان بەناو رۆشنبیر دەبنە پێنوسی حیکایەتە بێماناکانو سەرگوزشتەی پالەوانە کارتۆنییەکان، لەو

کۆمەڵگەیەدا سەدان مزگەوتو بارەگای حیزب دروست دەکرێن وەك موجامەلە لەبری دەزگای رۆشنبیریی سەربەخۆو گەلەری هونەریو گەشەپێدانی زانکۆکان.

کۆمەڵگەی دیموکراسی ئەو کۆمەڵگایە نیە کە کۆمەڵێك حیزبو دەزگا لەهەناوی خۆیداو لەژێر یەك سەقفدا کۆدەکاتەوە، بەڵکە ئەو کۆمەڵگایەیە کە حیزبەکانو دەزگاکانو رۆشنبیرەکانی دەتوانن رۆڵی راستەقینەی ئۆپوزسیۆن ببینِنو دەتوانن بەڕاستی دیدگایەکی تر بۆ بینینی کێشەکانو بینینی واقیع پەرەپێبدەن.[9]، لەراستیدا لەو کۆمەڵگایەنەدا دیموکراسیەت هەیە کە شتێك هەیە بەناوی هێزە جیاوازەکانو ئۆپۆزسیۆنو هەبونی دەزگاگەلێکی فەرهەنگیو رۆشنبیریی سەربەخۆ کە بە دنیابینییەکی جیاوازەوە دەڕواننە کۆی ئەو دنیا ئاڵۆزەی کە دەکوێتە نێوان کۆمەڵگەو دەسەڵاتو گۆڕانکاریو جیاوازییەکانەوە.

حسابنەکردن بۆ رایگشتیو رای جیاوازو داخستنو کۆنترۆڵکردنی سەرلەبەری سەرچاوە ئابورییەکان لەلایەن حیزبەوە یەکێکە لەئەخلاقە دیکتاتۆرییەکانو سەرکوتکردنێکی شارستانیو نابەرپرسانەیەو خەیاڵی ناشرینی مۆنۆپۆلیزەکردنو داگیرکاری لەپشتەوە ئامادەیە، لەڕاستیدا دیکتاتۆر هەر ئەو زاتە تۆقێنەرو بکوژە نیە کە دەمانکوژیو دەمانترسێنێتو بەندیخانەکانیمان لێپڕدەکات، ئەمە بۆخۆی روانینێکی کلاسیکیانەیە بۆ دیکتاتۆر، بەڵکە دیکتاتۆر دنیابینییەکە گەورەتر لەو دنیابینییە بچوکەی

---

[9] بەختیار عەلی، دیموکراسیەتی زۆرو دیموکراسیەتی کەم...ل23

کۆمەلگـە، دیکتاتۆرییـەت بەرلـەوەی سـیتمێکی حـوکمکردن بێـت، ئەخلاق و میکـانیزم و هێـزە، بەواتایـەك ئاکارەکـانی دیکتـاتۆر تـەواو پێچەوانەی ئـەو سیـستامە ئەخلاقییـە گەورەیەیـە کـە دیموکراسـی هـەلگرێتی، ئـەوە دیکتاتۆرەکـانن کـار لەسـەر کوشـتنی رایگـشتیو میدیای ئازادو گروپەکانی فشارو کۆمەلگەی مەدەنی دەکەن.

حیزبەکان بەرلەوەی ببنە دیکتـاتۆر بیـر لـەوە دەکەنـەوە چۆن ببنـە دیکتـاتۆر...سـەرەتا سـەرلەبەری سەرچـاوە ئـابوریو سیاسـییەکان داگیـرو مۆنۆپۆل دەکەن، دواتر تەواوی راگەیاندنو میدیاکانو سەرلەبەری دەزگـا رۆشــنبیریو فەرهەنگییــەکان داگیردەکــەنو دەیانخەنــە خزمــەتو سودبەخشی خۆیانەوەو دەیانکەنە زمانحالو راڤەکارو باسکاری خۆیـانو دەرخــەری هێــزو وێنــەکانی خۆیــان، ئــەوە میــدیاکانن پالەوانــە کارتۆنییـەکانمان بـۆ دەکـەن بـە پالـەوانێکی ئەفسانەییو بـە ژنـەرالێکی رۆمانــسیو بــە پیــاوکوژێکی بەهەشــتیو ئیمانــدارێکی خزمــەتکارو رۆشـنبیرێکی مـۆدێرنو هونەرمەنـدێکی بـێ وێنـە، ئـەوە رۆژنامـەکانن جەنگـەلت لێدەکـەن بـە باخـچەو شـەرگەکان بـە بەهەشـتو واقـع بـە خــەیالو گێرانــەوەی حیکایەتــەکانو فرۆشــتنەوەی موقەدەســات بــە نـرخێکی گران بە تۆو رازیکردنی تـۆ بـە وێنـەی ئـەو دنیایـەی کـە خـۆی نیگاری بۆ کێشاوە.

دیکتاتۆرەکـان بەرلـەوەی هاولاتیـان فرێبدەنـە نێـو بەندیخانەکانـەوە، ســەرەتا بــە برِیــارێکی دۆزەخیانــە ســەرجەم چــالاکییە مەدەنییــەکان مەحکومو قەدەغە دەکەن، هەر لەرێپێوانو خۆپیشاندانەوە تا مـانگرتنو رەخنــــەگرتنو نــــارەزایی دەربــــرِین لەرۆژنامــــەو میدیاکانــــەوە،

لەکۆمەڵگەیەکیشدا کە خەیاڵو فەنتازیای دیکتاتۆریەت تیایدا گەشەدەکات دەسەڵاتو بەرپرسیارێتی سیاسی تا قیامەت خۆیان بە بەرپرسو ئاغاو واریسی یەکەمی هێزو بەکارهێنانی دەسەڵات دەزانن.

ئەوە حکومەتە نادیموکراتەکانن بەرلەوەی ببنە دیکتاتۆر کار لەسەر بچووککردنەوەی ژیانو هزرو روانینەکان دەکەنو پڕۆژەیان بۆ کۆمەڵگە پڕ داگیرکردنی سەرلەبەری سەرچاوە ماددیو روحییەکانی کۆمەڵگەیەو داخستنی کۆمەڵگەو ئەو ئاستە ژیاریو فەرهەنگییەیە کە کۆمەڵگەی پیادا تێدەپەڕێت، دەرەنجام کار لەسەر خولقاندنی فەزایەکی جەهەنەمی دەکەن بۆ بچووککردنەوەی ئاستی شارستانیو فەرهەنگیو سیاسیو بچووککردنەوەی پڕۆژەو خەونو فەنتازیاکانی مرۆڤو بچووککردنەوەی خواستو ئارەزووەکانی مرۆڤ بۆ ئاستێکی نزمی بژێویو بیرکردنەوە لەگوزەرانو سادەگی.

ئەو دەسەڵاتانەی ستانداردێکی ئەخلاقیو بابەتیو زانستی باوەڕپێکراوی دیموکراسی نێو دنیای مۆدێرن ناکەنە مۆدێلێکی نوێ بۆ بەڕێوەبردنی حکومەتو جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانو سنوردانان بۆ دەسەڵاتی حیزبو گەڕانەوەی شکۆو بڕیار بۆ پەرلەمانو ڕێزگرتن لەرەخنەو نارەزاییو رای جیاوازی هاوڵاتیان بەگشتیو رۆشنبیران بەتایبەتی دەسەڵاتگەلێکی داخراون، واتە هێزگەلێکن بۆ داخرانی زیاترو پەنهانکردنی زیاترو شاردنەوەی ئەو عەقڵە کۆنزێرڤاتیڤو خەیاڵە دیکتاتۆریانە بە ڕوکەشی دیارو کلێشەسازی وەهمی.

ئالێرەوە قسەکردن لەسەر دیموکراسیو کۆمەڵگەی کراوەو مەدەنیو دنیای مۆدێرن لەلایەن دەسەڵاتەوە وەهمێکی گەورەیەو بانگەشەیەکی

بەتاڵـە، تـا دیکتاتۆرەکـان لەخۆمانـدا نـەکوژین نـاتوانین مۆدێرنانـە بیربکەینـەوە، تـا ئـەو خـەیاڵی داگیرکـاری‌و عەقڵـە فیوداڵـە لەخۆمانـدا نەکوژین مەحاڵە لـە مرۆڤایـەتی‌و رەخنـەو ئـارەزوو، خەونـەکانی مـرۆڤ تێبگەین‌و ئەو جیاوازیانە بخوێنینـەوە کـە دەکەوێتـە نێـوان دووڕای وەك یەکەوە. مـاکس فیبـەر پێمانـدەڵێت: "دەسـەلات بـە دوو ڕێگـە گەنـدەڵ دەبێت، یەکەمیان گۆڕینی دەسەلاتە بۆ رۆتین، ئـەوی دیکـەش گـۆڕینێتی بۆ دەسەلاتێکی ستەمکار"، لێـرەوە کـە بـاس لـە گەنـدەڵی دەکرێـت تـەنها بـاس لەگەنـدەڵی کـارگێڕی‌و دارایـی ناکرێـت، بەڵکـە بـاس لەلێـشاوێك گەندەڵی دەکەین کە سەرلەبەری دەسـەلات‌و حـوکمکردن‌و بـەڕێوەبردن‌و تـەواوی روانـین‌و کـردارو هـزری گەنـدەڵی حکومەتـە نادیموکراتـەکان‌و دیکتاتۆرەکان دەکەین، لەبەرئەوە گەندەڵی ماشێنێکی گەورەی کاولکردن‌و وێرانکردنـی ژیانـە لـەڕێی داگیرکردنـی رووبـەرێکی ژیـاری گـەورە بـە گەندەڵییـەکی سەرتاسـەری‌و سـازدانی پانتاییـەکی گـەورەی تـالانکردنی ژیـان، وەك گەنـدەڵی بـەڕێوەبردن‌و حـوکمکردن، گەنـدەڵی میـدیایی، حسابنەکردن بۆ میدیای ئازادو رەخنە، گەندەڵی رۆشنبیری‌و روناکبیری، گەندەڵی دارایی‌و خزمەتگوزاری‌و گەنـدەڵی لەخۆشـگوزەرانیدا، گەنـدەڵی ژیان، گەندەڵی دیموکراسـی‌و گلاربـونی حیکایەتـەکان، سـەرەنجام هـەموو ئـەم گەندەڵیانـە سەرچـاوەکەی رۆتـین‌و سـتەمکاری‌و ئـەخلاقیاتی دیکتاتۆرییـەو دەرەنجـام هـەموو دەسـەلاتێك دەتوانێـت لەرێگـەی ئـەم گەندەڵیانەوە ببێتە دەسەلاتێکی تا سەرئێسك دیکتاتۆرو ستەمکار.

کاتێك هاولاتیان نـاتوانن سـەرۆکی حکومـەت هەڵبـژێرن، کاتێـك رێیـان پێنادرێـت پێـشوەخت رای خۆیـان دەربـڕن لەسـەرئەوەی کـێ سـەرۆکی

حکومەت بێتو کێ جێگرەکەی بێتو کێ بن ئەوانەی کە دەبن بە وەزیرو بە ئەندام پەرلەمان، کاتێك حیزب لەڕێی لیستی داخراوی خۆیەوە مرۆڤگەلێکی حیزبی تاسەرئێك بێئاگا لەدیموکراسیو دنیای مۆدێرن، بەتاڵ لەهەر تێگەیشتنێکی سادە لەمەسەلەی هاوڵاتیبونو بەڕێوەبردنی حکومەتو تێگەیشتن لەوەی کە نابێت دەسەڵاتی موتڵەقی حیزبو مەکتەبی سیاسیو حکومەتو ئەنجومەنی وەزیرانو پەرلەمان تێکەڵ بکرێتو تەنهاو تەنها حیزب بەوپەڕی جەهلیەوە بە دیموکراسیو کۆمەڵگەی مەدەنی دەسەڵاتی موتڵەقی خۆی رۆبکاتە نێو تەواوی دامەزراوە حکومیو ناحکومییەکانەوەو بە روانینو دنیابینییە هەژارەکەی خۆیەوە تەفسیر بۆ هەموو شتێك بکاتو خۆی بە بیرکەرەوەو بڕیاردەرو سەروەر بزانێت.

## حکومەتی تۆخکردنەوەی ناعەدالەتی

حکومەتی بازرگانە درۆزنەکان، بازاڕێتی گەورەی حیزبەکانو بەرپرسەکانو کۆمپانیاکانیانو دەوڵەمەندە چاوچنۆکەکانە، حکومەتی بەنزینفرۆشەکانو هارونەرەشیدەکانو سەروەرییە کارتۆنییەکانو حیکایەتە دووبارەو کوشندەکانو حکومەتی فرۆشتنەوەی سەروەریەیە بە خەڵك، هەرزانفرۆشکردنی دیموکراسی، بەتاڵانبردنی ژیان، حکومەتی موستەشارە بێ ئیستیشارەکان، حکومەتی پەرلەمانتارە گوێڕایەڵو خەوتووەکانە، حکومەتی بێ پلانو بێئاگایی، حکومەتی وەزیرە زۆرەکانو بێئاگاییە گەورەکانە، حکومەتی موچەخۆرە بێئیشەکانو حکومەتی خولقێنەری

بەرەلایيەكى گەورەى فەرهەنگى‌و سياسى‌و ئابوريیە. سەرەنجام ئەو حكومەتانە دەبنە تەمەڵخانەيەكى گەورەو قومارخانەيەكى گەورەى ديموكراسى كە بە تەنها ديموكراسيەتى تيادا دەدۆڕێت.

كاتێك حكومەت خۆى ناكات بە ساحێبى هيچ شتێك ...كاتێك دەڵێين ئەم ولاتە خاوەنى حكومەتە، واتە خاوەنى سيستمێكە بۆ باشتركردنى ژيانى خەڵك، نەوەك خراپكردن‌و بێماناكردنى ژيان، ئەوە حكومەت‌و ناوەندە فەرمييەكانە كۆنترۆڵى بازاڕ دەكەن، نەوەك خولقاندنى بەرەلاخانەيەكى گەورەى نابازرگانى، نەوەك دروستكردنى جەنگەڵێكى بێ ساحێب لەبرى بازاڕێكى كۆنترۆڵكراو بە ياساو ڕێسايەكى دياريكراو، ئەم مۆدێلە دەگمەنەى حكومەت تەنها لەحكومەت ناچێت، لەبەرئەوەى زۆر بەسادەيى حكومەتى دروستكردنى ئەزمەى كارەباو ئاو و بەنزين‌و سوتەمەنى‌و ڕێگەوبان‌و ئەزمەى خزمەتگوزارييەكانە بۆ هاولاتى، حكومەتى بەرزكردنەوەى نرخى شتومەك‌و خولقاندنى بەرەلاييەكى گەورەيە بەناوى بازاڕى ئازادەوە، خوڵقاندنى وەلائێكى بێ مانا بۆ نيشتيمانێكى پڕ لەجەهلى سياسى‌و ئابورى‌و شارستانى‌و لێوانلێو لەوەهم‌و خۆشباوەڕى، بەرپاكردنى گەمژەييەكى گەورە بەناوى ديموكراسى‌و كۆمەڵگەى شارستانييەوە، دەوڵەمەندكردنى بازرگانە درۆزنەكانى ناو حيزب‌و گۆڕينى بەرپرسى سياسى بۆ بەرپرسى پارەكۆكەرەوە لەڕێى كۆمپانيای وەهمى‌و بازرگانيكردن بە ژيانى خەڵكەوە.

كاتێك حكومەت خۆى ناكات بە ساحێبى بەرزبونەوەى نرخى سوتەمەنى‌و كەمى كارەباو ئاو و بەرەلايى بازاڕو بەرزبونەوەى

نرخی مامەڵەی کەرەستەو هاتوچۆ، کاتێك خۆی ناکات بە ساحێبی ئەو هەموو کێشەو گرفتەی ناو کۆمەڵگە، هەر لەئەزمەی نیشتەجێبونەوە تا بەرزبونەوەی نرخی شتومەك‌و کەمی موچەو ئەو هەموو ناعەدالەتییەی کە لەموچەی فەرمانبەران‌و مامۆستا دەکرێت بەرامبەر ئەو موچە بەرزە بێمانایەی سەرۆکی حکومەت‌و جێگرەکەی‌و وەزیرو پەرلەمانتارەکان‌و بەرپرس‌و ئەندام‌و دۆستانی حیزب‌و ئەو هەموو پۆستە وەهمییەی لەم وڵاتەدا هەیە، ئەوا ئەو حکومەتە حکومەتێکی بێئاگاو عەقڵێکی دواکەوتوو، کۆنپارێزو نادنیابین دەیبات بەڕێوە، هاوکات حکومەتێکە خۆی‌و بەرپرسەکان‌و حیزبەکەی دەوڵەمەندەکات‌و هاوڵاتیان هەژارترو بێئیشترو بێهیواتر دەکات.

کاتێك حکومەت حساب بۆ رایگشتی‌و مرۆڤەکان ناکات، حساب بۆ رێپێوان‌و خۆپیشاندان‌و ناڕەزایی هاوڵاتیان ناکات، کاتێك حساب بۆ رەخنەو پێشنیارو مرۆڤەکان ناکات، ئەوا ئەو حکومەتە فڕی بەسەر دیموکراسییەت‌و ژیانی مۆدێرنەوە نیە، لەجەهلێکی گەورەدا دەژی، جاهیلە بە مرۆڤو دنیای مۆدێرنی گۆڕانکارییە گەورەکان‌و دیاردە نوێکان، تاسەرئێسك باوەڕی بە مەرگدۆستی‌و حیکایەتە بچوکەکان هەیە، حکومەتێکە هێندەی کاردەکات بۆ دەوڵەمەندکردنێکی خێرای خۆی‌و بەرپرس‌و حیزبەکەی هێندە کارناکات بۆ جوانترکردنی ژیان، هێندەی کاردەکات بۆ رازاندنەوەی جەهل‌و تاریکی هێندە پشتیوانی هیچ پێشنیارو رەخنەیەك ناکات، گوێگرێکی خراپەو قسەکەرێکی بێئاگایە. ئەمەش بەو خەیاڵدانە کاریزمییەدا

تێدەپەڕێت کە دەچێتەوە سەر فەنتازیاکانی ئەو دیکتاتۆرانەی کە لەسەرەتاوە دەیانەوێت تەواوی کۆمەڵگە کۆنترۆڵ بکەن‌و هەموو ئەو خەونانە بکوژن کە بەناوی جیاوازییەوە روانین‌و دنیابینییەکی دیکەیان هەیە.

سەدەی بیست‌و یەك، سەدەی کرانەوەو رۆشنکردنەوەی ژیانە بە خزمەتگوزاری‌و رێزگرتنی مرۆڤ، سەدەی دابینکردنی ژیان‌و گوزەرانی باشترە بۆ مرۆڤ، نەوەك سەدەی بەرپاکردنی ناعەدالەتییەکی بێ مانا. سەدەی دیموکراسیەت‌و جوانکردنی ژیانە، نەوەك سەدەی ناشرینکردنی ژیان بە گەندەڵی‌و خامۆشکردنی هەر روانین‌و بزاڤێکی ئۆپوزسیۆنی‌و خولقاندنی ناعەدالەتییەکی بێ ئەندازەی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری، سەدەی رەخنەگرتن‌و حسابکردنە بۆ مرۆڤ.

لەدنیادا ئەو حکومەت‌و حزب‌و بەرپرسانەی پێیانوایە دیموکراسیەت واتە ئێوە رەخنەبگرن‌و ئێمە گوێتان لێناگرین، ئێوە جوێنمان پێبدەن‌و ئێمە وەڵامتان نادەینەوە، ئەوە ئەوپەڕی گەمژەیی‌و جەهلە بە دیموکراسییەت. ئەو حکومەت‌و حیزبەی پێیوایە لەرێی دەسەڵات‌و جەبەروتی پۆلیس‌و ئاسایش‌و دەزگا تایبەتەکانیانەوە هاوڵاتیان بێدەنگ دەکەن، ئەوا ئاستی بیرکردنەوەیان لەئاستێکی زۆر نزم‌و مەرگدۆستیدایە، رەنگە لەرێی ئەم عەقڵیەتەوە ببنە دیکتاتۆر، بەڵام دیکتاتۆرێکی ناشیرینی سەردەمی نەمانی دیکتاتۆرەکان، دیکتاتۆرێکی بازرگان، دیکتاتۆرێکی بچوك‌و گرگن‌و بێ مەعریفەت.

لەڕاستیدا ئەو حکومەتەی کە هیچ بەرنامەیەکی زانستیو ئابووریو کۆمەڵایەتی مۆدێرنی نەبێت بو بەڕیوەبردنی وڵات، بێجگە لەتەمەڵخانەیەکی گەورە هیچی تر نیەو لەجەهلێکی بێوێنەدا ئەژی. ئەو حکومەتەی دووردەکەوێتەوە لەبەرپرسیارێتیو گرنگیدان بە هاوڵاتیانو کۆنترۆڵکردنی بازاڕو داهاتی شاهانەی مەسئولەکانو دەیان کێشەو گرفتی نیشتەجێبوونو نزمبوونەوەی ئاستی بژێوی ژیانو گوزەران حکومەتێکە بێئەندازە غەرقی جەهلو فەشەلو بێئاگایی بووە.

کاتێك هاوڵاتی دەکەوێتە پەراوێزی هەموو شتەکانەوە، کاتێك خزمەتگوزاری نەگەیشتۆتە خاڵی سفر، کاتێك خۆشگوزەرانی لەوڵاتێکدا بەقەدەر چرکەیەك ناعەدالەتی نیە، کاتێك سیستمی پەروەردەو زانست لەوڵاتێکدا لەجەهلێکی کوشندەدا غەرقی گەمژەییەکی گەورەبووە بەدنیای مۆدێرن، کاتێك ژیان بچوکدەبێتەوە بۆ کۆمەڵێك شەقامی سیاسیو کۆڵانی تەنگەبەری حیزبی، کاتێك سەرلەبەری میدیاکان بە ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفیزیۆنەوە دەبن بە پاشکۆو زمانحاڵێکی هەژاری حیزبەکان، کاتێك تەواوی دەزگا ڕۆشنبیرییەکان دەبن بە دیوەخانی حیزبو بەناو ڕۆشنبیرەکانیش دەبن بە فەرزەندە ترسنۆكو بێدەنگەکانی ئەو هەژارییە گەورەیەو بەردەوام سەرقاڵی کەرنەڤاڵی ساختەو فیستیڤاڵی بەتاڵن لەهەر بەهایەکی ڕۆشنبیری، کاتێك زەمەن دەبێتە زەمنی بێبایەخکردنی قسەکردنو ناشرینکردنی هەموو بەهایەکی ڕۆشنبیریو فەرهەنگیو ژیاری، ئەوکاتە هەزاران هەنگاو

نزیکدەبینەوە لەدیکتاتۆری‌و هێدی هێدی ژیان یەکسان دەکەینەوە بە سفرو خەیاڵەکانمان بچوکدەبێتەوەو خەونەکانیشمان بچوکتر. ئالێرەوە هەزاران هەلومەرجی شارستانی‌و ئابوری‌و سایکۆلۆژی‌و سیاسی‌و رۆشنبیری‌و فەرهەنگی دێنە کایەوە بۆ نائومێدکردن‌و بێهیواکردنی تەواوی کۆمەڵگە. هەموو ئەو هەلومەرجانەش دەبنە هێزی گەورەی راکێشان بۆ راکێشان‌و گۆێڕایەڵکردنی کۆمەڵگە بۆ هەر مژدەو بەڵێنێکی دوور یان وەهمی.

مەریوان وریای قانیع لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەو هەلومەرجانەش کە کۆمەڵگا توشی بێهیواییەکی گەورە دەکەن، مژدەی واقیعیانەیان تێدا نیە، لانیکەمی عەدالەتی کۆمەڵایەتی تیادا بزرە، رێگا خۆشکەرن بۆ دروستبوونی دیکتاتۆرێك کە مژدەی ساختەو هیوای ساختە لەو کۆمەگایانەدا بچێنێت. زۆرجار دیکتاتۆرەکان لەسەر بێهیوایی‌و نائومێدی خەڵك کاردەکەن. ئەمانە لەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتییە تایبەتەدا دێن بەناوی کۆتایهێنان بە نائارامی‌و پارچەپارچەیی‌و نادڵنیاییەوە دەدوێن.[10]

---

[10] مەریوان وریا قانیع، سەرەتایەك بۆ لێکدانەوەی دیاردەی دیکتاتۆریەت، گۆڤاری سەردەمی رەخنە،ل93-94 )

# مەرگدۆستی & ژیاندۆستی

## کۆمەڵێك پێشنیارو رەخنە بۆ دەسەڵاتداران

ئەم نوسینە پتر گوزارشتێکی میتافۆریی رەخنەگرانەیە، شێوازێکە بۆ سادەکردنەوەی رەخنەو پێشنیارو گفتوگۆ.

"رۆشنبیری رۆشنگەرو ئەقلانیو ئازادیخواز، ئەو کەسە نیە کە هزرە بەپیتەکان دەگۆڕێت کە دەربارەی رۆشنگەریو عەقڵو ئازادی بەرهەمهاتووە، بۆ تەنها زانیاریگەلێك کە وەك لەبەرکراوەکان بیڵێتەوە، بەڵکە ئەو پەیوەندییەکی رەخنەیی لەگەڵ خودی خۆیو هزرەکەیدا دادەمەزرێنێت، بەجۆرێك کە ئەوەی بۆ دەرەخسێت کە ئەوەی ئێستا لەسەری بەندە بیگۆڕێت، بەدەوڵەمەندکردنی چەمکەکانی دەربارەی ئازادیو ئەقلانیەتو رۆشنکردنەوە"[11]

## میتافۆرەکان

بۆئەوەی هیچ خەیاڵێکی شەڕانگێز زەفەرتان پێنەبات، بۆئەوەی هیچ دیکتاتۆرێکی بچوك لەخەیاڵتاندا خەون بە چەوسانەوەی

---

[11] علی حرب، اوهام النخبة او نقد المثقف، المركز الثقافي العربي، طبعة الثانية 1998، ل13

هاوڵاتی‌و حساب نەکردن بۆ رایگشتی‌و بێئاگایی لەمیدیای ئازادەوە نەبینێت، بۆئەوەی چیتر ئارەزوی براکوژی‌و شەڕ لەویژدانتاندا بکوژن، پێویستە هەموو شەوێك بەرلەوەی بخەون گوێ لەمۆیسقا بگرن، گوێگرتن لەهەر سەمفۆنیایەکی کلاسیك یا مۆدێرن، یان واباشترە گوێ لەمۆسیقای سلۆ بگرن، یەکێکە لەو دیاردە نوێیانەی نێو دنیای مۆدێرن‌و خەیاڵێکە زیاترو زیاتر نزیکتاندەکاتەوە لەخۆتان‌و روح‌و چێژوەرگرتن لەسروشت، من بۆخۆم لەو باوەڕەدام کە هەرگیزاوهەرگیز لەسەروەختی شەڕی ناوخۆو ئەو ململانێ ناشرینانەی کە لەنێوان هێزە حیزبی‌و میلیشیاییەکاندا بەرپادەبێت، خەونی شەڕانگێزی‌و چێژی مەرگی لەلا گەورەدەکردن گوێیان لەمۆسیقا نەگرتوە، بواری ئەوەیان نەبوو هەفتەی تەنها یەك سەعات گوێ لەشیعر بگرن"بەڵام من مەبەستم لەمۆسیقای جەنگ‌و شیعرەکانی مەرگ‌و ئایدۆلۆژیاو گێڕانەوەی حیکایەتەکانی جەنگ نیە"، هەڵبەت لەپشت هەموو شەڕێکی ناوخۆو هەموو چێژێکی سادییانەی مەرگەوە لەو ساتەوەختانەی کە سەرەتاکانی یەکتر قبوڵنەکردن‌و کاولکردنی ژیان بوو، سەرباری ئەوەی سایکۆلۆژیایەکی سادیستانەو مەرگپەرستانە لەپشت هەموو چێژێکی مەرگ‌و شەڕەوە ئامادەبوو، هێندەش مارش‌و نەشیدەکانی جەنگ‌و خرۆشاندن بۆ مەرگ خەیاڵی دۆستایەتی بۆ مەرگ لەلا گەورەدەکردن‌و هەزاران قوربانی ئەو شەڕە ناشرینانە یەکسان نەبوو بە مردنی کەنارییەك لەقەفەزە تەنهاو تاریکەکانی ئێوەدا، هاوکات سەرباری ئەو هەموو نەزعە سادیستییە کە پڕبوو لەچێژ بۆ

رابـــردوو، لێوانلێــو بــوو لەچــێژوەرگرتن لــەئازاردانی یــەکتریو ئەشـکەنجەدانی یـەکتری تامـەرگ، هاوکـات لەپـشت هـەموو چـێژێکی مەرگـەوە، لەپـشت هـەموو شـەڕێکەوە دنیایـەك شـیعرو قەسـیدەی مـەرگدۆستو وێنەی کوشتنی یەکتری، مـەجازی پیاوکوشـتنو وەزنو قافییـەی خـوێن ئامـادەبوو کـە هـەموو پیـاوانی شـەڕی نـاوخۆو زەنگینـەکانی مـەرگی دەسـتەوئەژنو لەمـەرگی یەکتریـدا دەخـەوانو زیاترو زیاتر ئەو چێژەی لەلا گەورەدەکردن.

بـەلاّم گـوێگرتنو لـەو شـیعرانەی کـە لـەروحێکی ژیانـدۆسـتو رۆمانسیو عارفانەوە سەرچاوە دەگرێـت، هـەرگیز بـەراورد ناکرێـت بەو شیعری موناسەبەو مەرگ خۆشویستنەی کە هەندێك لەشاعیرە سادیستەکان چـێژی لێـدەبینن‌و سوتەمەنییەکی کاریگـەر بـوون بـۆ گڕتێبەردانی زیاترو زیاتری ئەو چێژە ئیلاهییە بە مەرگ.

ئێوە بۆئەوەی چێژی ئەو خەیاڵی کوشـتنو ئـەو چـێژی مـەرگو ململانێ ناشرینانە نەچێتەوە نـاو خەونـەکانتان، پێویـستە گـوێ لـە سـوهراب بگـرنو هـەموو شـیعرەکانی سـوهراب بـە فارسـی بکـرنو فارسی زانێکی کوردی ئێران بانگبکەن شـەوانە یـەکێك لـەو قەسـیدە پـــڕ لـــەعیرفانو ژیانـدۆســـتیەتان بـــۆ بخوێنێتـــەوە، کـــەمێك ئێـواران...هەمیـشە ئێـواران شـیعرەکانی حـافزو خـەیام بـۆ یـەکتری بخوێننـەوە، هەنـدێکجار گـوێ لـە بیتهـۆڤن"بەتایبـەتی سـەمفۆنیای ژمارە 9"، گوێ لە مۆسیقاکانی ڤیڤالدیو شتراوس بگـرن، جارناجـار بەیانیان زوو گوێ لەعـەزفی گیتـار بگـرن، ئێـوە پێویـستە کۆمـەڵێك گیتارژەنو تارژەن بکەن بە هاوڕێی خۆتانو ئێواران بەدزیـەوە بـچن

بۆ لایان‌و بە حورمەتەوە لەحزوری ئەو عازفانەدا دانیشن‌و بە عیشقەوە گوێیان لێبگرن. ئەگەر کرا زۆرنا ساڵی جارێك لەماڵی فەقیری ئەو عازفانە بمێننەوەو بەیانیان بەعەزفی گیتار و تار کە بۆ سروشت‌و مرۆڤی دەژەنن نەك بۆ ئێوە هەستن لەخەو و گوێ لەعەزفی ئەو روح‌و جەستەو خەیاڵ‌و خولیایانە بگرن کە دەمێکە گوێتان لێنەبووە.

بۆئەوەی روانین‌و دنیابینییەکانتان مەودایەکی فراوانترو کراوەتری هەبێت، پێویستە ئەو نوسینەنانە بخوێننەوە کە رەخنەگرانەو جیاوازن لەهەر حیکایەتێکی دووبارەو سواو، قەسیدەکانی جەمال غەمبارو شیعرو نوسینەکانی ئەنوەر رەشی ئەولاو ئازاد حەمەو دلاوەر قەرەداغی‌و روانینە پڕ لە موحیبەتەکانی نەوەی نوێی شیعرو رۆشنبیری‌و رەخنەگرانی ئەورۆکە بخوێننەوە، ئێوە بۆئەوەی جارێکی دیکە دەستنەکەنەوە ملی مەرگ‌و ناوچەوانی خوێن ماچ نەکەنەوە، پێویستە رۆمانی دوایەمین هەناری دونیا بخوێننەوە، ئێوە بۆئەوەی جارێکی تر چاوتان رەنگەکان ببینێت‌و رۆحتان پاکبێتەوە، پێویستە رۆژانە بۆ ماوەی تەنها یەك چارەك سەیری تابلۆکانی سەروەت ئەنوەر سەوزو حەمە بەهادین‌و چیمەن ئیسمائیل‌و ستار قادرو شیلان جەبارو سامان کەریم‌و ئیسمائیلۆو ئیشە پەیکەرسازییەکانی شوان رەباتی‌و شوعلە سلێمان‌و ئاشناو تابلۆ جیهانییەکانی کلاسیك‌و دنیای مۆدێرن بکەن. ئێوە بۆئەوەی لەشانۆی مۆدێرن تێبگەن‌و لەو تەوژمە نوێیە تێبگەن پێویستە بچن بۆ هەموو عەرزێکی شانۆیی

گروپی شانۆی (با) و بچن بۆ زۆرێك لەو نمایشە شانۆییانەو بە حورمەتەوە لەسەر ئەو کورسییە شەقوشڕانەی هۆڵەکان دانیشن کە تائەوڕۆکە لەسەر کورسی لەو جۆرە دانەنیشتون.

بۆئەوەی هونەریانە مامەڵە لەگەڵ هاولاَتیاندا بکەن، بۆئەوەی کەمێك هەست ناسکانە بڕواننە ژیانی مرۆڤ لەم دەڤەرەدا، بۆئەوەی بەشێوەیەکی عادیلانەو دوور لەهەر خەیاڵێکی تەنگەبەری حیزبایەتیو ناوچەگەرێتی بڕواننە دنیاو هەندێك کراوەتر خەیاڵسازو ئامادەباشو خەیاڵی گۆڕان لەلاتان گەورەترو فراواتر بێت، پێویستە هەفتەی جارێك یان دووجار فلمێکی جیهانی ببینن و بەتەنها لەگەڵ خۆتاندا سەیریبکەن، بەلاَم با فیلمی ئەکشن نەبێت، یان با ئەو فیلمە ئەمریکیانە نەبێت کە ئەفسانەو پاڵەوانی وەك رامبۆو ئەرنۆڵدو دانێل گرینو جەنگی شەقامەکانو فلیمی ترسناكو فلمی سێکسو مافیا پێشکەش دەکەن. نەخێر بەڵکە پێویستە سەیری فیلمێك بکەن زیاترو زیاتر ژیانتان لەلا خۆشەویست بکات، حورمەتی ئینسان جوانترو جوانتر بکات، مەرگ تیایدا پتر حاڵەتێکی رۆمانسیو مرۆیی بێت، نەوەك حاڵەتێکی سادیستانەو توندوتیژانە بێت. سەیری فیلمی گوزارشتامێزو رۆمانسیو مرۆییو شاعیرانە بکەن، وەك سەیرکردنی ئەدۆنیسی شاعیر بۆ فیلمی سینەمایی.

بۆئەوەی زیاترو زیاتر ئاگاتان لەهاولاَتیان بێت، توخوا گوێ لەخەڵك بگرنو بەجدی وەلاَمیان بدەنەوە، مەیەڵن جارێکی دیکە پەرلەمان ببێتەوە بە تەمەڵخانەو چیتر لەو بێدەنگییە چێژ

وەربگرن، بۆئەوەی بزانن هاولاتیان چیان دەوێت گوێ لەو ڕۆشنبیرانە بگرن، یان نوسینی ئەو ڕۆشنبیرە جدیانە بخوێننەوە کە لەدەرەوەی دەسەلاتو حیزبو دامودەزگا داخراوەکانی حیزبو حکومەتەوە دەڕواننە دنیاو ڕەخنەو سەرەنجی زۆر جوانیان هەیەو کار لەسەر دنیابینییەکی کراوەتر دەکەن. زۆر زۆر پێویستە ئەو هەفتەنامە جیاوازانە بخوێننەوەو بەدوای ئەو کێشەو گرفتو ڕیپۆرتاژو ڕەخنانەدا بچنو وەلامیان بدەنەوە، نەوەك خۆتان بکەن بە کەڕەی شەربەتو وەك معاویە وەلامی کەس نەدەنەوە، .. بەناچاری پێویستە ئێوە گوێ لەو ڕۆشنبیرانە بگرن کە کتێبەکانیانو نوسینەکانیان بە تیراژێکی زۆر بلاودەبنەوەو لەماوەیکی زۆر کەمدا لەبازاڕی کتێبفرۆشاندا نامێنێتو ئێوە ئاگاتان لێیان نیەو فرتان بە دنیای ڕۆشنبیریەوە نیە، گوێ لەوانە بگرن کە ئاوێنە بۆ دەسەلات دادەنێن بۆئەوەی روخساری حەقیقی خۆی تیادا ببینێت، هاوکات پێویستە چەند گرنگی بە شەهیدەکان دەدەنو بەردەوام دەیانکەن بە دروشمو وێردی سەر لافیتەو کردنی هەندێکیان بە پالەوانو ئەوانی دیکەش تەنها بە شەهید، هێندەش پێویستە گرنگی بە زیندوەکان بدەن، گرنگیدان بەوانەی کە لەژیاندان دەکاتەوە بە گرنگیدان بە شەهیدان.

هەولبدەن ئەو خەیالی ناوچەگەرێتییەو ئەو خەیالە سەرەتاییەو هابیلو قابیلەی زیهنتان لەناوخۆتانو خەیالتاندا بکوژنو کەمێك مۆدێرنانە بڕواننە دنیا، ئەو دنیایەی ئێوە تیایدا دەژیان کە درێژبۆتەوە بۆ ئێستاش دنیایەکی تاریکە تاریکتر لەسەردەمی

تەیموری لەنگو گەڕانەوەی ئەنفالو کیمابارانێك بوو بەچەکی سوكو بەخەیاڵی بچوك. ئێوە بۆئەوەی مۆدێرنانە بیربکەنەوە پێویستە دەستبەرداری حیکایەتە بچوکەکانی خۆتان ببنو ئەو خەیاڵە لەناو خۆتاندا بکوژن کە یەکێکتان پێی وایە حیکایەتەکانی شۆڕشی لەوی دیکە زیاترە، لەراستیدا هێندەی زیندوەکان فریای کوردستان دەکەون، هێندە حیکایەتە مردووەکان فریاتان ناکەون.

شەهید لەلای ئێمە موقەدەسترە وەك لەلای ئێوە، ئێوە تەنها دەیانکەن بە دروشمو لەشەڕەکاندا بەکاریاندەهێنن، بەلاّم لەلای ئێمە لەروحو نیگەرانیەکانمانداو لەخەونەکانماندا دەژینو نابن بەحیکایەتی بچوك، بەڵکە بەردەوام لەگەڵماندا بیردەکەنەوە. ئێوە هێندەی شەهیدتان بۆ مەرگدۆستی بەکارهێنا، هێندە بۆ جوانکردنی ژیان بەکارتان نەدەهێنان، بەلاّم ئێمە باس لەژیان دەکەین بۆ شەهیدەکانو، باس لەو ئەمانەتە جوانە دەکەین کە لەگەڵ ئێمەدا دابەشیان کردوە، بەلاّم ئێوە لەسەر ئەو میراتییە دەژینو ئێمەشتان لەناو حیکایەتەکانی خۆتاندا غەرقکردوەو دنیابینییەکانی کۆمەڵگەیەکتان بچوککردۆتەوە بۆ دنیای تەنگەبەری حیزبایەتی.

دنیابینی هێزێکی گەورەیە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی کراوەو سازدانی خەیاڵدانێکی گەورەی لێبوردەییو خەونی گۆڕانو رێزگرتنی ئینسان وەك بوویەکی کاریگەرو بەشدار لەژیاندا، دنیابینی هێزێکە لەدەرەوەی مەرگدۆستی، فشارێکی شارستانییە لەژیانەوە بۆ ژیان.

## سەرنج:

هیواخـوازبن بۆئـەوەی ئۆپۆزسـیۆنتان هـەبێتو کۆمـەڵێك رەخنـەگر لەدەرەوەی ئێوە رەخنـەتان لێبگرنو نارەزایینامـەکانی هاوڵاتیـان بگەیەننـە دەستی پەرلەمانو حکومەت، بەختـەوەربن بـەوەی کە رۆشـنبیرانێك هـەن رەخنـەتان لێـدەگرنو نـەفرەت لەهـەر خـەیاڵێکی ناوچـەگەرێتی(واتـە بێماناییو خـەیاڵی بـچوك)و مەرگدۆستی دەکـەنو پەشیمانتان دەکەنـەوە لەنەرجیـسیەتو لوتبـەرزی حیزبـیو خـەیاڵی تـەواوکردنی یـەکتری، پەشیمانتان دەکەنەوە لەو رۆژانەی کە بە تەوسەوە ماچی ناوچەوانی ئـەو رۆشنبیرو شاعیرانەتان دەکرد کە قەڵەمی شەڕی نـاوخۆو ناوچـەگەرێتیو میلیـشیان کردبـووە شانو بـە چێژەوە هـەموو پێکـەوە تەقـەتان لەیـەکتر دەکردو خەڵکی بێگوناهو پێشمەرگەکان کە ئازیزی هەمومان بوون شـەهید دەبوونو ئێوەش کـە ئاشتدەبوونەوە بـە داوای لێبـوردنێکی ساردوسـڕو بـە زەردەخەنەیـەکی تـاڵو بەدنیایـەك مـەرامی بـچوكو بـەدنیاك خـەونی گومرگییەوە ئاشتدەبوونەوە.

دواجـار مـن زۆر بـە پێویـستی دەزانم رۆژانـە تـەنها دە خولـەك راهێنانەکانی (یۆگا)بکەن، بۆئەوەی رۆحتـان پاکببێتـەوە لەهـەر خـەیاڵێکی شەڕانگێزی، پاکبێتەوە لەهەر خولیایـەکی مەرگدۆسـتیو لەهـەر خـەونێکی بچوك بۆ ناوچەگەرێتی، با سازگاربێت بۆ رەخنەو قبولکردنی جیاوازی، بـا هۆشـیار بێـت بـە زانینـی هـەر غـەدرێك کـە بەرپرسـەکان وەك جاریجاران لەخـەڵکی دەکـەنو خۆیـان زیـاترو زیـاتر دەوڵەمەنـد دەکـەنو بازرگـانی بەسـەر مـنو تـۆوە دەکـەن، بیرتـان نەچـێت ئێـوە بەرلـەوەی سـەرۆكو

بەرپرس بن هاوڵاتییەکی ئاسایی ئەم وڵاتەن، پێویستە کەمێك خەونەکانتان لەخەونەکانی هاوڵاتی بچێت، لەراستیدا حکومەت ئەو حکومەتەیە کە خەڵك دەوڵەمەندەکات، نەوەك بەرپرسەکانی دەوڵەمەندو حیزبەکەی زەنگینترو هاوڵاتیانی هەژارترو بێ ساحێبتر.

لەراستیدا ئەوەی حیزبو حکومەت تائێستاکە وەك خزمەتگوزاری کردویانە بۆ هەرسێ شارەکەی کوردستان ئەرکی سەرشانتانەو ناتوانن بە گران بەئێمەی بفرۆشنەوە، لەبەرئەوەی ئیشی حکومەتو دامودەزگاکانی بێجگە لەخزمەتگوزاریو خزمەتکردنی هاوڵاتیان هیچی تر نیە، ئەگەر خزمەت ناکەن گەندەڵی مەکەن، وێرانی مەکەنو ناشرینی مەکەن. لەراستیدا ئەوە درۆیەکی گەورەیە کە پێتان وابێت کۆمەڵگەو نەتەوەکانی دنیا لەرێی شەڕی ناوخۆو ململانێی بێماناوە گەیشتونەتە پێشکەوتنی شارستانیو دروستکردنی دەوڵەت، ئەم خەیاڵە خەونێکی بچوکی ئەو بەرپرسە بێئیشانەیە کە دەیانەوێت بەڵگەو موبەڕری مێژوویی ناتەندروست بهێننەوە بۆ ململانێی بێماناو شەڕ لەسەر دەسەڵاتو کورسیو گومرگو ناوچەگەرێتی، لەبەرئەوەی لەدنیای مۆدێرندا هەر کۆمەڵگەیەك بیەوێت لەرێی شەڕی ناوخۆوە دەوڵەتو گۆڕان دروستبکات بە کۆمەڵگەو دەسەلاتێکی هەمەجیو بێئاگا ناوزەد دەکرێنو کەمتر حسابی مرۆڤیان بۆ دەکرێت.

بۆئەوەی کێشەی نیشتەجێبونی ئەو هەزاران هەزار هاوڵاتییە قوڕبۆگیراوەیە چارەسەربکەن، بۆئەوەی ئەو هەموو لاوە رزگاریان بێت لەخانوی کرێو لەساحەبماڵی بێویژدان، خوێنەری ئازیز ئێوە ئاگادارن نیوەی ئەم وڵاتە کرێچییە، بەڵام بەرپرسو ئەندامە بەرزەکانی حیزبیش

دەیان تەلارو خانوی لابەلاو چەند هەزار دۆنمێك عەرزشیان هەیە بۆ فشقیات، ئای لەو قوربەسرییە، ئای لەو هەموو ناعەدالەتییە، چەندین ساڵە مەرگ بە کۆڵانەکانی شاردا پیاسەدەکاتو لەدەرگای هەمومانی داوە، مەرگ تەنها مردنی ئازیزێك یان شەڕی ناوخۆ یان تیرۆر نیە، مەرگ ئەو هەموو ناعەدالەتییەیە، ئەزمەی سەکەن، گرانی بازاڕو پێداویستییەکانە، مەرگ گرانی سوتەمەنیو بازرگانیکردنە بەسەر تۆوە لەڕێی بازرگانیکردن بە سوتەمەنیو بەنزینو کرێی تەلەفونو گرانی بازاڕ بەرامبەر کەمی موچەی مامۆستاو فەرمانبەر. ئێوەی بەرپرسو سەرۆكو عەنتەرو عەبلە، پێوستە لەو شتانە بکۆڵنەوە، پێویستە بەرپرسە نابەرپرسەکانتان موحاسەبە بکەن لەسەر دەوڵەمەندبونی خێراو ئەتەکێتی رۆژانەیان، پێویستە پێیان بڵێن چیتر پۆز بەسەر هاولاتیاندا لێمەدەنو خۆتان مەکەن بەعارفو زاناو هاوخەمی خەڵك بەدرۆوە کە لەکاتێکدا هەندێك لەبەرپرسەکانتان وەك هارونە رەشید دەژینو زۆرینەی زۆری هاولاتیانیش دنیایەك کێشەیان هەیە(وەك کێشەی خانوو، گرانی بازاڕ، سەفەرکردن، گوێنەگرتنی وەزارەتو پەرلەمانتارەکان، گرنگی نەدان بەرایگشتیو میدیای ئازاد لەلایەن ئێوەو کێشەی کارەباو ئاو، کێشەی تەندروستیو کرێی خانو، بەرزکردنەوەی نرخی سوتەمەنیو بەنزین لەلایەن کۆمەڵێك مشەخۆرەوە، کێشەی گێڕانەوەی حیکایەتەکان لەلایەن ئێوەوەو گوێنەگرتن بۆ هەر جیاوازییەك لەدەرەوەی خۆتان، کێشەی داخرانی رۆشبیریو مۆنۆپۆلکردنی تەواوی ناوەندە رۆشنبیرو فەرهەنگییەکان لەلایەن خۆتانەوە، کێشەی گوێنەگرتن لەناڕەزایی هاولاتیانو بەکارهێنانی مۆدێلێکی شەقوشڕی بەناو دیموکراسی کە دەڵێت تۆ ئازادی قسەبکەیت، بەڵام منیش ئازادم کە گوێت

لێنـاگرمو وەڵامـت نادەمـەوەو پێتـان رائـەبوێرم، بەشـێوەیەك موچـەی ئەندامانی حیزبو بەرپرسانی حیزبو بەرزدەکەمەوە کە شایەنی بـەراورد نـەبێت لەگـەڵ تـۆی مامۆسـتاو فەرمانبـەردا، هاوکـات پێویـستە موچـەی وەزیرو پەرلەمانتارەکانو بەرپرسە حیزبییەکان هێنـدە بەرزبکەمـەوە کە بـە دوربـین لەسـەرەوە سـەیری ئـەو موچـە بچوکەی تـۆ بکـەن، دنیایـەك بەڕێوبەری گشتی بێئیش لەم ولاتەدا هەیە، دنیایەك بەرپرسی نابـەرپرس لەم ولاتەدا هەیە، دنیایەك راوێژکارو موستەشاری بێئـیشو بـێ ئیستـشارە لـەم دەفـەرەدا هەیـە، بـەلاّم موچـەو ئـەو مەکرەمانـەی وەریـدەگرن دەیـان ئەوەندەی موچەی فەرمانبەرێکی ئاساییە.

بەڕێزان ئەوەی باسی لێوەدەکەن سـەبارەت بـەوەی کـە ئـەم بـارودۆخی گرانییە پەیوەندی بە بازاڕی ئازادەوە هەیە، ئازیزان ئەمە بازاڕی ئازاد نیـە، بەڵکـە بەرەلاّخانەیـەکی گەورەیـەو هیـچی تـر، بازاڕێکـە یاسـای جەنگـەڵ دەیبات بەڕێوە، دیارە ئێوە ئاگاتان لەو گرانییە بێمانایـە نیـە لەکوردستاندا، چـونکە رۆژێـك لـەرۆژان پیاسـەیەکتان بـە بـازاڕدا نـەکردووە، سـەعاتێك کرێچی نەبوون، یەك دەقە بـێ نـەوتو بـەنزین نـەبوون، تاکەیـەك چـرکە لەدوای راپەڕینەوە بێ کارەباو ئاو نەبوون.

ئـەو دەسـەلاّتەی گرنگـی نـادات بـە میـدیای ئـازادو جیاوازییـەکانی دەرەوەی ناوەنـدەکانی خـۆی دەسـەلاّتێکی بێئاگـاو نابـەرپرسو کۆنپارێزە، هاوکات ئەو ناوەندی بڕیارەی خۆی بە خاوەنی هەموو بڕیارەکان دەزانێتو گوێ لەرایگشتی ناگرێتو حساب بـۆ راوبۆچونی شـەقامو میـدیای ئـازادو زانکـۆو نـەوە نوێکـانو مـرۆڤ ناکـات، ئـەوا ئـەو ناوەنـدە بەرهەمهێنـەری هەمەجیـەتو بێباکییـە گەورەکانـەو دەسـەلاّتێکە کـار لەسـەر بێـدەنگیو

غەمگینکردنی شار دەکات. لەکۆتایدا دەمەوێت لەڕێی وتەیەکی کاك ڕێبین هەردییەوە کۆتایی بەم پێشنیارانەم بهێنم، کە دەڵێ:"ئەو شارانەی هەمەڕەنگی ناویان دەکوژرێت و دەچەپێنرێت، شارێکی غەمگینیان لێدەردەچێت کە ئومێد بە ژیان و پاشەڕۆژ و گۆڕان لەناویاندا دابەزێ بۆ نزمترین ئاستی خۆی."[12]، کاك ڕێبین باس لەغەمگینی شارێك و دلڕەقی گروپێکی تیرۆریست و دەسەلاتێکی ئاینی و ترادسیۆنی دواکەوتوش دەکات کە ڕوانینیان بۆ ئاین و شەریعەت هێندە بێئاگایانەیە کە نە لەدنیا تێگەیشتون نە لەدینیش تێگەیشتون کە دەسەلاتێکی پەنهانە لەمزگەوتەکانەوە بۆ غەمگینکردنی مرۆڤ و شار و ژیان، دەسەلاتێکە بارکراو بە جەهل و بەتاڵ لەدنیای مۆدێرن کە لەخێزانەوە سەرچاوەدەگرێت بەرەو مزگەوت و زانکۆو حیزب و خوێندنگەکان و سەرشەقام و خەیاڵ و ژیان داگیردەکات و ژیان بچوکدەکاتەوە بۆ تاکەیەك حیکایەتی دووبارە. ئەو دەسەلاتانە ئەگەر حیزب و بەرپرس و دەسەلاتی بڕیار و حکومەتیان لەپشت بێت کۆمەلگە تاسەرئێسك غەرقی جەهل و بێباکی و هەمەجیەت دەکەن.

لەراستیدا ئێمە خاوەنی دەیان تەلەفزیۆنی حەزین و بێئاگاین کە پاش ڕوودانی ڕووداوەکان دەکەونە باسکردنیان، بەلام لەهەمووی خراپتر ئەوەیە کە تەلەفزیۆنێکی فەزایی هێندە بێئاگا بێت لەئاست هوشیاری و کەرامەتی ئینسان، ئەو وێنە ناشرینانەی گروپەکەی شێخ زانا وەك خۆی بلاوبکاتەوە، بەلام دیارە ئەوە نازانن کە تیرۆر هێندەی کوشتنی ئینسانە بە ترس هێندە کوشتنی مرۆڤ نیە بە کردار، لەبەرئەوە دەبێت ئەوە بزانن کە ترس

---

[12] هاولاتی، ژ233 چوارشەمە 2005/7/20،ل15

لەسەربڕین تۆقێنەرترە لەخودی کردارەکە. دیارە ئەم کەناڵە راوێژکارو پسپۆڕو سایکۆلۆژیستی تیادا نیە وەك هەموو کەناڵەکانی تری کوردستان، ... پێشنیاری من بۆ ئێوەی هەردوو سەرۆكو بڕیاردەرو خاوەن تەلەفزیۆنو دەزگا ئەوەیە کەمێك ئاگاتان لەتەلەفزیۆنەکانتان بێتو بێجگە لەو شتانەی باسم لێوەکرد پێویستیشە کەناڵەکانتان زۆر گرنگی بدەن بە هەمەڕەنگیو گرنگیدان بە مرۆڤو رایگشتیو ژیانی مۆدێرنو خودی هاوڵاتی، با نەبنەوە بە بلندگۆ بۆ شەڕو دژایەتیکردنی یەکتریو گێڕانەوەی حیکایەتە بەباچووەکانو بێباکی بەرامبەر هەموو دیاردەیەكو با بێدەسەڵات نەبن بەرامبەر ئێوەو حیزبەکانتان.. کەمێك فێری جورئەتیان بکەنو بەتاڵیانبکەنەوە لەتەقدیسکردنی حیزبو دروستکردنی کاریزما. دووریانبخەنەوە لەمەرگدۆستیو با کەناڵگەلێکی هەزار نەبن بەژیانو دەوڵەمەندنەبن بە کەمتەرخەمیو بە گێڕانەوەی حیکایەتکانو پەرستنی رابردوو، با شەیدای کۆنپارێزی نەبنو تا سەرئێسك بێئاگا نەبن لەدنیای مۆدێرن.

ژیاندۆستی خەونێکە لەدەرەوەی خەونە بەباچوەکانی نەریتپارێزیو کۆنپارێزی، خولیایەکە لەدەرەوەی خولیاکانی مەرگخوازیو سڕینەوەی ئەویدیو قبوڵنەکردنی جیاوازییەکان، هەستێکی ناسکە لەدەرەوەی دنیای کۆنکرێتی مەزهەبخوازیو حیزبخوازیو خودپەرستی، مانایەکی دیکەیە لەدەرەوەی مانا سنوردراوەکانی کۆمەڵگەی داخراوو فەرهەنگی داخراو، ژیاندۆستی فەرهەنگێکە لەدەرەوەی فەرهەنگی گەندەڵیو بێمانایيو ناشرینکردنی خولیاو و ئارەزووەکانی مرۆڤو فەرهەنگێکی کراوەیە بۆ رێزگرتنی مرۆڤ وەك بوویەکی داهێنەرو بیرکەرەوە.

# دەسەڵاتی جەهل

"ژیانی ناسروشتیانەی زۆردار، لایەنگرانو وابەستەکانیان، ژیانی دەروونی ئەوان بێزارکەرو پڕە لەترسو دڕندەیی‌و بەتاڵیشە لەئاسایش‌و ئارامی‌و شادمانی. ستەمکاران هەمیشە لەترس‌و وەحشەتدان، ترس‌و لەو رق‌و نەفرەتەی کە لەدڵی یەکبەیەکی خەڵکدا هەیەو ئەوانیش بە چاکی لێی ئاگادارن."جۆن لویس

هەڵبەت لەهەموو دنیادا رێپێوان‌و خۆپیشاندان‌و نارەزایی دەربڕین کۆمەڵە مافێکی مەدەنی‌و ئینسانی مرۆڤەکانە لەهەر کوێیەك بن‌و سەر بە هەر مەملەکەتێك بن، هەموو کەسێکیش ئازادە لەدەربڕینی راوبۆچون‌و رەخنەکانی خۆی، هەر دەسەڵاتێکیش رێ لەم مافانە بگرێت بەرلەوەی دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری بێت دەسەڵاتێکی سونەتی‌و نادیموکراتی‌و نامرۆییەو تاسەرئێسك شەرمەزار دەبێت بەرامبەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی‌و خودی هاولاتیانی خۆشی.

ئەو دەسەڵاتانەشی کە لەرێی پۆلیس‌و ئاسایش‌و ئیتلاعاتەوە سوکایەتی بە مرۆڤو شکۆی ئینسانەکانەوە دەکەن‌و پەلاماریان دەدەن‌و جوێنیان پێدەدەن‌و نایەڵن رێپێوان‌و خۆپیشاندان سازبدەن

دەسەلاتگەلێکی هەمەجیو بێئاگاو نادیموکراتنو فریان بەسەر دیموکراسیو ژیانی مۆدێرنەوە نیە، ئەو دەسەلاتانە لەوەش تێناگەن ئەرکی پۆلیس واتە پاراستنی ژیانی مەدەنی هاولاتیانو رێزگرتن لەشکۆو حورمەتی ئینسان نەوەك پەلاماردانو سوکایەتیکردن بە مرۆڤ. دەرەنجام ئەو دەسەلاتانە بە خۆیانو دامودەزگا پۆلیسییەکانیانەوە لەجەهلێکی کوشندەدا دەژینو دەبن بە دیکتاتۆر.

هەلوێستی ئێمەی رۆشنبیر بەرامبەر ئەو هەموو ناعەدالەتیو رەشەکوژییەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەرهەق بە هاولاتیانی کوردستان بەرلەوەی ئەرکێکی نیشتمانی بێت دەیان ئەوەندە ئەرکێکی ئینسانییەو هەلبژاردنی بێدەنگیش بەرامبەر ئەم ئاشوبە سونەتییە لەدنیادا ئەوپەری نارۆشنبیرییەو سەرچاوەکەی جەهلێکی گەورەیە.

جەهل تەنها لەتاریکییەوە سەرچاوە ناگرێت، پەنهان نیەو خۆی نەشاردۆتەوە، جەهل زۆر بە ئاشکراو بێشەرم بەسەر شەقامەکاندا پیاسەدەکات، بێشەرمانە مرۆڤ دەکوژێتو بەسەر خیابانەکاندا رایدەکێشێت، جەهل دەسترێژی گوللە دەکات بە گیانی ئاپورەی ئەو خەلکە برینداردەداو بێشەرمانە دەیانکوژێت، جەهل تەنها عەمامەی نەداوە بەسەرداو کەواوسەلتەی ئیمامی عەلی نەداوە بەسەر شانیدا، بەلکە بەپێی ئایەتەکانی قورئان دەمانکوژێت، فەتوای مەرگ بۆ هەمومان دەردەکات، ئەو دەیەوێت لەرێی پیرۆزییەوە هەموو پیرۆزییەکانی ترو هەموو دنیابینییەکانی دیکە بکوژێت، ئەو

بەناوی پارێزگاریکردن لەئاینی ئیسلام بەقەولی خۆی ڕۆژنامەکان‌و هەفتەنامەکان دادەخات‌و نوسەرەکانیان ڕەوانەی دادگاو زیندانە تاریکەکان دەکات، هەر بەوەوە ناوەستێت هەموو ناڕەزاییەکی هاولاتی غەرقی جەهلەکانی خۆی دەکات‌و سیخناخمان دەکات لەگومڕایی‌و لەشەڕو دژایەتی.

جەهل ناتوانێت ئەویدی قبوڵبکات، ئەو کە باوەڕی بە جیاوازییەکان نیە، هاوکات خەیاڵکوژو مرۆڤکوژو خەونکوژو ئارەزووکوژە، ئەو بۆیە هەموو خواستێکی گۆڕان دەکوژێت‌و فەرامۆشدەکات، لەبەرئەوەی نەك تەنها باوەڕی بە دنیای نوێ‌و گۆڕانکاری مۆدێرن نیە، بەڵکە ئەو پێیوایە هەمو حەقیقەتەکان لەلای ئەوەو حەقیقەتێکی دیکە بونی نیە لەدەرەوەی مەودای داخراوی ڕوانین‌و دنیابینییەکانی، ئەو دەسەلاتە هەمجییەی ئەو، دەسەلاتێکە بۆ فەرامۆشکردنی هەمو کردەو بیرکردنەوەیەك لەدەرەوەی خۆی، جەهل لەو خەیاڵە کوشندەیەدا دەژی کە دەرەوەی خۆی‌و ئەو جیاوازیانە ناکەونە غەبغەبەی جەهلی ئەوەوە کافرو گێرەشێوێن‌و مەلعونن، بەلام تەواو ئەم تێڕوانینە جاهیلانەیە، ئەوە کافرە کە خەیاڵ‌و خەون‌و خولیاو مرۆڤ دەکوژێت، ئەوە مەلعونە کە لەڕێی ئایەتەکانی قورئانەوە قەتلوعام دەکات‌و جەستەو ڕوحی مرۆڤێك بەو هەموو شکۆیەوە بەسەر خایابانەکانداو بەبەرچاوی ئەو هەزاران هاولاتیە بێچارەیەوە ڕادەکێشێ تا مردن.

جەهل بەبێ دەسەلات ناتوانێت بژی، ئەو دەسەلاتەی جەهل بەکاریدەهێنێت‌و باوەڕی پێی هەیە لەتاکەیەك سەرچاوەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکە دەیان سەرچاوەی گەورەی لەپشتەوەیە، ئێمە باسمان لەوە

کردووە کە چۆن لەڕێی سورەتی ئەنفال‌و سورەتی بەقەڕەوە خەڵکی کوردستان ئەنفال دەکران‌و هەموو شەڕەکان‌و کوشتنەکان‌و جینۆسایدەکان کۆمەڵە ئۆپراسیۆنێکی گەورە بوون، بەڵام دەمیان ئایەت‌و راڤەکاری ئاینی لەپشتەوە بوو، بە ئەندازەیەك هەموو ئەو ئۆپراسیۆنانە بەناوی ئەنفال(کە سورەتێکی قورئانییە)و بەناوی سەعدی ئیبنی وەقاس‌و قەعقاع‌و خولافەکانی راشیدینەوەو ناوەکانی خوداوە بەرامبەر کورد کراوە، ئا ئەمەیە سەرچاوەیەکی دیکەی جەهل کە قورئانە، تیرۆریستەکانی ئەم دەڤەرەش هەر بەناوی قورئان‌و مزگەوت‌و جیهادەوە خەڵك سەردەبڕن‌و تیرۆر دەکەن.

سەرچاوەیەکی دیکەی جەهل عەسکەرتاریەتە، قەوارەی هێزە عەسکەرتاری‌و سەربازییەکانی دنیای جەهل سەدان ئەوەندەی مرۆڤەکانە، هێزی سەربازی ولاتە دواکەوت‌و جاهیلەکانی وەك دەسەڵاتی ئێران‌و عێراق‌و سوریاو تورکیا سەدان ئەوەندەی کوشتن‌و زینداتیکردنی ئینسانەکانە. ئەو هێزانە تەنها بۆ بەرگریکردن نیین یان بۆ پاراستنی ولات نیین لەدوژمنەکانی، بەڵکە هێزی عەسکەرتاری‌و ئیتلاعاتی لەم ولاتانەدا تەنها بۆ جلەوکردن‌و لغاوکردنی مرۆڤە، تەنها بۆ زینداتیکردنی عەقڵ‌و روانین‌و دنیابینییە جیاوازەکانە، هێزگەلێکی بێشومارن بۆ بچوککردنەوەی مرۆڤ‌و زەبەلاحکردنی دەوڵەت‌و دەسەڵاتی مەرکەزی‌و دەسەڵاتی مەرجەعی ئاینی.

هاوکات لەتوانادا نیە ئەو دەسەڵاتە سەربازییە لەحیزبە دەسەڵاتدارەکان‌و شوراو پەرلەمان‌و ئیتلاعات‌و هێزەکانی دیکە جیابکەیتەوە، ئەو دەسەڵاتە سەربازییە کە سەرچاوەکەی هەزاران

جەهلە بەدنیاو گۆڕانکارییەکان، دەسەلاتێکە سەدان نهۆم لەسەرو پەرلەمان و یاساو دامودەزگاو فەرهەنگ و شارستانییەت و هاولاتییەوەیە.

ئەم راپەرینە جەماوەرییەی کوردەکان لەرۆژهەلات، راپەرینێك و نارەزاییەکی ئاسایی نییە، بەلکە راپەرینێکە دژی بێدەنگی و بچوککردنەوەی مرۆڤ، دژی زنجیر لەدەستوپێکردنی ئازادی و سەربەخۆی و شکۆی مرۆڤ، دژی دەسەلاتێکە کە غەرقی جەهل و دوبارەکردنەوەی جەهلە، ئەم راپەرینە کە ئەورۆکە زوربەی شارەکانی کوردستانی رۆژهەلاتی گرتۆتەوە، بەرهەمی ئێستا نیە، بەلکە گڕوکلپەی چەندین سالەی بێتاقەتی و بێئومێدی و نارەزایی و بێدەنگییە بەرامبەر رژێمێکی کۆنەپەرست و کۆنزێرڤاتیف، ئەم راپەرینە پێمان دەلێت ئەو دەسەلاتەی گوێ لەهاولاتیانی ناگرێت و حساب بۆ رایگشتی و ئازادییەکانی تاکەکەس و ئازادی فەرهەنگی و رۆشنبیری و دنیابینییەکان ناکات و جیاوازییەکان قبولناکات، دەسەلاتێکی موتلەق و جاهیلە بەرامبەر ژیان، دەبێت ئەو رۆژەشی لەبەرچاو بێت کە خیابانەکان پڕدەبن لەمرۆڤی نارازی و بێزار لەتۆی دەسەلات، کوچەوکۆلانەکان پڕدەبن لەگەنج و کیژۆلەی بێ تاقەت لەجەهل و مشتیان پڕە لەبەرد(سەنگ) و دەیگرنە ناوچەوانی تۆ ئەی جەهل، دەیگرنە پەنجەرە داخراوەکانی تۆ ئەی دەسەلاتی عەسکەرتاری، بەرد دەگرنە روخساری پۆلاینی تۆو زامدار دەبیت و لەجێی شەیتان رەجمت دەکەن، ئەو دەسەلاتانەی بەم ئاقارانەدا دەڕۆن دەبن بە شەیتان و رەجمدەکرێن، تۆی جاهل بەئاسانی

ناتوانیت لەم سەردەمە کراوەیەدا خەڵك بکوژیت‌و ڕێپێوان بکەی بە خوێنپێوان‌و بەڵگە بۆ کوشتنی ئینسان بهێنیتەوەو بۆی دەرچیت.

تۆی دەوڵەتی ئێران کە خاوەنی حافیزو سەعدی‌و خەیام‌و سوهرابی سپهەریت‌و تاکەیەك کۆپلەی شیعرەکانی ئەو شاعیرە زیبایانەت خوێندبێتەوە، چۆن دەتوانیت بێشەرمانە بە بەرچاوی خیابانەوە مرۆڤ بکوژیت‌و تیربارانی هاوڵاتیان بکەیت، تۆ کە خاوەنی شارستانی‌و فەرهەنگییەکی گەورەی چۆن دەتوانیت پشت لەو فەرهەنگە زیبایە بکەیت‌و لەبری خوێندنەوەی قەسیدەیەکی سوهراب بەسەر ئەو ڕێپێوانەدا تیرباران‌و گولەبارانیان دەکەیت‌و تۆ لەبری ئەوەی عەتری ئاقاقیا بپرژێنیت بەسەریانداو بە حورمەتەوە گوێیان لێبگریت، باروت بەسەریاندا دەپرژێنیت‌و لەژێر سێبەری عەسکەرتارییەت‌و قورئاندا دەیانکوژیت. تۆی دەوڵەت گەر بڵێیت داریوش‌و هایدەو مەهەستی‌و گوگوش‌و حەسەنی یوسف زەمانی‌و ئەو هەموو ئاوازدانەرو سینەماکارانەی ئێران فەرزەندەی من نیین، درۆ دەکەیت، ئەوانە هەمووی فەرزەندە ڕەخنەگرو نارەزاکانن لەتۆو بەهۆی ئەو دەسەڵاتە موتڵەقەی ئاخوندو مەلاو ئیتلاعاتەوە بۆ چرکەساتێك ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو خاکە، بۆ ئەو شارستانییە زیبایە، تۆ خاوەنی ئەوانیت چۆن دەتوانیت مرۆڤەکانی خۆت بکوژیت، چۆن دەتوانیت مافی ئەو هەموو مرۆڤە پێشێلبکەیت‌و حساب بۆ شکۆی مرۆڤو نەتەوە یەکگرتووەکان‌و ڕای نێونەتەوەیی نەکەیت.

دنیای مۆدێرن دنیایەکە لەدەرەوەی خەیاڵدانی نەوەکانی پێشوو، خەیالگەیەکە بەسەر ڕوانینە جیاوازەکاندا دابەشدەبێت‌و

مەودایەکی دیکەی بەرفراوانی گفتوگۆو تێگەیشتنە، دنیای پاش حیکایەتە گەورەکانەو دنیای جیهانبینیو خولیا جیاوازەکانە، کلێشەیەکی دیکەی ژیانە بۆ دورخستنەوەی مێژوو، بەلأم دنیای نەوەکانی پێشوو دنیای پڕ لەموقەدەساتی بەتاڵو پڕ لەرەمزی دووبارەو پڕە لەبۆنەو موناسەبەی هەلاهەلاو پڕە لەکۆلاجی کۆنەپەرستیو دروشمی مۆدێرن، دنیایەکی داخراوە، بەواتایەك خەیالگەیەکی بازنەیی دیاریکراوەو تاکەیەك رەهەندی بیرکردنەوەو تاکەیەك راڤەکردن بۆ دنیاو خولیای ئیرادەیەکە دووبارە، خولیای کۆمەلگەیەکە لەناو کۆمەلێك موقەدەساتی بەتاڵدا غەرقی جەهلو دوبارەبونەوەو خۆشاردنەوە بووە.

کەواتە دنیای بەتاڵ چییە؟ دنیای بەتاڵ دنیایەکی داخراوە، دنیایەکە ژیان تیایدا سنوری شارێكو گەرەکێكو کۆلأنێکی بێدەروازەو بێکۆتاییە لەداخران، لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئەم دنیایە پڕە لەموقەدەساتو دنیای شتە پیرۆزەکانو پڕە لەرەمزو بەها نەریتیو ئەخلاقیو سیاسیو ئاینیو کولتورییە هاوشێوەکان، بەلأم ئەگەر بڕوانینە کۆی ئەو ستراکچەرەی کە بیرکردنەوەو هزری ئەوە، ئەوا سەرلەبەری ئەو جومگانەت بۆ دەدۆزرێتەوە کە ئەو دنیا دۆگمایە لەکلێشەسازییەکی وەهمیدا گرفتاری دوبارەبونەوەیە، دنیای دوبارە دنیایەکە پڕ لەموقەدەساتو دنیای شتە پیرۆزەکانو رەمزەکانە، لەراستیدا بەتاڵە لەموقەدەساتی نوێو لەرەمزی مۆدێرنو بەهای نوێ، ئەوەی بەردەوام لەدوبارەبونەوەکانەوە دەخولقێ بەتالە لەهەر روانینێکی جیاواز بۆ جیهانبینیو بینینی

دەرەوەی ئیرادەیەکی دوبارە، واتە دەرەنجامی دوبارەبونەوە گەڕانەوەیە بۆ خاڵی دەستپێکردنو وتنەوەی هەمان ئەو دەستەواژانەی کە بەر لەئێستا وتراونو کراونو دوبارەی دەکەینەوە. مرۆڤی مودێرن بێزارە لەدوبارەبونەوەو دەسەڵاتی موتڵەقی دنیای شتە پیرۆزەکانو دنیای داخراوی مژدەو بەڵێنە درۆکان.

دنیای کۆنکرێتی کۆمەڵگە داخراوەکان دەرەنجامی ئەو پەیوەندییە داخراو و دۆگمایانەیە کە لەبازنەیەکی بچوکدا سەرلەبەری ئەوەی لەلای نەوەکانی پێشوو موقەدەسەو رەمزو بەهایە جارێکی دیکە هەرزان فرۆشدەکرێت، بەواتایەك پانتاییەکە بۆ غەرقکردنی هەموو گۆڕانکاریو خەیاڵێکی نوێو روانینێکی دیکە لەدەریایەکدا کە پڕە لەدوبارەبونەوەی بەتاڵ.

تەنها لەسیتمە دیکتاتۆرییەکاندا تەواوی راوبۆچونو بیرکردنەوەکان دەبێتە موڵکی یەکەمو رەهاو بێقسەی ناوەندی حوکمو ئەو هەرەمە گەورەیەی کە زانیاریو ئامارەو شفرەو بڕیارەکانی پیادا دێتەخوارێو دامودەزگاکانی دەسەڵات پەیڕەوو پیادەیدەکەن، ئەوەی جێی گفتوگۆو قسەکردن نیە تەواوی ئەو بڕیارو زانیاریانەیە کە لەسەرەوەی هەرەمەکەوە بە نهێنی گەڵاڵەدەکرێو ئاڕاستە دەکرێت.

هەر دەسەڵاتێك لەدنیادا ئەم شێوازە بەکاربەرێت، ئەوا دەبێتە پەیڕەوکاری مۆڕاڵی دیکتاتۆری، کاتێك دەسەڵات سەرچاوەکان مۆنۆپۆلیزە دەکاتو بەتەواوەتی داگیریان دەکات، تەنها ئەگەر گەورەترین بانگەواز بۆ دیموکراسیەتو کۆمەڵگای مەدەنی بکات

دەبێـت بـە دیکتـاتۆر، لەبەرئـەوە دیکتـاتۆر هـەر ئـەوە نیـە کـە جینۆساید ئـەنجادەداتو تـەواوی نیـشتمان دەکاتـە بەندینخانەیـەکی گــەورە، نـــەخێر بەرلـــە هەرشـــتێك دیکتاتۆریـــەت ئـــەخلاقو بیرکردنەوەیـە، ئـەخلاقی مۆنۆپـۆلیزەکردنی سەرچـاوە ئـابوریو سیاسیو کۆمەلآیەتیەکان کۆمەڵە ئەخلاقێکی دیکتاتۆرین، ئەخلاقی بێگوێی دەسەلأت بەرامبەر هاولأتیانو حساب نەکردن بۆ رایگشتیو پشتگوێخستنی تەواوی رەخنەکانو ئەو گەندەڵیە ئیداریو ئابوریو وزاریانە بەشێکن لـەمۆراڵی سیـستمی دیکتـاتۆری، هاوکـات نـەبوونی سەروەری یاسـاو دەسـەلأتی دادوەریـی سـەربەخۆو کوشـتنی میـدیای ئـازادو داگیرکردنـی سـەندیکاو رێکخراوەکـانی کۆمەڵگـەی مـەدەنیو کــۆنترۆڵکردنی ســـەرلەبەری سەرچـــاوەکانی راگەیانـــدن لەلایـــەن دەســـەلأتی موتڵـەقی حیزبـەوە سـەدان هـەنگاو نزیکماندەکاتـەوە لـە دامەزراندنی دەسەلأتێکی دیکتاتۆری ستەمکارو وێرانکار.

# حکومەتی ناعەدالەتی

## ئەنفالکردنی کۆمەڵگەیەك لەرێی گەندەڵی و ناعەدالەتییەوە

"کاتێـك بـەهۆی پـشتیوانیکردنی بـچوك و گـەورەکان و لەژێر سایەی زۆردارێکدا" هەموو سودە ماددییەکان دەچنە بەردەسـت ژمارەیـەکی کـەم، لەچـاوی ئـەم ژمـارە کەمـەدا ستەمکاری هێندە سودبەخش و بەنرخە کە وەك ئازادی وایـە لەروانگەی ئازادیخوازانەوە.."لابۆتی

ئاماژە بە ماشێتی(دوو ملیۆن دۆلار مانگانـەی پەرلـەمانتارو وەزیـرو بریکارو بەڕێوبەرەکانە، تـەنها 100 دۆلار موچـەی مانگانـەی خێزانێکـی ئەنفاله) کە لە ژمـارە(20)هەفتەنامـەی ئاوێنـەدا بلاّوکراوەتـەوە، وێـڕای دەستخۆشی لـەو رۆژنامەنوسانەی ئـەم هەواڵە گرنگـەیان دەسـتکەوتووە، ئێمەشی دەستکراوەکرد بۆ ئـەوەی زۆر بـە لـۆژیکی رەخنـە لەحکومـەت و دەزگاکـانی بگـرین. هاوکـات مـن خـۆم بەرپرسـم لـەم وتـارە، بۆتـان نیـە جارێکی تر مەحکەمەی کاك ئاسۆس هـەردی بکەنـەوەو سـزای یاسـایی و دارایی بدەن بە سەریدا.

دنیای تاریکی گەندەڵی هەمان دنیای پەنهانو پڕ لەئاڵۆزیو نهێنی دیکتاتۆرەکانە، دنیای بێبایەخکردنی مرۆڤەکانو بیروڕاجیاوازەکانو دنیابینییەکانی دەرەوەی ئەو دنیا داخراوەیە کە ئێمە ناوی دەنێین گەندەڵی یان هەر ناوێکی دیکە نزیکتر لەدنیای داگیرکاری حیزبو ناعەدالەتیو بازرگانیکردن بە داهاتی نادیاریکراوی کۆمەڵگەو حکومەتەوە، ئەو ناوەندەی پڕە لەگەندەڵیی تەمەڵخانەیەکی گەورەی پارەخواردنو خۆدەوڵەمەندکردنو قۆنتەراتخانەیەکی گەورەوگرانە. دنیای گسك لێدانی سەروەتو سامانی کۆمەڵگەیە بۆ چەند کەسێکی دیاریکراوی مشەخۆر، دنیای ناشرینکردنی ژیانو پەنهانکردنی نهێنییەکانو ناشەفافیەتو سیخناخکردنی دەسەڵاتو بەڕێوەبردنە بە جەهلو ناعەدالەتی.

گەورەترین گەمژەیی لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە کۆمەڵگەیەکت هەیە لێوانلێو لەناعەدالەتی ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسی، دەسەڵاتگەلێکت هەیە سیخناخ لەجەهلو بێباکیو نابەرپرسیارێتی، سەرباری هەموو ئەم شتانە تەلەفیزیۆنەکانیان پڕکردەوە لەخوتبەبێژی دیموکراسیو مافی مرۆڤ، دنیایەك واعیزی گومڕاکەریان خستۆتەکار بۆ داپۆشینو سەرنانەوەی ئەو هەموو ناعەدالەتیو گەندەڵییەی کە سەرلەبەری حکومەتو حیزبو دامەزراوەکانی گرتۆتەوە. وەك چۆنو ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسە بێئاگاکانیان وەك کۆمەڵێك عەریزەنوس خستۆتەگەڕ بۆ چەواشەکردنو بێبایەخکردنی هەر ناڕەزاییەکی جەماوەریو هەر ڕەخنەیەکی لۆژیکیو مەعریفی.

خوێنەرانی ئازیز ئەمجارە گەندەڵی زۆر بەئاشکراو زۆر بەزەقی‌و زۆر بێشەرمانە لەرێی پەرلەمان‌و حکومەت‌و وەزیرەکانەوە خۆی دەکات بەماڵی هەموو یەکێك لەئێمەداو تاسەرئێسك نیگەرانمان دەکات بەو هەموو ناعەدالەتییە ناشرینە-کاتێك دوو ملیۆن دۆلار دەبێتە غەنیمەی مانگانەو بەردەوامی سەرۆکی حکومەت‌و جێگرەکەی‌و پەرلەمانتارەکان‌و وەزیرو بریکارو دەستەوتاقمی حیزبەکان، ئەوکاتە هەستوشعوری تۆی هاولاتی بەناخی عەرزا دێتەخوارێ، ئەوکاتەی تۆ وەك مرۆڤێکی شایستەو خاوەن بڕوانامە بە موچەیەکی کەمەوە کە لە(100)دۆلار زیاتر نیەو دەڕوانیتە موچەی لەرادەبەدەری سەرۆکی حکومەت‌و دەستەوتاقمی دەسەلات، ئەوکاتە هەست دەکەیت لەوێرانەیەکدا دەژیت بەناوی کۆمەلگەوە، قۆنتەراتخانەیکت هەیە بەناوی حکومەتەوە، پەرلەمانتارێکی بێدەنگ‌و بێباك‌و بێوەی کە موچەی مانگانەکەی دەگاتە (4)ملیۆن‌و (820)هەزار دینار، کە بەداخەوە لەسەرەتای دروستبوونی پەرلەمانەوە واتە لەساڵی 1992دوە تاکو ئەورۆکە کە سەدەی بیست‌ویەکەو ساڵی(2006)ە، نە داهێنانێك‌و نە نارەزاییەکی توندو نە هەلۆێستێکی بوێرانە لەم پەرلەمانەوە هاتە دەرەوە، پەرلەمانتارێکمان نەبینی لەدژی شەڕی ناشرین‌و قێزەوەنی ناوخۆ دەستبەرداری پۆستەکەی بێت‌و بەدەنگێکی پڕ لەنارەزایی دەست لەکارکێشانەوەی خۆی رابگەیەنێت‌و واز لەموچەو پۆست‌و مەکرەمەکان بهێنێت، وەزیرێکمان نەبینی

رەخنەیەکی جیدی لەحکومەتو بەرپرسەکان بگرێتو دەستبەرداری پۆستو نەسرییە سحرییەکان بێت.

سەرۆکی حکومەت تۆ کە (10)ملیۆن دینار موچەی مانگانەتە، کە سەرلەبەر بەبێ نەسریەو پارەی حیزب لەچوار وەرزەکەدا کە دەکاتە دوازدە مانگ تۆی خواپیاو (120)ملیۆن دینار وەردەگریت کە بە نرخی ئەمڕۆی دۆلار دەکاتە(80.536) دۆلارو قسور، واتە هەشت دەفتەرو نیو دۆلاری جوان، جێگرەکەشت کە مانگی (7)ملیۆن دینار موچەکەیەتی سالأنە بەپێی وەرزەکان دەگاتە (84)ملیۆن دینار، کە بە دۆلار سالأنە دەگاتە (6)دەفتەر بەبێ نەسریەی سیحریو شتی لەو جۆرە، لەکاتێکدا قوتابییەکی زانکۆش ئیمانی دەردێت تا (16) سالی خوێندن تەواو دەکاتو هەلێئەدەنە دەرەوەی شارو سەد دۆلاری هیچی ئەدەنێ کە سالأنە دەکاتە (12)گەلأی حەزین، ئەوە ئەگەر کرێچی بێت کە بێگومان نیوەی ئەم ولأتە کرێچییە، ئەوا دەبێتە ئەندامێکی پلە نزمی جەهەنەم، هیوادارم سەرۆکی حکومەتو جێگرەکەی عاجز نەبن لەبەرئەوەی ئەوەی من دەیلێم حەقیقەتێکی حەزینە، بەلأم ئەم حوزنە پڕە لەناعەدالەتیو نابەرپرسیارێتی ئێوە. ئەوە ئەگەر بێینە سەر قسەکردنو بەراوردکردنی موچەی ئێوە بەو موچە حەزینەی مامۆستاو ئەو هەموو گەنجە تازە دامەزراوەی کە موچەکەیان ناگاتە بەرپێی هیچ کام لەئێوەی بەڕێز، ئەوا من ئەی شوبهێنم بە ئەنفالکردنی کۆمەلگەیەك لەڕێی گەندەلیو ناعەدالەتیەوە.

بەڕێزان کۆمەڵگەی پێشکەوتوو ئەو کۆمەڵگەیەیە کە ئاستی نێوەندی داهاتی ساڵانەی تاکەکەسی ئاسایی تیایدا بەقەدەر لانیکەمی گوزەرانی ژیانێکی ئاسایی بێت، نەوەك داهاتەکەی 20٪ی خواستو گوزەرانی دابیننەکات، لەو کۆمەڵگایانەدا کە ئاستی گوزەران زۆر لەخوار ئاستی داهاتی تاکەکەسەوەیە، ئەوا خاوەنی کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوونو هاوکات خاوەن دەسەڵاتگەلێکی ناعادیلو گەندەڵو بێئاگان.

کاتێك موچەکەت (67) جار زیاترە لەموچەی مامۆستایەکی دەرەوەی شار، کەواتە تۆو حکومەتەکەت زۆر ناعادیلن، کاتێك موچەی تۆی پەرلەمانتار(32)ئەوەندەو نیوی موچەی دەرچویەکی زانکۆیە لەدائیرەیەکی حەزینی حکومەتدا، کاتێك موچەی تۆی وەزیری تازە(36)ئەوەندەی موچەی فەرمانبەرێکی خاوەن بڕوانامەیە، چیتر هەموتان واتە ئێوەی سەرۆکی حکومەتو جێگرو پەرلەمانتارو وەزیرو بریکارەکان ناتوانن باس لەکێشەی خەڵك بکەنو بە فیزێکی کاریزمییەوە پێمان بڵێن ئێمە ئاگامان لەهەموو کێشەکانەو بە پشتیوانی خواو پێغەمبەر چارەسەری دەکەین، هاوکات چیتر ناتوانن ببن بە خوتبەبێژێکی بە سەلیقەی دیموکراسیو راستییەکان ئاوازوو بکەنو بەڵێنی وەهمی بە خەڵك بدەن. چیتر هیچ کام لەئێوە ناتوانن ئەو هەموو گەندەڵییە چارەسەر بکەن، ناتوانن زەڕەیەك عادیلانە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکانی ئەم وێرانەیەدا بکەن، چیتر ناتوانن خۆتان بکەن بە خاوەنی ئەنفالو هەڵبجەو لەبری ئەوان بکرۆزێنەوەو خۆتان بکەن

بە پاڵەوان. لەبەرئەوەی پاڵەوان ئەو کەسەیە کە مرۆڤەکانی تر رزگار دەکاتو ژیانی ئەوانی تر خۆشدەکات، نەوەك تەنها خۆی رزگاربکاتو ژیانی خۆی سەدان قات خۆشتر بکات.

کاتێك حکومەت حساب بۆ رایگشتیو مرۆڤەکان ناکات، حساب بۆ رێپێوانو خۆپیشاندانو نارەزایی هاولاَتیان ناکات، کاتێك حساب بۆ رەخنەو پێشنیارو مرۆڤەکان ناکات، ئەوا ئەو حکومەتە فرِی بەسەر دیموکراسییەتو ژیانی مۆدێرنەوە نیە، لەجەهلێکی گەورەدا دەژی، جاهیلە بە دنیای مۆدێرنو مرۆڤەکانیو بیرناکاتەوە لەخواستو داواکارییەکانی کۆمەڵگە، تاسەرئێسك باوەری بە مەرگدۆستیو بێبایەخکردنی ژیان هەیە، حکومەتێکە هێندەی کاردەکات بۆ دەوڵەمەندکردنێکی خێرای خۆیو بەرپرسو حیزبەکەی، هێندە کار ناکات بۆ جوانترکردنی ژیان، هێندەی کاردەکات بۆ رازاندنەوەی جەهلوگەندەڵی هێندە پشتیوانی هیچ پێشنیارو رەخنەیەك نیە، گوێگرێکی خراپەو قسەکەرێکی بێباکە.

ئەو حکومەتو حیزبو بەرپرسانەی پێیانوایە دیموکراسیەت واتە ئێوە رەخنەبگرنو ئێمە گوێتان لێناگرین، ئێوە جوێنمان پێبدەنو ئێمە وەلاَمتان نادەینەوە، ئەوە ئەوپەری گەمژەییو جەهلە بە دیموکراسییەت، ئەوەی پێیوایە رایگشتیو رای شەقام، راوبۆچونی هاولاَتیانێکە دەستی ئیسلامییەکان یان چەپەکان یان دەستی تیرۆری لەپشتەوەیە، زۆر بێئاگایە بەرامبەر گۆرانکارییەکان، زۆر هەژارە بە مەعریفەو رۆشنبیرییەکی سادەی هاولاَتیان، بۆ نمونە خۆپیشاندانو نارەزایی جەماوەری کەلارو هەڵەبجەو ئاکاریو رێپێوانەکانی خوێندکاران

لەشارەکانی کوردستان، هەموو ئەمانە نمونەی زیندوون بۆئەوەی ئێمە لەرێیانەوە ئەوە هەڵبسەنگێنین کە دەسەلاَت بێ ئەندازە بێباکە بەرامبەر هاولاَتیان‌و سەرباری ئەو بێئاگاییە گەورەیە دەیەوێت هەموو نارەزاییەك چەواشە بکات‌و هەموو رەخنەیەك ئاوەژوو بکات.

حکومەتە نادیموکرات‌و نابەرپرسەکان بەردەوام لەهەوڵی دوورخستنەوەی کێشەو ململانێکانن لەخۆیان، واتە حکومەت بۆئەوەی داواکارییەکانی تۆی هاولاَتی پەیوەست نەکات بەخۆیەوەو بە کێشەی خۆی نەزانێت، بەردەوام کێشەکانی تۆ پەیوەندیدار دەکات بەبازارەوە، یان بە دەسەلاَتی مەرکەزییەوە، یان دەیگەرێنێتەوە بۆ دیاردەیەکی شارستانی کە هیچی لەبارەوە نازانێت‌و غەرقی جەهلێك بووە بەرامبەر هەموو ئەو دیاردە نوێیانەی دنیا وەك بازاری ئازاد، جیهانگیری، خەسخەسە، کەرتی تایبەت، کرانەوە..تاد. ئەو حکومەتەی کە چەندین ساڵە لەسەر گومرگ‌و بازرگانی‌و کۆکردنەوەی باج دەژی، سەرباری ئەو بودجە زۆرەی کە لەلایەن حکومەتی ناوەندەوە بۆی دەردەچێت، تا ئەورۆکەش گومرگ‌و باجی زۆری خستۆتە سەر کالاَکان‌و بەکرێدانی شوێنگە تایبەتییەکانی کرین‌و فرۆش، هاوکات لەهەمووی خراپتر بە دوو حکومەت کۆنترۆڵی بازارە خنجیلانەکانی ئەو سێ شارەیان پێناکرێت.

لەراستیدا ئەو حکومەتەی کە هیچ بەرنامەیەکی زانستی‌و ئابوری‌و کۆمەلاَیەتی مۆدێرنی نەبێت بو بەرێوەبردنی ولاَت، بێجگە لەتەمەڵخانەیەکی گەورە هیچی تر نیەو کۆمەڵێك موچەخۆری مورتاحن‌و هیچی تر، ئەو حکومەتەی دووردەکەوێتەوە لەبەرپرسیارێتی‌و گرنگیدان بە هاولاَتیان‌و کۆنترۆلکردنی بازار‌و

داهاتی شاهانەی مەسئولەکان و دەیان کێشەو گرفتی نیشتەجێبوون و نزمبوونەوەی ئاستی بژێوی ژیان و گوزەران، حکومەتێکە بێئەندازە غەرقی نابەرپرسیارێتی و فەشەل و بێئاگایی بووە. بێگومان هەر حکومەتێك ئەو تایبەتمەندییە ناشارستانی و ناعادیلانەی تیادا بوو، حکومەتی فرۆشتنەوەی حیکایەتەکانە بە هاولاتی و هیچی تازەی نییە بیلێت و گوێگرێکی خراپەو حیکایەتخوانێکی بێباك و دەوڵەمەندە.

لەوانەیە یەکێك لەمەسئولە حیزبییەکان وەلامم بداتەوەو بڵێ کاکە موچەی سەرۆکی حکومەت و جێگرو وەزیرەکان لەکەنداو ئەورووپاش بەم شێوەیەیەو بگرە زیاتریشە، منیش هەر لێرەوە پێی دەڵێم برادەر کاتێك موچەی ئەو بەرپرسە حکومیانە لەولاتانی خۆرئاوا لەمە زیاترە کە ئاستی نێوەندی داهاتی مانگانەی تاکەکەس زۆر لەسەرو بژێوی ژیان و گوزەورانەوە بێت، هاوکات سەرجەم مافەمەدەنی و ئابوری و فەرهەنگیەکانی هاولاتیان لەو ولاتانەدا دابینکراوەو موچەی مانگانەی تاکەکەس بەشی ژیان و پاشەکەوت و خۆشگوزەرانی دەکات، بە بێچەوانەشەوە موچەی فەرمانبەرێك یان مامۆستایەك لەم ولاتەدا نەبەشی لانیکەمی گوزەرانی دەکات، نە دەتوانێت پاشەکەوتی بکات، لەکاتێکیشدا کۆی موچەی سالانەی سەرۆکی حکومەت (800) ئەوەندەی کۆی موچەی فەرمانبەرێکی خاوەن بڕوانامەیە، ئازیزان ئائەمەیە ناعەدالەتی، ئائەمەیە کوشتنی مرۆڤ بە دیموکراسیەتێکی وەهمی و ئەنفالکردنی ژیان بەناوی دیموکراسیەت و یەکگرتنەوەو فەنتازیای چاوەڕوانی باشترکردنی ژیان لەرێی تۆخکردنەوەی گەندەڵی و شەرعیەتدان بە ناعەدالەتی.

ئەو حکومەتەی گوێ لەهیچ شتێك ناگرێتو پێیوایە حساب بۆ خەڵك ناکاتو رایگشتی خستۆتە ژێر پێیەوەو حساب بۆ میدیای ئازادو رەخنەگرەکان ناکات حکومەتێکی کارتۆنییە، بەتاڵە لەهەر روانینێکی زانستیو ئەکادیمی بۆ دنیا، بەلاّم پرپیشە لەنائاگاییو بێباکیو خەمساردیو ناعەدالەتیو تەشریفاتو موجامەلەو وێرانەییو جەهل، بەواتایەك تەمەڵخانەیەکی گەورەوگرانی بەخێوکردنی جەهلو وەهمە.

# کۆمەڵگەی بێ ساحێب

"رۆشنبیر بەوەندە ناوەستێ کە سەربەخۆی خۆی لەدەوڵەتو دەزگاکانی، لەدەسەڵاتو بەرتیلەکانی، رابگەیەنێ. ئەو بەو شێوەیە رەفتار دەکات کە بەرپرسیاری بەهاو ئازادییەکانی لەئەستۆدایە، ئەو پێیوایە وەك جێبەجێکردنی ئەرکەکەی، دەبێت لەریزی ئۆپۆزسیۆندا بوەستێو چەکی رەخنەگرتن بەکار بهێنێ بۆئەوەی پرۆسەی دەوڵەتو رژێمو دەسەڵاتەکان لەشێوەکانی چەوسانەوەو ناعەدالەتی، رووتو ئاشکرابکات. میکانیزمی گەمەکردن بەرووداوو راستییەکان ریسوا بکات، ئەمە ئەرکی رۆشنبیرە.."عەلی حەرب

کۆمەڵگەی بێساحێب یەکێکە لەکۆمەڵگە دەگمەنو دانسقەکانی دنیا، دنیایەکی جیاوازی ژیانو پەیوەندیو گۆرانکارییە، بەئەندازەیەك کۆمەڵگاییەکی داخراوە لەرووی سیاسیو کولتوریو ئابورییەوە، بەواتایەك کۆمەڵگەیەکە زادەی کلێشەسازییەکی کۆنکرێتیو سنوردارو بێبەرنامەیە، هاوکات کۆمەڵگەیەکە پڕە لەوەهمو خەیاڵ، بەڵام خاڵییە لەگۆڕانکاریو وەرچەرخانی گەورە، لێوانلێوە لەوەهمو فەنتازیای خۆشگوزەرانیو خەونی پارچەپارچە، بەڵام بەتاڵە لەواقیعو حەقیقەتو خەونی ڕاستەقینە.

کۆمەڵگەیەکە لەڕووی سیاسییەوە لەسەرگەردانییەکی بێئەندازەدا دەژی‌و کەس ساحێبی ڕاوبۆچونی خۆی نیە، شتێك نیە بەناوی ئازادی ڕادەربڕین‌و ماڤی هاوڵاتیبوون‌و ئاسایشی تاکەکەسی، ئەمجۆرە کۆمەڵگایانە بەرهەمهێنەری لێشاوێك سەرکردەو بەرپرس‌و ریشسپی‌و پیاوی حیزبیە، بەلام لێوانلێوە لەئەندام پەرلەمانی بێدەنگ‌و وەزیری بێخەون‌و موستەشاری بێئیش‌و پسپۆری ناکارامەو سەرۆکی بەختەوەرو جێگری مورتاح‌و سوپایەکی گەورە لەعەریزەنوسی ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان، بەلام خاڵییە لەبەرپرسیارێتی ڕاستەقینەو شەفافیەت‌و بەدەنگەوەهاتن، هاوکات خاڵییە لەگوێگرتن‌و وەڵامدانەوەو گفتوگۆو چالاکی.

## کەلاوەی ئابوری

کۆمەڵگەی بێساحێب لەڕووی ئابورییەوە بەرەڵاخانەیەکی گەورەی پیاوە چاوچنۆکەکانە، مەزادخانەیەکی گەورەی بێباکی‌و رووتکردنەوەی هاوڵاتیانە، قۆنتەراتخانەیکی گەورەی کۆمپانیا مشەخۆرەکانە، مێزێکی رازاوەی خواردنەوەو کەیف‌و سەفاو عیشوەی بازاڕی ئازادو گیرفان پڕکردنە. هاوکات سەرلەبەری سەرچاوە ئابورییەکان کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی حیزب‌و بەرپرس‌و کۆمپانیا وەهمیەکانەوە. بازاڕ لەمجۆرە کۆمەڵگایانەدا ناویان لێناوە بازاڕی ئازاد، بەلام لەڕاستیدا بەرەڵاخانەیەکی گەورەی بێساحێبی‌و ماڵوێرانییەکی گەورەیە بۆ هاوڵاتیان‌و مرۆڤەکان بەگشتی، بەلام بۆ لە(5٪)ی کۆمەڵگە کە بەرپرس‌و ئەندامە

مورتاحەکانی حیزب[13] و وەزیرو ئەندم پەرلەمانەکانو سەرۆکی حکومەتو جێگرو سەرۆکی شارەوانییەکانو سەرۆکی حیزبەکان بەختەوەرن بەم مۆدیلەی بازاڕ کە وێرانەیەکی گەورەی نرخو قۆڵبڕینو بێساحێبیەو بەزمەردەخەنەیەکی کوشندەوە ناویان لێناوە بازاڕی ئازاد، کۆمەڵگەش بەنیگەرانییەکی کوشندەوە گوێیان لێدەگرن.

دەرەنجام پرۆسەی بێساحێبی لەمجۆرە کۆمەڵگەیەدا پرۆسەیەکی درێژخایەنی بێباکیو کاولکردنی ژێرخانی کۆمەڵگەیە، هاوکات کۆمەڵگە نابێتە ساحێبی هیچ شتێك، بۆنمونە سەرلەبەری پێداویستییەکانی کۆمەڵگە لەفالینەیەکی عەلاگەوە بۆ بلورێکی چرا، لەجلوبەرگەوە بۆ هەموو ئامێرە کارەباییو ئەلیکترۆنییەکان، لەکارەبای ماڵانەوە بۆ سەرلەبەری پێداویستیەکانی ماڵ لەوڵاتانی دەرەوە دەهێنرێنو بەبێ کۆنترۆڵ گیرفانی کۆمەڵگە خاڵی دەکەنەوە، بەڵام گیرفانی بەرپرسو بازرگانو حیزبەکان پڕدەکەنەوە. بەواتاییەك ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی کوشندەیە بۆ بەرهەمهێنانی کۆمەڵگەیەکی بێساحێبو بێبەرهەمو بەکاربەرو وێران لەڕوی ئابورییەوە.

ئەم جۆرە کۆمەڵگەیە تەنها بێساحێب نیە لەڕووی ئابورییەوە، بەڵکە ئەم پرۆسەیە زیاتروزیاتر لەڕوی ژیانو گوزەرانەوە بێساحێبی دەکات، ئەم پرۆسەیە هەڵگری بەکرێچیکردنی تەواوی

---

ئەندامی رەخنەگریی حیزبیش هەیە، کە کۆمەڵێك کەسی نارەزاو قسەکەرو ڕخنە لەحیزبەکانیان دەگرن، ژمارەشیان زۆرە، بەڵام بەداخەوە حیسابیان بۆناکرێتو بەجدی گوێ لەراکانیان ناگیرێت[13] ئێمە کە ڕەخنە لەحیزبو دەسەڵات دەگرین رەخنەکانمان ئەوکەسە ڕخنەگرانەی ناوحیزب ناگرێتەوە.

هاوڵاتیانه، دەرەنجام نیوەی کۆمەڵگە دەبێتە کرێچیو نیوەکەی دیکە گرفتارو نیگەرانو کەمدەرامەتو دۆشداماو لەبەردەم بێدەسەڵاتیو خۆشباوەریو نائومێدیدا.

## پەرلەمانی بێساحێب

لەکۆمەڵگەی مۆدێرندا پەرلەمان گوێدەگرێتو بایەخ بە راجیاوازەکان دەدات، بەڵام لەو کۆمەڵگەیانەی کە دەسەڵاتێکی داخراو تیایدا سەروەرە پەرلەمان بێجگە لەکۆمەڵێك موچەخۆرو بێدەنگ هیچی تر نیین، پەرلەمان لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا مۆدێلێکی ناوازەو دەگمەنی پەرلەمانە، بۆنمونە ئەم پەرلەمانە ساڵی چەند جارێك کۆدەبنەوە، کەس خاوەنی ڕاو بۆچوونی خۆی نیە کە دەبێت هەڵقوڵاوی ڕەخنەو ناڕەزاییو پێشنیارەکانی خەڵك بێت، بەڵام بەپێچەوانەوە هەڵقوڵاوی بیرکردنەوەو هەڵوێستو مەزاجی حیزبەکانیانە، ئەگەر لەم جۆرە پەرلەمانەدا کەسانی دڵسۆزو ئەکادیمیو قسەکەرهەبن، بەڵام ژمارەیان زۆر کەمە، بەداخەوە حساب بۆ راوبۆچونە جیدییەکانیان ناکرێت، چەند رەخنەو پێشنیاری جوانیان هەبێت..بەڵام کە دەخرێتە دەنگدانەوە ڕاکانیان رەفزدەکرێت یان دوادەخرێت بۆ کاتێکی نادیار یان پشتگوێدەخرێت، هاوکات ئەم مۆدێلە دەگمەنەی پەرلەمان لەدونیادا خۆی ناکات بەساحێبی کێشەو گرفتو نیگەرانیو ناڕەزاییو بێزارییەکانی کۆمەڵگە، بۆنمونە لەبری ئەوەی هەزار ئیمزا بۆ چارەسەی کێشەیەك بڕواتە ژورە داخراوەکانیانەوە سەدان هەزار

ئیمزا بچێتە بەردەستیان..گرنگ نیەو هەر خۆشیان ناکەن بەساحێبی، ئیدی هاولاتیان خۆپیشاندان دەکەن، ماندەگرن، چالاکی مەدەنی ئەنجامدەدەن، نارەزایی دەردەبرن.. گرنگ نیە بەلایانەوە، گرینگ ئەوەیە تا ئەندام پەرلەمان بن چۆن بێدەنگی خۆیان بپارێزن، چۆن گوێنەگرن، چۆن وەلام نەدەنەوە، چۆن حیزب لێیان رازی بێت.

پشووی ئەم جۆرە پەرلەمانانە پشویەکی درێژە، هێندە زۆرە کە گەلاڵەکردنی هەزاران خەونی تیا جێدەبێتەوە، بەلام پەرلەمانێکی بێخەونە، هەر ئەندام پەرلەمانێکیش ببێتە خاوەن خەونەکەی لێدەکرنەوەو دەیخەنە ئەرشیفەوە، ئەمجۆرە پەرلەمانە بێدەنگترین جۆری پەرلەمانە لەدنیادا، خەوالوترین شوێنی دنیایە، پانتاییەکی گەورەی بەرهەمهێنانی نائومێدییە، سەرچاوەی زانیاریو کۆکردنەوەی دۆکۆمێنت دەگرێتەوە بۆ حیزب، بێجگە لەحیزب هیچ سەرچاوەیەکی زانیاریان نیە، ئەگەر چەند ئەندام پەرلەمانێکیش لەهەولی گورانو ریفورمدا بن، ئەوا روتینو خاوەخاوی پەرلەمان چەند ساڵێك لەبێنەوبەرەی بێباکیدا پرۆژەکانیان دەخەوێننو هەمووشتێك بەبیانووی لابەلاو مەزاجی رۆژانە دوادەخرێت.

## کۆمەڵگەی هیلاك و نائومێد

دەرەنجامی ئەو هەموو ناعەدالەتیو گەندەڵیو بێبایەخکردنانە، کۆمەلگەیەك بەرهەمدێت بێئەندازە هیلاك لەرووی ئابوریو سیاسیو فەرهەنگییەوە، کۆمەلگەیەك دەبێتە بەرهەمهێنەری لێشاوێك تاکەکەسی

نیگەران‌و نائومێد بەرامبەر ژیان‌و گۆڕانکاری‌و چالاکی، بێزار لەقسەکردن‌و ریفۆرم، بێباوەڕ بەرامبەر بەڵێنە وەهمییەکان‌و حیکایەتە دووبارەکان‌و سەروەرییە تۆزلێنیشتووەکانی رابردوو، دواجار دەبێتە بەرهەمهێنەری لێشاوێك لەئینسانی ناپەیوەست‌و ناپێبەند بە نیشتیمان‌و خاك‌و حیکایەتە گەورەکان، نابەرپرسیار بەرامبەر سەرلەبەری گۆڕانکارییە سیاسی‌و حکومی‌و ئابوورییەکان، بەڵام بەرپرسیار بەرامبەر بەخۆی، بێهودە لەنێوان مانەوەو سەفەرکردندا، بێباك‌و خەمسارد بەرامبەر هەڵبژاردن‌و دەنگدان‌و بۆنەو موناسەبە نەتەوەیی‌و حیزبی‌و نیشتیمانییەکان، هاوکات کۆمەڵگەی هیلاك دەبێتە خولقێنەری کۆمەڵگەیەکی شاراوەو پەراوێز لەناوخۆیدا، ئەم پانتاییە شاراوەیەش پڕ دەبێت لەمرۆڤی کەنارکەوتو و پەراوێزخراو، گەنجەکانی ئەم کۆمەڵگەیە هێندەی سەرقاڵی خەونەکان‌و پرۆژەکانی خۆیان دەبن هێندە بیر لەوە ناکەنەوە بۆ ساتێك گوێ لەحیکایەتەکان‌و سەروەرییەکان بگرن، بۆ هەناسەیەك بەشداری لەگۆڕانە سیاسییەکاندا بکەن.

ئەو هۆکارانەی لەپشت هیلاککردنی کۆمەڵگەوەن بریتین لە: ناعەدالەتییەکی بێمانا، نەمانی بەرپرسیارێتی، گەندەڵی‌و بەتاڵانبردنی سەروەت‌و سامانی نیشتیمانی، بەڵێنی درۆو بێبایەخکردنی قسەکردن‌و رەخنەکان، وەڵامنەدانەوەی دەسەڵات‌و سووککردنی رایگشتی، درۆکردن لەگەڵ جەماوەردا، نەبوونی میدیای ئازاد کە توانای بەدواداچوون‌و کەشفکردن‌و ئابڕوبرنی بەرپرس‌و وەزیرو سەرکردەکانی هەبێت، نەمانی سەروەری یاسا، بەهێزبوونی میلیشیاکان‌و لاوازبوونی هێزە مەدەنییەکانی کۆمەڵگە، نەبوونی ئۆپۆزسیۆن‌و زۆربوونی حیزبی بێئیش، ناعەدالەتی

لەموچەدا، موچەی بەرزی پیاوە نزیکەکانی دەسەلآتو حیزبو کەمی موچەی خاوەن بڕوانامەو خاوەن تواناکان، گرینگی نەدان بەگەنجو پشتگوێخستنی داواکاریو پێداویستیەکانیان، ناشەفافیەتو ئاگادارنەبون لەبودجەی ولآتو حیزبەکان، خەمساردیو بێگوێیی دەسەلآت بەرامبەر کێشەو داواکاریەکانی هاولآتیان، نەبوونی خزمەتگوزارییەکی شیاو بۆ هاولآتیان، پێشێلکردنی مافی مرۆڤو مافە مەدەنییەکانی هاولآتیان، ناعەدالەتی لەخۆشگوزەرانی بەرپرسەکان بەرامبەر نەبونی خۆشگوزەرانی بۆ هاولآتیان، سیستمی کۆنو وێرانی پەروەردەو فێرکردن، گرینگی نەدان بە فەرهەنگی مۆدێرنو هونەرو رۆشنبیری، گێڕانەوەی حیکایەتەکانو فرۆشتنەوەی سەروەریو یادەوەرییەکان بە هاولآتیان، بەلآم بە نرخێکی گران..تاد هەموو ئەمانە هۆکارگەلێکن بۆ بێبایەخکردنی ژیانو کۆمەلگە، بۆ وێرانکردنی کولتوری تێگەیشتنو گفتوگۆو گۆڕانکاریو خەونی مۆدێرن.

## رۆشنبیریی بێساحێب

لەمجۆرە کۆمەلگایانەدا هیچ شتێك جێی بایەخ نیە، ئەوەش گرفتێکی کوشندەی درێژخایەنی کۆمەلگەو دەسەلآتو حیزبو دامەزراوە فەرهەنگییەکانە، بەواتایەك گرنگ نیە لەم کۆمەلگایەدا چەند رۆمانی سەرکەوتو دەنوسرێت، چەند لێکۆلێنەوەو تۆێژینەوەی جیدی ئەنجام دەدرێت، چەند رەخنەی جیدی بلآودەبنەوە، چەند سەرنوسەری رۆژنامەی ئازاد بەپێی مەزاجی دەسەلآت دەدرێنە دادگا، گرنگ نیە چەند شاکاری ئەدەبیو فیکری

بەرهەمدێت، قسەکردنو ڕخنەگرتن جێی بایەخ نیە، تەنها جێی بایەخی خوێنەرانە: نەحکومەت..نە وەزارەتەکان نە دەزگا ڕۆشنبیرییەکان هیچ شتێکی جیدی جێی بایەخیان نیە.

ئەمجۆرە دەسەڵاتانە شەیدای نوسینێکن لێوانلێوبێت لەموجامەلە، شەیدای شیعریکن پڕبێت لەستایشو پیاهەڵدانو سەروەری، شەیدای ڕۆمانێکن پڕبێت لەحیکایەتەکانی خۆیانو لەموقەدەساتە وەهمیەکانی خۆیان، شەیدای دامەزراندی دەزگایەکی بەناو ڕۆشنبیرین ببێتە زمانحاڵی خۆیانو پارێزگاری لەناعەدالەتیو گەندەڵیو وێرانەییو کەلاوەکانی خۆیان بکات، شەیدای ڕۆشنبیرێکن ستایشکارو واعیزو خوتبەبێژی حیزبو حکومەت بێت، ڕەخنە نەگرێتو بەبالای ئەواندا هەڵبدات، دەم نەکاتەوە تەنها لەکاتی پاروە چەوەرەکانی حکومەتو دەسەلاتدا دەمبکاتەوە، ئەوان خوازیاری دروستکردنی سوپایەکن لەڕۆژنامەنوسی ترسنۆکو معاشخۆر، سوپایەك لەبەلێو سەرڕاوەشاندن، سوپایەك لەبێدەنگیو نابینا لەبەردەم ناعەدالەتیو گەدەڵییە گەورەکاندا، خەوتوو لەپێخەفی بێباکیو پیاهەڵدانو معاشی زۆرو ڕۆژنامەی ملەوەنو پاداشتو مەکرمەی سیحری.

ئیشوکاری بەناو ڕۆشنبیریی ئەمجۆرە حکومەتو دەسەلاتانە بریتییە لەفیستیڤاڵی ساختەو مەراسیمی چلەو ڕێزلێنانی وەهمی، کەرنەڤاڵی پارە سەرفکردنو گیرفان پڕکردن، بۆنەو موناسەبەی شەخسیو حیزبیو شکۆدارکردنی سەروەری پیاوە تەپتۆزلێنیشتوەکانی مێژوو، داوەتکردنی ڕۆشنبیرە خەوتوەکانی

ولاّته دوورەکانو رازاندنەوەی مێزی پێکەنینو هۆڵی پڕ لەستایشو چەپڵە ڕێزان، چاپکردنی کتێب بۆ پیاوە مردووەکان، سازدانی فیستیڤاڵی گەورە بۆ پیاوە شۆڕشگێرە وەهمییەکان، شەیدای چلەو تەعزێو مردنی ڕۆشنبیرەکانن بۆئەوەی کە مردن کتێبیان بۆ چاپبکەن بیکەن بە پیاوەتیو شەهامەت، بەلاّم بە زیندوویی کەس حیسابیان بۆ ناکاتو بگرە رقیشیان لێیانە، شەیدای دروستکردنی بلاك لیستن.. واتە لیستی رەش بۆئەو ڕۆشنبیرو ڕۆژنامەنوسو نوسەرانەی کە رەخنەیان لێگرتونو یان سەربەخۆن یان موچەی بێدەنگیو مەکرەمەی هیچ نەوتنو ستایش وەرناگرنو نابنە خوتبەبێژو زورناژەنی ئەوان، پاش دروستکردنی ئەو لیستەی کە ناویان لێناوە بلاك لیست هەڵدەستن بە هەڵوێستوەرگرتن بەرامبەریان، بۆنمونە کتێبیان بۆ چاپ ناکەن، بڕیاردەدەن چاوپێکەوتنی تەلەفیزیۆنیان لەگەڵدا نەکەن یان ئەگەر لەدەستیان دەرچوو بەرنامەکە دادەخەن یان کارەبای لێدەبڕن، تا پێیان بکرێت ناویان دەزڕێنن، هەڕەشەیان لێدەکەنو دژایەتیان دەکەن، هەوڵدەدەن بە هیچ شێوەیەك وەلاّمیان نەدەنەوە، لەو باوەڕەدان وەلاّمنەدانەوە لەسەلیقەو لوتبەرزییەوە هاتووە، بەلاّم لەجەهلو بێباکیو نامەعریفەتیو نەخوێندەوارییەکی کوشندەوە سەرچاوە دەگرێت.

لەکۆمەڵگەی بێساحێبدا وەزیر دەڵێت پارە نیە، پەرلەمانتار دەڵێت ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە، بەڕێوبەری گشتی دەڵێ کتێبەکەت بخەرە سەرەیەکی درێژخایەنی پڕ لەچاوەڕوانییو

بێهودەییەوە وەك سەرەی بەنزین، بێساحێبی‌و نابەرپرسیارێتی لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە گرینگ نیە لەمجۆرە کۆمەڵگایانەدا دەسەڵات‌و حیزبەکان لەکاتی هەڵبژاردن‌و بۆنەو موناسەبەکانیان دەیان ملیۆن سەرف بکەن بۆ لافیتەو ریکلام‌و پۆستەری دەموچاوی سەرکردەکایان لەکاتی زەردەخەنەو تریقانەوەدا، بەلاّم ناتوان شاکارێکی ئەدەبی‌و فیکری چاپبکەن‌و یان هەر نایکەن، گرینگ نیە لەسەروەختی شەڕی ناوخۆو یەکترخواردندا بودجەی وڵات تەرخانبکەن بۆ باروت‌و یەکترکوشتن، بەلاّم عەقڵی ئەوەیان نیە کتێبێك بۆ (ب.ع)یان بۆ(م.و)یان (ئا.ف)و (ر.ئە)و (ب.ح)و (ئا.پەری)و (کۆرش.ق)..چاپ بکەن.

شاگەشکە دەیانگرێت کۆنسێرتی گۆرانی بۆ کچە شۆخوشەنگەکانی دەرەوەی وڵات بگێرن‌و سەدان هەزار دۆلاری تیادا سەرفبکەن‌و لەریزی پێشەوەی هۆڵەکەدا بەدەموچاوێکی پڕ لەبەختەوەرییەوە دابنیشن بۆ گوێگرتن، بەلاّم پارەیان نیە بۆ پرۆژەی رۆشنبیری‌و هونەری‌و ئەو رۆشنبیرو هونەرمەندە جیدیانەی کە رەخنەیان لێدەگرن‌و ئاوێنەیەکیان بۆ دادەنێن تا روی گەشی ناعەدالەتی‌و گەندەڵی خۆیانی تیادا ببینن.

## ناعەدالەتی‌و گەندەڵی بێساحێب

سەرباری ئەوەی تەواوی کۆمەڵگە مافی ژیانێکی باشترو پێشکەوتنێکی گونجاوی هەیە لەخزمەتگوزارییەکی باشترو خۆشگوزەرانێکی شیاودا. تاکەکەسەکانی کۆمەڵگەش بەهەمان شێوە هەموو ئەو مافانەیان

بەردەکەوێت کە پێویستەو دەبێت لەلایەن حکومەتو ناوەندەکانەوە یاسایەکی یەکسانو عادیلانەی بۆ دابنرێتو بکرێتە سەرەتای دیموکراسیەتو پێشخستنی کۆمەڵگە.

بەڵام یەکێك لەو خەسڵەتە هەرە ناشرینانەی کۆمەڵگەو دەسەلاتی بێساحێب ئەوەیە بەردەوام سەروەریو حیکایەتەکانو ئەمنی قەومی بە گران دەفرۆشنەوە بە هاوڵاتیانو خۆیان دەکەن بە فریشتە، بەڵام روخساری ئاشکرای ئەو دەسەلاتانە بریتییە لەناعەدالەتییەکی بێمانا و بێبەرابەرو گەندەڵییەکی بێسەروبەریی تەمومژاوی، وەك ناعەدالەتی لەژیانو گوزەراندا، ناعەدالەتی لەداهاتی وڵاتدا، ناعەدالەتی لەبەرزی موچەی پیاوانی حیزبو دەسەلات بەرامبەر بە کەمی موچەی خاوەن بڕوانامەو رۆشنبیرانو پیشەوەرانو فەرمانبەرانو مامۆستایان، ناعەدالەتی لەخزمەتگوزاریو خۆشگوزەرانیدا، ناعەدالەتی لەپێداویستیو داواکاریدا.

ئەم کۆمەڵگەیە واتە کۆمەڵگەی بێساحێب بەرهەمهێنەری سوپایەك دیکتاتۆری نەخوێندەوارو بچوکە، بەڵام بەرهەمهێنەری لێشاوێك لەهاوڵاتی نیگەرانو بێئومێدە، بەرهەمهێنەری کاولکردنی کۆمەڵگەیە لەڕێی ناعەدالەتیو گەندەڵیو رۆتینەوە، هاوکات بەرهەمهێنەری دەوڵەمەندبوونو زەنگینبوونی سەرکردەو حاشیەو بەرپرسو خوتبەبێژە بێسەلیقەو ستایشکارو مەکرەمە خۆرەکانە.

ئائەمەیە کۆمەڵگەی بێساحێبو کە کۆمەڵگەیەکە پڕە لەناعەدالەتیو گەندەڵیو کەسیش خۆی ناکات بەساحێبی، پڕە

لەبێدەنگیو بێبایەخیو کەسیش نابێت بە ساحێبی، پڕە لەکەلاوەو گرانیو وێرانەیی، بەلاّم بێساحەبترین کۆمەلگەی دونیایە.

کۆمەلگەی پڕ لەکێشەو گرفتە، کۆمەلگەیەکە سەرگردان لەرووی ئابوریو سیاسیو بازارو حکومەتو دەسەلاّتو پەرلەمانو بەڕێوەبردنەوە، کۆمەلگەی بێبایەخکردنی قسەکردنو رەخنەو روانینی جیاوازە، کۆمەلگەی خۆشباوەڕی، دەسەلاّتی بەختەوەر، کۆمەلگەی بیساحێب تەنها خاوەنی نابەرپرسیارترینو ناعادیلترین دەسەلاّتە لەدونیادا.

# درۆزنترین حکومەتی دنیا

"رەخنە، هەمیشە، سەرەتاکانی ئاخاوتنێکی دیکە، دادەمەزرێنێت"ئەدۆنیس

لێرەدا باس لەحکومەتێکی دیاریکراو ناکەین، بەلاّم باس لەهەموو ئەو حکومەتانە دەکەین کە ئەم نوسینە دەیانگرێتەوە.

سەرەتای ئەم نوسینە بەم پرسیارە دەستپێدەکات: درۆزن کێیە؟ .. درۆزن ئەو کەسەیە کە درۆدەکاتو زۆر بەسادەیە راستگۆ نیە، هاوکات بەلاشییەوە ئاساییە، بەلێن دەداتو نایباتە سەر، دەڵێ ئەمە دەکەمو وائەکەمو ئەوە جێبەجێ دەکەم، بەلاّم وانییەو بەلێنەکانی خۆی ناباتە سەر.

کەواتە حکومەتی درۆزن چۆنە؟ چ جۆرێکە لەحکومەت، چ مۆدێلێکە..؟ پێویستە لێرەدا زۆر بەراشکاویو زۆر بەسادەیی باس لەم جۆرە حکومەتە بکەین.. حکومەتی درۆزن پێکهاتەیەکی ئاڵۆزترو قەرەباڵەغتری هەیە، لەچاو حکومەتەکانی دیکەدا، بۆنمونە وەزیرەکانی

زیاترن‌و بەلام بێ ئیشترن، هێندەی قسەدەکەن، هێندە ئیش ناکەن، هێندەی رقیان لەیەکترییە، هێندە بیرناکەنەوە، هێندەی قسەکەرێکی بێبەرنامەو بێئاگان، هێندە قسەکەرێکی ئەکادیمی‌و پرۆگرامی نیین، سەرچاوەی زانیاری ئەوان تەنها مەرجەعیەتی حیزبەو هیچی تر، فریان بەهیچ داتایەك‌و راپرسییەك‌و تارێکی رەخنەیی‌و میدیای ئازادەوە نیە، زوربەیان هێندەی خوێنەرێکی خراپی رۆژنامە حەزینەکانی حیزبەکەی خۆیانن، بەهیچ شێوەیەك ئاگایان لەدنیای مۆدێرن‌و گۆڕانکاری‌و لێکۆڵینەووەو دنیابینی‌و روانینە جیاوازەکان نیە، هێندەی کاردەکەن بۆ بەخێوکردنی رق‌و بێزارکردنی یەکتری‌و پۆلێنکردنی دوژمنەکانیان، هێندە روانینیان ناگاتە دەرەوەی ژوورەکانی خۆیان، هیوایەتیان کۆبوونەوەی تێروتەسەل لەخواردن خەو و حەسانەوەیە، هەر لەخۆیانەوە رقیان لە رۆژنامەنوسان‌و نوسەرە جیدی‌و سەربەخۆکانە، جارێکی تریش هەر لەخۆیانەووە رقیان لەخۆپیشاندان‌و نارەزایی خەڵك‌و رەخنەو مانگرتن‌و ئیمزاکۆکردنەوەو چالاکی مەدەنی‌و پێکەنین‌و زەردەخەنەی هاولاتیانە.

هاوکات پێکهاتەیەکی دیکەی ئەمجۆرە حکومەتە پەرلەمانە، بەلام لەحکومەوتی درۆزندا پەرلەمان شتێکی دیکەو مەهامێکی دیکەی هەیە، یەکەمین مەهامی ئەم پەرلەمانە بێدەنگی‌و قسەنەکردن‌و هیچ نەوتنە، دوەمین مەهامی گوێنەگرتن‌و بێئاگاییە، سێیەمین مەهامی کۆبونەوەی بەتاڵە لەبڕیارو گۆڕانکاری، بەلام پڕە لەموجامەلەی یەکتری‌و یەکتر ناسین، هیوایەتی یەکەمیان زیادکردنی موچەی خۆیانەو زیادکردنی نەسریەی‌و بڕێ پارە بۆ مەترسییەکان‌و حەسانە، لەم مۆدێلە ناشرینەی حکومەتدا پەرلەمان لەژێر دەسەلاتی موتلەقی حیزب‌و بەرەکەت‌و مەکرەمەی

حیزبدایە، هاوکات گرینگ نیە چەند ئەندام پەرلەمان لەکاتی کۆبونەوە ئاشکراو نهێنییەکاندا خەویان لێدەکەوێت یان بێئەندازە باوێشك دەدەن یان نا، هەروەها ئەم جۆرە لەپەرلەمان عوتلەی زۆرو رۆژانی پشوی بێشومار سەرقالی کردوون، بەڵێن دەدەن و دواتر وەڵامی هاولاتیان نادەنەوە، ئەمرۆ لیژنە دروستدەکەن و سبەینێ هەڵیدەوەشێننەوە.

ئەندام پەرلەمانەکان کیسەڵیان زۆر خۆشدەوێت، کە دەبن بە ئەندام پەرلەمان بەر لەسوێندخواردن هەر یەکەیان وەك وەزیرەکان پاکێجێکی رەنگاورەنگ لەسەر ژیان و بەخێوکردنی کیسەڵیان دەدەنێ و بەچکە کیسەڵەکیشیان پێدەبەخشن وەك دیاری حکومەت، هاوکات ئەم کیسەلانەش لەسەر نەسرییەی حکومەت بەخێودەکرێن نەوەك لەسەر موچەی خۆیان.

ئەو ولاتانەی کە حکومەتێکی درۆزن دەیبات بەرێوە، ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندیانەی هەیە: بەردەوام بەڵێن بە خەڵك دەدەن و نایبەنە سەر، هیوایەتیان ئەوەیە سەرجەم هاولاتیان بەشەداری هەڵبژاردنەکان بکەن و دەنگیایان بۆ بدەن، بەر لە هەڵبژاردنەکان بەچاکەت و پانتۆڵی شەرابییەوە بە بۆینباخی پڕ لەگوڵ و یاسەمینەوە، بە کراسی ئەرخەوانییەوە دێنە سەر تەلەفیزیۆن و بەڵێنی جۆراوجۆرو بریقەدارو ژیانبەخش دەدەن بە هاولاتیان، وەك باشترکردنی خزمەتگوزاری، خۆشگوزەرانی بۆ هاولاتیان، کردنەوەی هەزاران هۆبەی نیشتەجێبون و چارەسەرکردنی کێشەی نیشتەجێبون، هەرزانکردنی تەماتە، بەخۆرایکردنی سێو، هێنانی پرتەقاڵ لە بەهەشتەوە، راکێشانی ئاوی زەمزەم بۆ ماڵەکان، دابەشکردنی چراو فانۆس لەرێی بایەعییەوە،

دابەشکردنی باوەشێن لەڕێی موختاری گەڕەکەکانەوە، هێنانی هێڵی شەمەندەفەر بۆ بەردەرگای هەموو ماڵێك، دابینکردنی پاسکیلی سیاحی بۆ گەنجەکان، جێبەجێکردنی پڕۆژەی موعەلەب بۆ گەنجان، دابەشکردنی ئەستێرە بەسەر ماڵەکانی شاردا بۆئەوەی شار بەردەوام روناك بێت، دانانی بەلوعەی نەوتو بەنزینو غاز لەگەڕەکەکاندا، ....هەروەها.

بەلآم دوای هەڵبژاردن، هیچ کام لەم شتانە جێبەجێناکەنو گوێ لەکەس ناگرنو وەلآمی کەسیش نادەنەوە.

زۆر باس لەدیموکراسی دەکەن، بەلآم فریان بەسەر دیموکراسیەتو مافی مرۆڤو کۆمەڵگەی مەدەنیو لیبرالیەتو بازاڕی ئازادو دنیای مۆدێرنەوە نیە، نە بەرنامەیان هەیە بۆ باشترکردنی ژیانو گوزەرانی خەڵك نە بەرنامەشیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، دەتوانین بەمجۆرە حکومەتە بڵێین حکومەتی قەزاوقەدەر، واتە لەڕێی قەزاوقەدەرێکی ئیلاهیو رێکەوتنەکانەوە دەبن بە حکومەتو دەسەلآت بەڕێوەدەبەن.

شەفافیەت نەك هەر نیە، بەڵکە کەس نازانێت بودجەو داهاتی دەوڵەت چەندەو بۆچی خەرج دەکرێتو بۆچی بەکاردەهێنرێت. کەس لەتوانایدا نیە دەسەلآتی موتڵەقی حیزبو هەژمونەکانی لەحکومەتو پەرلەمان جیابکاتەوە، ئەوەی حیزب پێی باشە حکومەتیش پێی باشە، ئەوەی هاولآتیان پێیان باشە حیزبو حکومەت پێیان خراپە، ئەوەی هاولآتی بیری لێدەکاتەوە حکومەت بیری لێناکاتەوە.

بارودۆخی هاولاَتیان لەسایەی ئەم جۆرە حکومەتەدا بەم جۆرەیە: داهاتی مانگانەو ساڵانەی تاکەس لەئاستی سفری ژیاندایە، چونکە ناتوانێت قرشێکی لێ پاشەکەوت بکات، گرفتاری دنیایەك کێشەی سەخیفە، وەك کێشەی نەبونی خزمەتگوزارییە پێویستەکان، کێشەی نیشتەجێبون، گرانیو بەرەڵایی بازاڕەکان، لەکاتێکدا ئاستی خزمەتگوزاری لەو ولاَتانەدا کە خاوەنی ئەمجۆرە حکومەتەن لەئاستی سفرو خوارتردایە، ئاستی مۆدێرنی مەنهەجی خوێندن نەگەیشتۆتە سفر، ئەوە ئاستی خۆشگوزەرانی کۆمەلاَیەتیو مرۆیی نەك هەر سفرە بگرە هەر نیە تا ئاستی هەبێت.

ئەو ناعەدالەتیە ناشرینەی کە لەژێر سایەی حکومەتێکی دروزندا لەئارادایە، ناعەدالەتییەکی بێماناو قێزەوەنە، بەواتایەك ناعەدالەتییەکە لەهەمو روویەكو پانتاییەکدا، وەك ناعەدالەتی لەموچەدا کە لە95٪ی هاولاَتیان چەندینجار لەخوار بژێوی ژیانیانەوەیە، بەلاَم لە 5٪ی مرۆڤەکان کە وەزیرو پەرلەمانتارو سەرۆکی حکومەتو جێگرو رێگرو موستەشارو بەرپرسو پیاوماقوڵو خاوەن کۆمپانیاکانی ناو حیزبو پیاوی حکومەتو حیزب سەدان قات لەسەرو هاولاَتیانەوە موچەو نەسریەی سیحریو مەکرەمەی بەختەوەری وەردەگرن.

چەوسانەوەی ئابوری لەم جۆرە کۆمەڵگەیەدایە، چەوسانەوەیەکی ناشرینو بێئەندازە قێزەونە، لەسەردەمی دیکتاتۆرەکاندا دەسەلاَت بەهەموو هەژموونی خۆیو دنیابینی خۆییەوە مرۆڤەکان لەرێی چەوسانەوەی سیاسیو فەرهەنگیو ئابورییەوە وێرانبکات، هەرچەندە

دەسەڵاتە نامۆدێرن و جاهیلەکانیش بەهەمان ئاڕاستە کاردەکەن بەڵام خراپترو وێرانتر دەکارن مرۆڤەکان لەخراپترین چەوسانەوەدا ژیان و گوزەرانیان وێرانبکەن، لەراستیدا چەوسانەوە هەر چەوسانەوەیە، ئەو چەوسانەوەیەی کە دیکتاتۆرەکان ئەنجامی دەدەن هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ ئەو چەوسانەوە ئابورییەی کە حکومەتە نادیموکرات و ناعادیلەکان ئەنجامیدەدەن.

ستراتیژی چەوسانەوەی ئابوری وێرانکردنی دەروون و سایکۆلۆژیای مرۆڤی لەپشتەوەیە، کاتێك تۆی مرۆڤ لەڕووی ئابورییەوە دەچەوسێیتەوە بارودۆخی دەروونیشت وێران دەبێت و پتر نیگەران و نائومێدو تورە دەبیت(بەداخەوە ئەم تێزە هیچ سەرکردەیەك و هیچ وەزیرێك و هیچ پەرلەمانتارێکی تەقلیدی نایزانن)، هاوکات تا چەوسانەوەی ئابوریت لەسەر بێت کێشە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانت هێدی هێدی کەڵەکە دەبن و لەڕووی فەرهەنگی و شارستانییەوە وێران دەبیت، هاوکات ئاستی کاریگەری و ئەکتیڤبوونی فەرهەنگی مرۆڤەکان دەگاتە بنبەست و داخرانی کولتوری.

لەراستیدا ناشیرنترین مۆدێلی چەوسانەوە، چەوسانەوەی ئابورییە.

## رایشگتی و نارەزایی هاوڵاتیان

ئەوەی لەژێرپێی ئەم مۆدێلەی حکومڕانییەدایە، رایگشتی و میدیای ئازادو رەخنەو نارەزایی هاوڵاتیانە، هەر حکومەتێکیش بەم شێوازە بیریکردەوە ئەوا دەسەڵاتێکی کۆنکرێتی و نافەرهەنگی و ناشارستانییە.

جەهلی ئەوان بە دیموکراسیو دنیای مۆدێرن لەئاستێکی کوشندەدایە، کۆمەڵێك موچەخۆری دەوڵەمەندنو فریان بەدنیاوە نەماوە، کاتێکیش نوسەرە جیدیو سەربەخۆکان رەخنەیان لێدەگرن، پیاوانی حیزبو حکومەت لەوپەڕی جەهلی خۆیانەوە دەڵێن ئێمە عەفوی عاممان بۆ هەموو کەسێك دەرکردووە کە رەخنەمان لێدەگرن، ئەم وتەیە قسەی سەدام حسێنە، بەڵام تائێستاکە هەندێك بەرپرسو سەرۆكو راوێژکارە بێئیشو بێ راوێژەکان بەکاریدەهێنن.

هەروەها کاتێك هاوڵاتیان نارەزایی دەردەبڕنو بەشێوەیەکی شارستانی داوای مافە هەرە سەرەتاییەکانی خۆیان دەکەن، پێیان دەڵێن گێرەشێوێن، تابوری پێنج، دەستی لەپشتەوەیە، خەتەرن بۆ سەر ئەمنی قەومی، لەبەرئەوە پێویستە بەرلەوەی گوێیان لێبگیرێت زەبروزەنگ بەرامبەریان بەکاربهێنرێت، واتە بەر لەخۆپیشاندان بیانگرینو لەکاتی خۆپیشاندانیشدا تەقەیان لێبکرێتو بیانترسێنینو لێیان بدەینو بە پۆشاکی مەدەنییەوە خۆمان بکەین بەناویانداو قۆڵبەستیان بکەینو فڕێیان بدەینە بەندیخانەکانو لێیان نەپرسینەوە، ئەم شێوازی مامەڵەکردنە لەسەردەمی ستالینو هێتلەرو مۆسۆلۆنیو بینۆشێو سەدام حوسەینەوە بە میرات بۆ سەرجەم ئەو دەسەڵاتە جاهیلو نافەرهەنگیو داخراوانە ماوەتەوەو تائەوڕۆکە کاری پێدەکرێت، لەکاتێکدا کولتورێکی ناشیرنی ناشارستانیو دیکتاتۆریانەیە.

# حکومەت تۆڵە دەکاتەوە لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی

"کەسێك کە دەست لەچارەنوسی ئەوانیتر وەردەدات،
هەرگیز چارەنوسی خۆی نادۆزێتەوە."پاولۆ کۆیلیۆ

لەم پارچە خاکەدا لەنێوان هاولاٌتیانو دەسەلاٌتدا شتێك لەئارادا نەماوە بەناوی پەیوەندیو متمانەو دڵنیایی، دەسەلاٌتی کورد لە سەرۆك کۆمارەوە بۆ سەرۆکی هەرێمو لەوێوە بۆ سەرۆکی حکومەتو جێگرەکەیو پەرلەمانو ئەنجومەنی وەزیران، دەسەلاٌتێکی بێئاگاو کەمتەرخەمو بێباکن بەرامبەر هاولاٌتیانو داواکاریو پێشنیارو رەخنەو بۆچونەکانیان، هاوکات دەسەلاٌتێکە بێئەندازە گوێی خنیوە بەرامبەر رەخنەو بۆچونەکانی رۆشنبیرانو رەخنەگرە سەربەخۆکان، بەداخەوە ئەمەش بۆخۆی کاریگەرییەکی خراپی کردۆتە سەر تێگەیشتنی حکومەتو دەزگاکانی لەهاولاٌتیانو بێباکیو نابەرپرسیارێتی دەسەلاٌت بەرامبەر کێشە ئابوریو شارستانیو فەرهەنگیو هەنوکەییەکانی هاولاٌتیان.

وەك مەریوان وریا قانع دەڵێت: کاری ئەم حکومەتو حیزبانە بێبایەخکردنی قسەکردنە، ...منیش دەڵێم ئەو دەسەڵاتانەی کە قسەکردنو رەخنە لەلایەن بێبایەخە دەسەڵاتگەلێکی بێبایەخنو فرپیان بەدنیای مۆدێرنو مەعریفەو شارستانیەتەوە نەماوە.

ئاشکرایە لەسەروەختی خۆپیشاندانەکانی شاروشارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان پێویستییەکی شارستانی لەئارادابوو بۆ دروستکردنی کەمپەینێك بۆ داکۆکیکردن لەداخوازییە رەواکانی هاولاتیانو رەخنەگرتن لەحکومەتو دەزگا نهێنییەکان بۆئەوەی چیتر مافی مرۆڤو مافە مەدەنییەکانی هاولاتیان پێشێل نەکەنو حساب بۆ رایگشتیو رەخنەو داواکارییەکانی هاولاتیان بکەنو بەرێزەوە گوێیان لێبگرنو هەر بەرێزەوە وەلامیان بدەنەوە، لەبەرئەوە سەرەتا چەند رێکخراو و گروپی فشار کە پێکهاتبوون لە(رێکخراوی ئاسودە، گروپی رەخنە، رێکخراویDHRD، رێکخراوی راسان، رێکخراویLCDO، رێکخراوی گەشەپیدانی کۆمەلایەتی) کەمپەینێکیان بەناوی کەمپەینی رایگشتییەوە دروستکرد، هاوکات پاش گفتوگۆکردن لەگەڵ رێکخراوەکانی تردا ژمارەی ریکخراوەکانی ناو کەمپەینەکە زیادیکرد بوو بە (18) رێکخراوی کۆمەلگەی مەدەنی، ئەم کەمپەینە چەندین رۆشنبیرو رۆژنامەنوسو هونەرمەندو مرۆڤدۆستی لەناوەو دەرەوەی ولات کردبە هاوپشتیوانی خۆیو بەرگریان لەمافە رەواکانی هاولاتیان دەکرد، هاوکات کەمپەینەکە سەردانی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیان کردو سەردانی وەزیری ناوخۆیان کردو سەردانی زووربەی

گرتوخانەکانیان کردو لەنزیکەوە ئاگاداری رەوشی زیندانییەکان بوونو فشارێکی مەدەنیمان دروستکرد بۆ ئازادکردنی گیراوەکان، هاوکات ئەم کەمپەینە دەقاودەق داواکاریو نارەزایی هاولاتیانی گەیاندە حکومەتو رەخنەی جیدی لەحکومەتو هێزەکانی ناوخۆ گرت.

لەراستیدا ئەمە ئەرکێکی سەرشانی رێکخراوەکانی کۆمەلگەی مەدەنییە، من کە بخۆم لەیەکێك لەو رێکخراوانەدا کاردەکەمو دۆستو هاوریی هەموویانم، بەلام ئێستاکە من وەك خۆم رەخنە دەگرم، واتە وەك ئاسۆ جەبار، بەداخەوە حکومەت بەشێوازێکی زۆر ناشارستانی بیردەکاتەوەو بریاردەدات، لەبەرئەوە ئەم حکومەتە پێیوایە نابێت کەس نارەزایی هەبێت، پێویستە هاولاتیان شوکور بن بەبەشی خواو کەس ورتەی لێوە نەیەت، ئەوەی ورتەشی لێوەهات سزا بدرێت، لەراستیدا جێگری حکومەت پاش ئەوەی ئەحبابەکانی بۆی دەگێرنەوە کە کێبوون ئەو رێکخراوانەی کە بەشداری کەمپەینەکەیان کردووە هەلدەستێت بەبرینی منحەی پێنج لەو رێکخراوانە کە پارەیەکی کەمیشە کە دابینکراوە بۆ لایەنی کەمی کرێی خانووی رێکخراوەکان. ..بروانە ئەم بریارە ناشرینو هەزیلەی جێگری حکومەتو وەزارەتی هەرێم بۆ کاروباری داراییو ئابوری، کە لە نوسراوەکەی وەزارەتی هەرێم بۆ کاروباری داراییو ئابوریدا هاتووە: "تکایە بۆ بەردەوامبوونی منحەکانتان سەردانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بکەن بۆ بریاردان لەسەری"، ئەم بیرکردنەوەی حکومەت ئەوپەری قوربەسەریو نەگبەتییە کە پێی

وایه ئەوەی رەخنەی لێدەگرێت دوژمنێتیو پێویستە وەك بەڕێز (فەتاح زاخۆیی/و. رۆشنبیری پێشوو)لەسەر کار لایبەرنو وەك رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی(بەتایبەتی: وەك رێکخراوی ئاسودە، سەنتەری پەرەپێدانی دیموکراسیو مافی مرۆڤ، رێکخراوی ژیانی نوێ، رێکخراوی راسان، رێکخراوی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی.) منحەکانیان ببڕێت،... ئافەرین حکومەت بۆخۆتو بیکردنەوەو بڕیارت، بەڕاستی ئازاو بەجەرگی، هیوایەتت ئەوەیە کەس ناڕازایی نەبێتو کەس رەخنە لەئیشە جوانەکانت نەگرێت، بەلام ئەم بیرکردنەوەیە زۆر کۆنە بەڕێز، هیواداریـن رۆژێك لەڕۆژان بایی دینارێك لەو موچە بێسنورەی تە مانگانە وەریدەگرن بە حەزینی مۆدێرنانە بیربکەنەوە، بەڕاستی حکومەتێکی کەئیبو حەزینیت.

بەلام کاتێك حکومەتو حیزبو بەرپرسەکان هەرگیز بیریان ناکەوێتەوە کە زۆر ناعادیلو کەمتەرخەمن بەرامبەر هاوڵاتیانو پێشێلکردنی مافە مەدەنییەکانیان، بەداخەوە یەکڕا بیر لەوە دەکەنەوە تۆڵە لەهاوڵاتیانو ئەو ناوەندە ناڕازیانە بکەنەوەو سزایان بدەن. بەداخەوە کاتێك دەبینن هاوڵاتیانو رەخنەگران رەخنەو ناڕەزاییو روانینو دنیابینییەکی جیاوازیان هەیە، یەکڕا دەزگا نهێنییەکانیانو ئینشانوسو راپۆرتنوسەکانیان داوەت دەکەنو پاش نانخواردنێکی تێروتەسەل لێیان دەپرسن: ئەوانە کێبوون رەخنەیان لەئێمە دەگرت، ناوی سیانیان چییە، پیشەیان چییە، چۆن بیردەکەنەوە، خەون بەچییەوە دەبینن، ژمارەی ماڵەکانیان چەندە، لەچ رێکخراوێك یان شوێنێك کاردەکەن، بۆ چ رۆژنامەیەك دەنوسن،

موچەخۆری حکومەتن، حیزبین یان سەربەخۆن، چیان بەرامبەر بکەین، ئێمە پێمانوایە ئەگەر کاری حکومیان هەیە با لەسەرکار لایان بەرین، ئەگەر نوسەرن با کتێبیان بۆ چاپ نەکەینو هەوڵبدەین بیانکەین بە پیاوی خۆمان، ئەگەر رێکخراوە سەربەخۆکانن با ئەو منحە بچوکەی هەشیانە لێیان ببڕینو خانوی کرێیان دەستنەکەوێت بۆئەوەی چیتر رەخنە نەگرنو بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە(لەکاتێکدا کۆمەڵێك رێکخراو هەن کۆشكو تەلاریان بۆ دروست دەکەنو نەسرییەی سیحریان دەدەنێ، بەڵام پاشکۆی خۆیانو هوتافکێشی دەسەڵاتو حیزبن).

ئەو دەسەڵاتە داخراوەی کە زادەی نادنیابینییەکانی کۆمەڵگە داخراوەکانە، دەسەڵاتێکە بەتاڵە لەهەر گۆڕانکارییەكو وەرچەرخانێکی مۆدێرن، بەڵام پڕە لەدووبارەکردنەوەی خۆیو دۆگماکردنی ژیان، دەسەڵاتێکە پڕە لەموقەدەساتی ساختە، بەڵام بەتاڵە لەهەر روانینێك لەدەرەوەی دنیای داخراوی لۆکاڵەیتو زادگەخوازیو نەتەوەپەرستیو تایەفەخوازیو مەزهەبخوازی، واتە لێوانلێوە لەو جەهلە، دەسەڵاتێکە دەکەوێتە نێو کلێشەسازییەکی یەکپارچەوە، بەواتایەك دەبێتە ماشێنێکی بچوك بۆ بەرهەمهێنانەوەی خۆیو داگیرکردنی پانتاییەکانی دەرەوەی خۆی. ئەو دەسەڵاتە بۆئەوەی بەردەوام هەستی بەتاڵبوونەوە لەخۆیدا بکوژێت، بەردەوام لەهەوڵی گێڕانەوەی حیکایەتەکانو دۆزینەوەی فیگەرە پیرۆزەکانە بۆ هێشتنەوەی هەموان لەحیکایەتێکی گەورەی هاوبەشدا، ئەو بۆئەوەی لەتاکەیەك حیکایەتدا تەواو نەبێت،

بــەردەوام لەهــەوڵی بەرهــەمهێنانی حیکایــەتی بــچوکدایە، ئــەو دەســـەڵاتەی پــڕە لەموقەدەســـاتو بەتاڵــە لــەدنیای مــۆدێرن، دەسەڵاتێکی دۆگماو بێ بەرهەمو وێرانە لەڕووی مەعریفییەوە، ئەو دەسەڵاتەی کە ناتوانێت خـۆی فرێبداتـە نێـو خولیاکانی مرۆڤـەوەو کلێشەیەکی نویێ بۆ بایەخـدان بـەمرۆڤ بەرهـەمبهێنێت دەسـەڵاتێکە تـەنها بـۆ حیکایەتـەکانی خـۆی دەژیو دەبێتـە ماشـێنێکی گـەورەی بەرهەمهێنانی دۆگمایی‌و ناعەدالەتی‌و خۆدووبارەکردنەوەی بێماناو ناتەندروستو ناشارستانی.

لەهــەموو دنیــادا ڕێپێــوانو خۆپیــشانداندو نــاڕەزایی دەربــڕین کۆمەڵە مافێکی مەدەنی‌و ئینسانی مرۆڤەکانە لەهـەر کوێیـەك بـنو سـەر بــە هــەر مەملەکــەتێك بــن، هــەموو کەســێکیش ئــازادە لــە دەربڕینی راوبۆچونو رەخنەکانی خۆی، هەر دەسەڵاتێکیش رێ لەم مافانە بگرێت بەرلـەوەی دەسـەڵاتێکی دیکتـاتۆری بێـت دەسـەڵاتێکی سونەتی‌و نـادیموکراتی‌و نامرۆییـەو تاسەرئێـسك شـەرمەزار دەبێـت بەرامبەر کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی‌و خودی هاوڵاتیان.

ئــەو دەسەڵاتانەشــی کــە لــەڕێی پــۆلیسو ئاســایشو دەزگــا نهێنییەکانی حیزبەوە سـوکایەتی بـە مـرۆڤو شـکۆی ئینـسانەکانەوە دەکەنو پەلاماریان دەدەنو جوێنیان پێدەدەنو تەقـەیان لێدەکەنو نایـەڵن ڕێپێـوانو خۆپیـشاندان سـازبدەن دەسـەڵاتگەلێکی بێئاگـاو نادیموکراتنو فرپیان بەسەر دیموکراسی‌و ژیانی مۆدێرنەوە نیە، ئەو دەسـەڵاتانە لـەوەش تێناگـەن ئـەرکی پـۆلیس واتـە پاراسـتنی ژیـانی مـەدەنی هاوڵاتیـانو ڕێزگـرتن لەشـکۆو حورمـەتی ئینـسان نـەوەك

پەلاماردانو سوکایەتیکردن بە مرۆڤو تەقەکردن لەهاولاتیان.

دەرەنجام ئەو دەسەڵاتانە بە خۆیانو دامودەزگا پۆلیسیەکانیانەوە لەچەهلێکی کوشندەدا دەژینو دەبن بە دیکتاتۆر.

لەبەیاننامەی یەکەمی کەمپەینەکەدا ئەم چەند دێڕە دەخوێنینەوە:

دیموکراسیەت واتە گوێگرتن لەرایگشتیو قبوڵکردنی جیاوازییو گرنگیدان بەمرۆڤ، بەپێچەوانەشەوە نادیموکراسیەت واتە گوێنەگرتن لەرایگشتیو بەکارهێنانی زەبروزەنگ دژی هاولاتیان.

ئاشکرایە کە لەماوەی پێشوداو تائەورۆکە چەندین خۆپیشاندانو نارەزایی هاولاتیان لەشار و شارۆچکەکانی کوردستان ئەنجام دراوە، هەر لە خۆپیشاندانی شاری کەلارەوە بۆ سوتاندنی بەنزینخانەکانی ئاکرێ و دواتر سوتاندنی مۆنۆمێنتی شەهیدانی هەڵەبجەو نارەزایی ئەو شارەو خۆپیشاندانی کفریو چەمچەماڵو دەربەندیخانو ناحیەی شۆڕش پێکەوە تەقینەوەی دەنگی نارەزاییو بێزاری هاولاتیان بوو بەرامبەر بە سەرەتاییترین مافی ژیانیان لە کەمی کارەباو ئاو و کێشەی نیشتەجێبوونو کەمی خزمەتگوزارییو گرانی بازاڕو ناعەدالەتیو گەندەڵیو بێکاری، هاوکات گوێنەگرتنو خەمساردی دەسەڵاتو پەرلەمانو حکومەت بەرامبەر خواستو داواکارییەکانی هاولاتیان، سەرباری وەلامنەدانەوەی حکومەت.. هێزەکانی پۆلیسو ئاسایش بە شێوەیەکی زۆر ناشارستانیو نامەدەنیانە لەهەموو ئەو شوێنانە بەگوللەو شەقو زللەو چەندین شێوازی دیکەی بەکارهێنانی توندوتیژی مامەڵەیان لەگەڵ

هاوڵاتیاندا کردووه کە لەدەرئەنجامی ئەم مامەڵە ناشارستانییەی حکومەتو دەزگاکانیدا تائەوڕۆکە چەند کوژراو و بریندارو گیراو و کەمئەندامی لێ کەوتۆتەوە..

بۆیە ئێمە وەك کۆمەڵێك گروپو ڕێکخراوی مەدەنیو ناحکومی سەرباری نارەزاییمان بەرامبەر شێوازی توندوتیژانەی مامەڵەکردنی حکومەت لەگەڵ هاوڵاتیاندا، هاوکات پشتیوانی خۆشمان ڕادەگەیەنین بۆ نارەزاییو داواکارییەکانی هاوڵاتیان لەسەرجەم شارو شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان..

لەبەرئەوە داواکارین لەرێی ئەم بانگەوازەوە بەهەماهەنگیو بە پشتیوانی هەموولایەك کەمپەینێکی شارستانی دروستبکەین بۆ بەدەنگەوەهاتنی نارەزاییو داواکارییەکانی هاوڵاتیانو لێپرسینەوەو لێپێچینەوە لەحکومەتو دەزگاکانی لەبەکارهێنانی توندوتیژیو تەقەکردن لەخۆپیشاندەرانو هاوکات بە هەمومان هەوڵبدەین حکومەتو دەزگاکانی پاشگەز بکەینەوە لەکارە ناشارستانییەکانی کە بریتین لەگوێنەگرتنو خەمساردیو وەڵامنەدانەوەی داواکارییە هەرە رەواکانی هاوڵاتیانو بەکارهێنانی زەبروزەنگو کوشتنو گرتنو تەقەکردن لەخۆپیشاندەران.

لەراستیدا ئەم بەیاننامەیە بێجگە لەکۆمەڵێك رەخنەی دروستو واقیعی لەدەسەڵات هیچ شتێکی تیادا نیە تا حکومەت لێی بترسێت، هاوکات ئەم کەمپەینە ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی نیە تا رۆژێك لەرۆژان بێتە سەر حوکمو جێگە بەو برادەرانە لێژ بکات، کەس باسی حکومەت روخاندنیشی نەکردووە، وەك هەندێك لەئێوە

بیری لێدەکەنەوەو شەو دێتە خەوتان، لەبەرئەوەی کەس تاقەتی روخاندنی ئێوەی نیە، بەڵام دیارە حکومەت پێیوایە: پێویستە هەموان بڵێن بەڵێ بۆ کارەکانی حکومەت، هاوکات کەس بۆی نیە بڵێ نەخێر یان نارەزایی هەبێت. ئەوەی نارەزایی هەبێت نایەڵێن کاربکاتو دنیایەك بەربەستی ماددیو سیاسیو مەدەنی بۆ دروستدەکەین.

لەکۆتایدا ئاماژە بە نوسینێکی بەختیار عەلی دەکەین کە دەڵێ: "ئابووری موڵکی کۆمەڵگایەو موڵکی حیزب نیە، هەر کاتێکیش ئابوری حکومەت لەئابوری حیزب جیانەکرایەوە، قسەکردن لە دیموکراسییەت، نوکتەیەکی گەورەیە."

# سەروەت و جەنەڕاڵەکان

ئـەم نوسـینە هێنـدەی ڕەخنەیـەکی تونـدە لەدەسـەلآت هێنـدە بیرخەرەوەیـەکی ڕۆمانـسی نیـە، هێنـدەی وێنـاکردنی ژیـانی شێوەکارێکی مۆدێرنـە لـەدنیای ناعەدالەتییـە کوشـندەکاندا، هێندە بەسەرکردنەوەیەك نیە.

پیاوە سپییەکە.. ئەو کە ماڵێکی هە ەو لەباران، سەرزەمینێکی هەبوو لەخەیاڵ، ئاسمانێکی هەبوو لەتابلۆ، خاوەنی هیچ نـەبوو، بێجگە لەدیـەو زامـۆو بـابۆو نـامۆو تابلۆکـانیو هاوڕێکـانی خـۆی، حەسـرەتی ئـەو، تەنهاییـەکانی ئـەو زۆر لـەوە گـەورەتر بـوو کـە لـەماڵێکی بەتەکلیفـدا، کرێخانوەکەی پیاوێکی سیاسی بیکات بـە مەکرەمـە، ئـەو لـەوە گـەورەتر بوو ستایش بۆکەس بکات، ئەو نەیدەویست جەنەڕاڵێك بە لای ماڵەکەیدا تێپەڕێتو سەروەت ببینێت کە خانوی نیە، کە کرێـچییە، ئـەو بۆئـەوەی جەنەڕاڵـەکان ژیـانو گـوزەرانی ئـەو نـەبینین بـەردەوام سـەرقاڵی وێنەکێشانو شاردنەوەی تابلۆکانی بوو لەژێر پێخەفـە وەنەوشـەییەکەیو ڕاخەری ماڵەکەیدا.

جەنەراڵەکان تازە بیریان دەکەوێتەوە کە پیاوێك هەبوو.. ناوی سەروەت ئەنوەر سەوز بوو، ماڵی نەبوو، تەنها تابلۆکانی ماڵی ئەو بوون، ئەو پیاوەی خاوەنی موڵكو ماڵو سەروەتو درۆنەبوو، ئەو خاوەنی هونەرێکی جاد، تەنهاییەکی عارفانە، ئەو بەچاوی خودا، روانینی بوزا ئەپروانیە دنیا، ئەو دنیابینییەی ئەو زۆر لەخەیاڵی جەنەراڵەکان، لەخەیاڵی بازرگانەکان، لەخەیاڵی ئەو مەلا خوتبەبێژەی کە بووبووە خاوەنماڵو دەیان خانووی هەبوو گەورەتر بوو، سەروەتیش کە یەکێك بوو لەکرێچییەکانی، لەلای پارکی ئازادییەوە کە خواش نەیدەبینی.. جەنەراڵەکانیش نەیاندەبینی.

تازە بەتازە جەنەراڵەکان بیریان دەکەوێتەوە، سەروەتو مناڵەکانی لانەیەکیان هەبێت، هەر هی خۆیان نەبێت، هەر خاوەنی هەبێت، ئێوە لەکوێ بوون کاتێك پیاوە سپییەکە زیاد لەچوارساڵ لەکێڵگەکانی میندا گەمەی بەقەدەرەکانی مەرگ دەکرد، لەبری پیاسەیەك بەو باخی زەیتونی خەیاڵەدا؛ یا پیاسەیەك بەژێربارانەدا، ئەو دەیان سەعاتو هەزاران رۆژ پیاسەی بەناو مەرگدا دەکرد، ئێوە لەکوێبوون کە سەروەتو سامان پیشانگەیەکی تایبەتیان لەسەر حسابی خۆیان بۆ ئێمە دەکردەووە.. من جەنەراڵێکم نەبینی لەپیشانگاکانی سەروەتدا دەستبەرێت بۆ تابلۆیەكو بەنرخێکی هەرزان لەسەروەتی بسەنێتو لەتەلارە کریستاڵیەکانی خۆیاندا هەڵیبواسن، ئێوە لەکوێبوون..کاتێك سەروەت ئێواران هەمیشە ئێواران بەتەنها لەباخی گشتییەوە تا شەقامی سالم سەریکی لەمۆزەخانەکە دەداو ئەگەر پیشانگەی تیادابوایە، هێدی هێدی بەژێربارانەدا پیاسەی دەکردو لەچاخانەی سەهۆڵەکە چایەکی لەگەڵدا دەخواردینەوە، ئێوە لەکوێ بوون

کاتێـك ســەروەت عەســرێك لەزسـتانی ئـەو سـاڵەدا کـە ئێـوە سـەرقاڵی گەرماییـەکانی شـەڕی نـاوخۆ بـوون سـەروەت پاڵتۆیـەکی زەیتـونی بـە (8)هەشـت دینـار کـڕی ..ئێـوە تـەنها ئـەو دڵـە دەوڵەمەنـدەی سـەروەتان دەبینی، ئێوە ئەوەتان نـەدەبینی کـە ئـەو پیاوە سپییە میناتۆرێکی یـەك سانتیمیشی بۆ دیکتاتۆر دروستنەکرد، بەڵام سەدان هونەرمەند لەعێراقدا وێنەی سێ بەچواری سەدامیان دەکێشاو بە عێراقدا هەڵدەواسرا.

پیاوە سپییەکە هەر رەخنەی دەگـرت، بەبێدەنگی لەگەڵ هاوڕێکانیدا نارەزایی دەرئەبڕی‌و رەخنەی لەهەموتان دەگرت، ئەو نەیدەزانی حونجەی ستایش‌و ئـەلف‌و بێـی ملکەچـی، ئـەو دەیـوت ئـەم پارچـەخاکە مـوڵکی هەمومانـە، بـەڵام ئێـستا هاوڕێیـان مـوڵکی ئێمـە نیـە، تـەنها مـوڵکی جەنەڕاڵەکانەو موڵکی بازرگانەکانی شەڕی ناوخۆیـە، ئـەو نەیدەتوانی ئـەو مەکرەمەو بەرەکەتە ناشرینانەی جەنەڕاڵەکان قبوڵبکات، جەنـەڕاڵەکانیش رقیـان لێیبـوو، ئاواتـەخوازبون تاهەتاهەتایـە سـەروەت‌و منداڵـەکانی لەکرێچیدابن، تا دنیادنیایە سەروەت خاوەنی ماڵێك نەبێت تا تابلۆکانی بـە ئیسراحەت تیادا بخەوێنێت، تـا دنیادنیایـە ساحەب مـاڵ پێـی بڵێـت تـەنها یـەك مـانگ مۆڵەتت بـۆ دائـەنێم مـشورێکی خـۆت‌و منداڵەکانت بخۆ، دەنـا تابلۆکانت بەم زستانە فڕێئەدەمە دەرەوەو لەسەر شەقامەکان لەژێر بارانـدا رەقببنەوە، ئێوە لەکوێ بوون بەڵێ ماوەیەك سەرقاڵی شـەڕی نـاوخۆ بـوون، دەی ئەوە قەدەرێکی ناشرین بوو، بۆ کوشـتنی جوانییـەکان بـۆ جوانکردنی مـەرگ بـۆ دوورکەوتنـەوە لـەهاوڵاتیان، بـەڵام ئـەوەتان بیرنـەچێت ئـەو دەســەڵاتەی هـەنگاوێك دووردەکەوێتــەوە لــەهاوڵاتیان دەیــان هــەنگاو نزیکدەبێتەوە لەدیکتاتۆری، بەڵام ئەی دواتر بیرتان نەکەوتەوە..

دابینکردنی شوقەو ماڵ بۆ هاوڵاتیان ئیشی حکومەتە نەك حیزب، ئیشی پرۆگرامی نەهێشتنی ئەزمەی سەکەنە، نەوەك ئیشی دایكو باوکێکی میهرەبانی درەنگوەخت.. ئێوە زۆر درەنگ بیرتان دەکەویتەوە ئەم وڵاتە چ خەراباتێکە، ئەندامەکانی خۆتان دەیان تەلارو کۆمپانیاو بەنزینخانەیان هەیە، بەڵام سەروەت کرێچی بوو..ئەو کە تابلۆکانی دەدا بەشانیداو لەپاریس‌و ئیتالیاو ئەڵمانیاو سلێمانی‌و لەئاسمان بەشداری پیشانگەکانی دەکردو پیشانگەی تایبەتی دەکردەوە، ئێوە لەکوێبوون.. تازە ئێوە فریای ئەو پیاوە نەکەوتن، فریای رۆح‌و دڵی ناسکی ئەو پیاوە نەکەوتن، ئێوە دوای مردنی ئەو پیاوە سپییە لەخەیاڵتاندا بوو بە نەخۆشخانەکانی دنیادا بیگێڕن‌و پیشانی دەیان پسپۆری پزیشکی بدەن‌و چاکی بکەنەوە، جەغار سەدجار جەغار ئێوە درەنگ بیرتان کەوتەوە.

من وەك هاورێیەکی سەروەت زۆر نیگەرانم بە درەنگ وەئاگاهاتنەوەی ئێوە، نیگەرانم بەوەی کە ناتوانن رێز لەمرۆڤەکان بگرن، رێز لەهونەرمەندو رۆشنبیران بگرن، بابۆ گیان، دییە، زامۆ گیان نیگەران مەبن بەم خەراباتە، لێرە رێزی ئینسان بەقەدەر تابلۆیەکی سەروەت نییە، تابلۆییەکی پیاوە سپییەکە لەهەمومان جوانترە.

ئەو شوقەیەی کە مام جەلال‌و هێرۆخان تازە بەتازە بۆ ئێومیان کڕیووە، دەمێکە هەقی خۆتانە، زیاتر لەومتان قابیلە، بەڵام من نیگەرانم بەم خەراباتە...

# جەلاد ...کۆمەڵگە سەگ نیە!

"مللانێی نێوان رۆشنبیرو سیاسی، یان لەنێوان
قەشەو حاکم..بەتەنیا مللانێ نییە لەنێوان
(مەعریفە)و (دەسەلات)دا، بەلکو ململانێیە
لەسەر رەوایی، واتە لەسەر مۆنۆپۆلکردنی هەق
بۆ درکاندنی راستییەکان." عەلی حەرب

ئەوە جەلادەکانن کۆمەڵگە وەك ئاژەڵ سەیردەکەن، کەرامەتی مرۆڤ دەخەنە ژێر پێیانەوە، ناعەدالەتی بەرپادەکەن‌و گەندەڵی دەکەن بە دینی خۆیان، ئەوە جەلادەکانن براکان دەکوژن، تەلارەکان بەرزدەکەنەوەو ژیان لەخەڵك دەکرنەوە، ئەوە ئەوانن دەست دەگرن بەسەرلەبەری سەرچاوە ئابوری‌و فەرهەنگی‌و سیاسی‌و کۆمەلایەتییەکاندا، ئەوە ئەوانن دەزگا نهێنییەکانیان دەکەن بە زیندان‌و تەعزیبخانەیەکی گەورە بۆ ئەو کەسانەی رەخنەیان لێدەگرن‌و سرپیان هەڵدەمالن، تەنها جەلادەکان هەرەشە لەرۆژنامەنوسان‌و رۆشنبیران دەکەن‌و قسەی سوکیان پێدەڵێن، تەنها جەلادەکانن خاوەنی جورئەتێکی غەیبانین بۆ جوێندان بە کۆمەڵگەو سوکایەتیکردن بە شکۆی مرۆڤ.

کاتێك جەهل دەگاتە ئەوپەڕی بێمانایی، کاتێك جوێنفرۆشیو زمانپیسی دەگاتە ئەوپەڕی قێزەوەنی، کاتێك دەمڕاستێکی حیزب دەبێتە زمانحاڵی سەرۆکی حیزبو دەسەلاتو لەقولایی دڵییەوە جوێنو قسەی ناشرین بەتەوای کۆمەڵگە دەڵێت، ئەوکاتە بێدەنگی ئێمە بەرامبەر ئەم عەنتەریاتە دەربەگخوازییە، بەلگەیە بۆ قبولکردنی شکاندنی کەرامەتی مرۆڤو خەمساردیو ترسنۆکی کۆمەڵگە بەرامبەر دروستبوونی دیکتاتۆرەکان.

سەرۆ قادر زمانحاڵی حیزبێکی تەمەن زیاد لەپەنجا ساڵ لەکۆڕێکدا بە ئێمە دەڵێت: (کۆمەڵگە سیفەتی سەگی وەرگرتووە، وەختێك نانیان دەدەیتێ پێت ناوەڕن..)، کاك سەرۆ دیارە تۆ زۆر جەریئی، زۆر جوامێریت، کە بەم شێوازە زۆر ناشرینو قێزەوەنە جوێن بە کۆمەڵگە دەدەیت، دیارە زۆر پاڵەوانو بەشەهامەتی وەك پاڵەوانێکی دەمو قەڵەم خوێناوی شەڕی براکوژی ئیهانەی تەواوی کۆمەڵگە دەکەیت، هاولاتیان باش دەزانن کە سەدامو رژێمە دیکتاتۆرییەکەی بەو هەموو دیکتاتۆریەتو خوێنڕێژیو جینۆسایدو کیمابارانەوە جورئەتین نەبوو بە تەواوی کۆمەڵگە بڵێن سەگو بە خەڵکی لادێکانیش بڵێت بێشەهامەت.

تۆ تەنها قسەت بە کۆمەڵگە نەوتووە، بەڵکە تۆ قسەت بە مەحویش وتووە، ئەم قسە ناشرینەت هەمومان دەگرێتەوە، نالیو سالمو بێخودو مەولەویو سەرجەم شاعیرانی کلاسیكو نوێ دەگرێتەوە، سەرجەم رۆشنبیرانو نوسەرانو رۆمانوسەکانو چیرۆکنوسەکانی ئەم ولاتە دەگرێتەوە، سەرجەم هونەرمەندو

ڕۆژنامەنوس‌و کاسبکارو شارنشین‌و گوندنشین‌و مامۆستاو مەلاو خوتبەبێژو قەشەو قورئان خوێن‌و سۆفی‌و موریدو شێخ‌و مسکێن‌و فەرمانبەرو کرێکارو تەواوی هاولاتیان‌و قوتابی‌و فێرخوازو کوڕو کچانی ئەم ولاتە دەگرێتەوە، هاوکات پیاوی سیاسی‌و و تەواوی حیزبەکانیش دەگرێتەوە لەبەرئەوەی هەمووتان زادەی ئەم کۆمەلگەیەن‌و لەم کۆمەلگەیەدا لەدایکبوون‌و دەژین خۆ لەمەریخەوە نەهاتون ئەی جوێنفرۆش‌و فەیلەسوفی پێشێلکردنی کەرامەتی مرۆڤ.

دیارە حکومەت‌و پەرلەمان‌و حیزبەکەت خەوتون، هەر تۆی جوێنفرۆش بەخەبەریت‌و بەدەنگێکی زۆلاڵتر لەشەڕی قێزەوەنی براکوژی هەڕەشە لەکۆمەلگە دەکەیت، بەدەنگێکی پڕ لەسوکایەتیکردن مافی تەواوی مرۆڤەکان دەخەیتە ژێر پێتەوە، تۆ خاوەنی دەسەلاتێکی کوشندەیت، کوشندەتر لەهەر دڕندەیەك کە نێچیرەکانی هەلاهەلا دەکات، ناشرینتر لەهەر دەسەلاتێکی دنیا، تۆی خەونکوژ بەم قسە جوانانەت خوازیاری تەواوی کۆمەلگە بکوژیت، بەم هەلۆێستە جەلادیانەتەوە دەتەوێت تەواوی کۆمەلگە بکەیت بە سەگ‌و خۆشت وەك باقی سەرکردە مشەخۆرەکانی حیزب بە زەنگینترین پیاوی دنیاو خۆت کردووە بە فەیلەسوفی جوێندان بە کۆمەلگەو هەڕەشەکردن لەرۆژنامەنوس‌و رۆشنبیران‌و هەفتەنامە سەربەخۆکان.

سەرباری ئەو ناعەدالەتی‌و گەندەلێیە قێزەوەن‌و زەبەلاحەی لەم ولاتەدا خولقاندوتانە، سەرباری ئەوەی لەقێزەوەنترین شەڕی

ناوخۆدا هەزاران گەنجی ئەم ولاتەتان بەخۆرایی‌و بەهۆی مەرامە خوینرێژییەکانی خۆتانەوە دا بەکوشتو بە زەردەخەنەیەکی پڕ لەخوێنەوە سەرکردەکانتان دەستیان لەملی پڕ لەباروتو خوێنی یەکتر کردەوە، کە دەبێت هەموو سەرکردە بەشدارەکانی شەڕی ناوخۆ بدرێنە دادگای نێودەولەتی، بە شەهامەتێکی پڕ لەخوێنەوە دێیتو دەلێیت: (میللەتی کورد میللەتێکی نەخۆشەو بەمەرجێك دەنگت دەداتێ مەعاشی بدەیتێ)، نابرادەر ئەوە تۆ نیتو حیزبەکشت نیە، سەرۆکەکەشت نیە کە معاش دەدات بە کۆمەلگە، ئەو پارە زۆرەی لەگیرفانو بانق‌و قونتەراتخانەکانی ئێوەدایە، لەکۆمەلگەتان دزیوەو، ئەو تەلارانەی بەرزی دەکەنەوە، سەرجەم داهاتی ئەم ولاتەیە لەمیللەتی دەدزن‌و خۆتان‌و ژیانتانی پێدەڕازێننەوە، ئەوە ئێوە نین کۆمەلگە بەخێودەکەن، ئەوە کۆمەلگەیە ئێوەی موحتاج‌و سوالکەر بەخێودەکات.

ئەگەر یەك زەڕە رۆشنبیر بویتایە، تۆزقالێك سیاسی بویتایە، هێندەی دەنکێ گەنم ئاگات لەم کۆمەلگەیە بوایە، بەئەندازەی چاوی هیلاکی جوتیارێکی ماندووی گوندەکان سەرنجی ژیانی ئەم کەلاوەیەتان بدایە کەخۆتان سازتان کردووە بۆ کۆمەلگە، بە لوتبەرزییەوە بە کۆمەلگەت نەدەوت: (بریا کۆمەلگەی کوردی وەك سەگ بوایە.)

تۆ چیت ئەی جەنەرالی شەڕی براکوژی، دیارە سەرۆکی حیزبەکەت زۆر لێت رازییە، وا تۆی کردووە بە فەیلەسوفی حیزب‌و بیریارو خاوەن عەقلی حیزب، دیارە مەکرەمەکانی پیاوە گەورەکانی

حیزبەکەت کوێریکردویت بەرامبەر ئەو کۆمەڵگەیەی کە بووبووە لانەی ئێوە، ئەوە خەڵکی لادێکان بوون کون بەکون ئێوەی دەشاردەوەو لەدەمی منداڵەکانی خۆیان دەگرتەوەو دەمی ئێوەیان پڕ دەکرد لەسکی برسی خۆیان، ئەوە ئەوان بوون دەبوون بە پێشمەرگەو شەهید دەبوون بۆئەوەی ئێوەی جوێنفرۆش بە زیندووی بمێننەوە.

دیارە سەرۆکی حکومەت ئیجازەیەو سەفەریکردووە بۆ دەرەوەی وڵات، دیارە ئەندامانی پەرلەمان رایانکردووە بۆ وڵاتێکی ترو ئاگایان لەقسە جوانەکانی تۆ نیە، دیارە ئەو پیاوە حیزبیانەی شەوانە تەلەفیزیۆنەکانی خۆیان پڕدەکەن لەقسەی زلو گوێکانی ئێمە پڕدەکەن لەبەڵێنی وەهمی سەفەریان کردووە بۆ مەریخو رۆژنامەو هەفتەنامەی هاوڵاتیان پێناگات بۆیە کەس وەڵامت ناداتەوە.

ئافەرین سەرۆ قادر جوامێرو پاڵەوان، تۆ زۆر جەریئی وا بە شەهامەتێکی زۆرەوەو زۆر ئازایانە هێرش دەکەیتە سەر رۆژنامەنوسانو کۆمەڵگەی کوردی، بەداخەوە ئێمەی مرۆڤ نەك هەر لێت قبوڵناکەین، بەڵکە راپێچی دادگات دەکەین، پێویستە لەسەر ئەم قسە جوانانەت بۆ هەتاتایە زیندانیبکرێتو سەرجەم سەروەتو سامانەکەت دەستیی بەسەردابگیرێتو دابەشبکرێتەوە بەسەر هاوڵاتیاندا.

دەبێت سەرۆکی حیزبەکەت بە رەسمی داوای لێبوردن لەهاوڵاتیان بکاتو داوای لێبوردن لەرۆشنبیرانو خەڵکی گوندەکان بکات.

لەکاتێکدا ئەم پارچە خاکەتان وێرانکردووەو کردوتانە بە کەلاوەیەکی گەورە لەڕێی ناعەدالەتیو بێگوێیو نابەرپرسیارێتیو ناشەفافیەتو دیکتاتۆریەتو سەتەمکاریو هەڕەشەکردن لەرۆژنامەنوسانو رۆشنبیرانو گاڵتەکردن بە موقەدەساتی هاوڵاتیانو شکاندنی کەرامەتی مرۆڤ، سەرباری هەموو ئەم ناحەقیانە بە کۆمەڵگەش دەڵێن سەگو بەخەڵکی لادێکانیش دەڵێن بێ شەهامەت.

# شكاندنی كەرامەتی مرۆڤ

## ئەوەی كۆمەڵگە دەكات بە سەگ جاریٚ لەدایك نەبووە

"راستە دەسەلاتی رۆشنبیر جۆرە دەسەلاتێكی ترە، واتە دەسەلاتێكی ماددی یان ئابوری نییە، بەڵكو دەسەلاتێكی رەمزییە، واتە دەسەلاتی قسەكردن‌و نوسینی هەیە لەبەرامبەر دەسەلاتی شمشێرو پارەدا. بەلاّم دواجار ئەویش هەر دەسەلاتە." عەلی حەرب

دەبێت دەسەلاّت خزمەتكارێكی گوێڕایەڵ بێت، نەوەك دەوڵەمەندێكی بێدەنگ، دەبێت داكۆكیكارێكی یاسایی بێت بەرامبەر ئەو بەرپرس‌و مشەخۆرانەی مافی مرۆڤ پێشێلدەكەن‌و كەرامەتی مرۆڤ دەخەنە ژێر پێیانەوە، نەوەك قسەنەكەرێكی بێئاگا، دەبێت رەخنەگرێكی ئازا بێت لەناعەدالەتی‌و گەندەڵی‌و ناحەقی‌و پێشێلكردنی مافی مرۆڤ، نەوەك موچەخۆرێكی بێدەنگ‌و بێ پلان‌و بێ خەونی گۆڕانكاری.

دەسەلاّت دەبێت ئەو راستیەش بزانێت كە ئەوە كۆمەڵگەیە حیزبەكان‌و حكومەت‌و سەرۆكی حكومەت‌و سەرۆكی حیزبەكان بەخێو دەكات، ئەوە حیزب‌و حكومەت نیە كۆمەڵگە بەخێو دەكەن،

دەسەڵات بەبێ کۆمەڵگە کارتۆنێکی بەتاڵی دەم ڕەشەبایە، دەسەڵات بەبێ ڕەخنەگرتن لێی دەبێتە دیکتاتۆرێکی ستەمکارو خوێنڕێژ، دەسەڵات بەبێ ڕەخنەو پێشنیارو میدیای ئازادو رایگشتی دەوارێکی هەلاهەلای دەم قەدەرەکانە.

فەیلەسوفی جوێندان بە کۆمەڵگەو پێشێلکردنی مافی مرۆڤو پێشێلکاری کەرامەتی ئینسان سەرۆ قادر کاسێتی قسە ناشرینەکانتیان بەدیاری بۆ هێنام، زۆر سوپاسی ئەو ئازیزەش دەکەم کە ژیانی خۆی خستە مەترسییەوەو لەهەولێرەوە بەدەستی خۆی بەدنیایەك نیگەرانیو بێتاقەتییەوە هات بۆ لامو وتی ئەم کاسێتە پڕ لەجوێنە بۆ تۆی خۆشەویست. لەبەرئەوە پاش گوێگرتن لەئەلبومی جوێنەکانت خوێنەران ئاگادار دەکەمەوە کە دەقاودەق وتووتە: (کۆمەڵگە سیفەتی سەگی وەرگرتوو، وەختێك نانیان دەدەمیتێ پێت ناوەڕن)، لەبەشی تری کاسێتەکەدا دەڵێیت: (میللەتی کورد میللەتێکی نەخۆشەو بەمەرجێك دەنگت دەداتێ مەعاشی بدەیتێ)، هەروەها بەدەنگێکی زوڵاڵیش دەڵێیت (خەڵکی لادێکانی ئێمە بی شەهامەتن..)، باس لەگەنجیش دەکەیتو دەڵێیت: گەنجانی ئێمە یەکی دە معاشیان هەیە، ...گەنجی ئێمە لە نەخوێنەوارترینیانەوە بۆ گەنجێکی خوینەوار پڕۆژەیان نیە.

## زمانی هەڕەشەکردن لە ڕۆژنامەنوسان و ڕۆشنبیران

ئەوەی هەڕەشە لەرۆشنبیرو نوسەرو تەواوی هاوڵاتیانو هەفتەنامەی هاوڵاتیو دەنگە جیدییەکان دەکات بۆئەوەی بێنو داوای لێبوردن لەبەڕێزتان بکەن جارێ لەدایك نەبووە، ئەوەی پێی

وایە لەڕێی جەبەروتی حیزبو دەسەڵاتی کاریزماو ئەو دیکتاتۆرە بچوکانەی نێو ناخی خۆیەوە ئیهانەی مرۆڤ دەکاتو کەرامەتی مرۆڤ دەخاتە بەر رەحمەتی قسە ناشرینو هەڕەشەکانییەوە تەواوی کۆمەڵگە دەکات بە ئاژەڵ، رێخۆش دەکات بۆئەوەی بەکردار مافو کەرامەتیان پێشێل بکات، خۆیو بەرپرسە ناعادیلو مشەخۆرو گەندەڵەکانی دیکە دەستکراوەتر دەکات بۆ ئەنجامدانی ناعەدالەتی زیاترو گەندەڵی تابینەقاقاو هەڕەشەکردن تا ئەوپەڕی ترساندنو تۆقاندنی تەواوی کۆمەڵگە.

## ئەوانە کێن مرۆڤ وەك ئاژەڵو سەگ سەیر دەکەن؟

ئەوە تیرۆریستەکانن ئینسان وەك ئاژەڵ سەیردەکەنو دەیانکوژن، ئەوە جوندول ئیسلامو جەلادەکانی ئەلقاعیدەو شێخ زاناکانن بەرلەوەی مرۆڤەکان بکوژن بەرلەوەی ئینسانەکان وەك کارژۆڵە سەرببڕن، بەرلەوەی خۆیان بتەقێننەوە، بەرلەوەی خەڵك بفڕێننو لەتوپەتی بکەن تەواوی مرۆڤەکان وەك ئاژەڵ سەیردەکەن، رونتر ..ئەوە تیرۆریستەکانن بەکۆمەڵگە دەڵێن سەگو سەریان دەبڕنو بەدڵێکی فراوانەوە پارچەپارچەیان دەکەن، هاوکات تاکە مرۆڤێك کە توانای سەربڕینی ئاژەڵی هەیە مرۆڤە، مرۆڤ بەرلەوەی ئەو گیانلەبەرەی بەردەمی سەرببڕێت دەڵێت ئەمە ئاژەڵە من سەریدەبڕم، هاوکات وەك ئینسان بەزەییشی پیادا دێتەوە، بەلاّم تیرۆریستەکان بەرلەوەی مرۆڤ سەرببڕن پێی دەڵێن ئاژەڵو هەزارانی

جوێنی سوکی وەك (سەگ، هیچو پوچو کافر، بێ ئەخلاق، بێ کەرامەت، وەك سەگ ئەوتۆپێنین، بێ شەهامەت)ی پێدەدەنو دواجار دەیکوژن، کاتێك تیرۆریستەکان مرۆڤێك سەردەبڕن بەلاشەکەی دەڵێن وەك سەگ تۆپانمان، ئەمەیە سایکۆلۆژیاو بیرکردنەوەی مرۆڤی تیرۆریستو جەلادو جوێنفرۆش. هاوکات لەشەڕی ناوخۆکانیشدا زمانحاڵو بەرپرسەکانی راگەیاندنی حیزبەکانو زورناژەنەکانی شەڕی براکوژی بەداخەوە بە جەستەی پیرۆزی شەهیدەکانیان دەوت کەلاك.

لەنوسینەکەی پێشوودا باسم لەوە کرد کە سەدامی دیکتاتۆرو رژێمەکەی چەند جەلادو دیکتاتۆرو ستەمکار بوون جورئەتو شەهامەتیان نەگەیشتبووە سنورێکی قێزەوەنو ناشیرن تا بەتەواوی کۆمەڵگە بڵێن سەگو بێ شەهامەت. بەلام دیکتاتۆرەکان وەك تیرۆریستەکان لەزیهنو بیکردنەوەو خەیاڵی خۆیاندا کۆمەڵگە وەك سەگ سەیردەکەن، بۆیە دەزگا نهێنییەکانیان دەخەنەگەڕ بۆ کوشتنو زیندانیکردنو جینۆسایدکردنی شۆرشگێڕو گوندنشینو شارنشینەکان، هاوکات لەبەرنامەی هەموو دیکتاتۆرێکدا تەعزیبخانەیەکی گەورە هەیە بۆ هەڕەشەکردنو تەعزیبدانو کوشتنو لەسێدارەدانی ئەو مرۆڤانەی بەرلەوەی بیانکوژن پیاندەڵێن (ها دولە کلاب)، واتە(ئەمانە سەگن بۆیە دەیانکوژینو بەناشرینترین شێوە تەعزیبیان دەدەین.)

ئەم کۆمەڵگەیە گەر بێساحێب نەبێت، ئاوا دەمڕاستێکی حیزب شوڵی لێهەڵناکێشێتو بەکامی دڵ جوێن بە کۆمەڵگە نادات، ئەگەر

ئێمەی مرۆڤ خاوەنی سەروەری یاساو پەرلەمانێکی قسەکەرو سەرۆك حکومەتێکی خەمخۆرو جێگرێکی نابەختەوەرو سەرۆك هەرێمێکی بە دەسەڵات بووینایە، ئەوا بەمشێوەیە پاڵەوانێکی جوێنفرۆشی شەڕی ناوخۆ بەتەواوی کۆمەڵگەی نەدەوت سەگ.

ئەگەر ئێمە خاوەنی دەسەڵاتی یاساو دادگای سەربەخۆو کۆمەڵگەی مەدەنیو رێکخراوی راستەقینەی گەنجانو ژنانو سەندیکاو گروپەکانی فشار بوینایە، ئەگەر ئێمە خاوەنی چەندین ئۆپۆزسیۆنو گروپی رۆشنبیری قسەکەر بوینایە، ئاوا پیاوێکی تاسەرئێسك جاهیل بەدنیای مۆدێرنو گفتوگۆی شارستانی بەدەنگێکی زوڵاڵ جوێنی بە سەرتاسەری کۆمەڵگە نەدەدا.

کێ داوای لێبوردن لەکێ بکات، سەرۆ قادر لە چاوپێکەتنێکدا دەڵێت ئەوانەی شتیان لەسەر نوسیوم با بێن داوای لێبوردنم لێبکەن من لێیان خۆش دەبم، بەڕێز ئەم حەرەکەیە کۆنە، ئێمە نەك داوای لێبوردن لەتۆ ناکەین بگرە دەبێت خۆتو سەرۆکی حیزبەکەت داوای لێبوردن لەکۆمەڵگەی کوردیو لەئێمە بکەن، هەرچەند ئێمە لێت نابورینو دەبێت بە سزای یاسایی خۆت بگەیت، سەرۆ قادر لەرۆژنامەی میدیادا بە ماشێتێکی گەورە دەڵێت: پێنج ملیۆن جار داوای لێبوردن لەکۆمەڵگەی کوردی دەکەم ئەگەر بەهەڵە لێم تێگەیشتبن../بەڕێز کەس بە هەڵە لە تۆ تێنەگەیشتووە، خۆ تۆ هیگلو مارکسو فۆکۆو جاك دریداو ئالان تۆرینو مالکۆلم برادبریو جۆن ستیوارت میل نیت کەس لێت تێنەگات، قسە ناشرینەکانت زۆر روونو ئاشکران هیچ فەلسەفەیەكو فیکریکی

تیادا نیـه، تـۆ بـه تـەواوی کۆمەلگـه دەڵییـت سـەگو بەخـەڵکی لادێکانیش دەڵیت بێ شەهامەت، ئەمە فەلسەفە نیە.

سـەرۆ قـادر تـۆ بەچـییەوە ئـەنازیت وا بـه لوتبەرزییـەکی بێمنەتانـەوە هەڕەشـه لەئێمـەی نوسـەرو رۆژنامـەنوسو هەڕەشـه لـه(هەفتەنامـەی هـاولاتیو کوردسـتان راپـۆرتو کوردسـتان دەیلـی نـویز، چـاودێر، کوردسـتان پۆسـت)دەکـەیت، بـەڕێز سـەردەمی هەڕەشەو چاوسورکردنەوەو خۆگیفکردنەوە بەسەرچووە، تۆ ئەگەر کۆمەڵێك ئەندامی حیزبەکەت لەپشتە، ئێمە تەواوی کۆمەلگەمان لەپشتە، تۆ شانازی بە دەسەلاتی جوێنو هەڕشەکردنو پێشێلکردنی مـافی مرۆڤـەوە دەکـەیت، ئێمـەش شـانازی بـه ئینـسانە پاکەکانو کۆمەلگـەو رۆشـنبیرانو نوسـەرانو گـەنجانو فێرخـوازانی زانکـۆو پەیمانگاکانـەوە دەکەین، تـۆ شـانازی بـه سـەروەری کەسـانی دیکـەوە دەکـەیتو لـەژێر سـایەی دەسـەلاتی ئەوانـدا بەتـەواوی کۆمەلگـه دەڵێـت: سـیفەتی سـەگی وەرگرتـووە/ ئێمـەش شـانازی بـه دنیایـەك خوێنـەری جیـدیو رێکخـراوە سـەربەخۆکانی کۆمەلگـەی مـەدەنیو گەنجانی شارو لادێو قەزاو ناحییەکانەوە دەکەین.

تۆ لەرۆژنامەی میدیادا بەخۆت وتـووە : (وەك کـەری نیـوە زەڕم لێـدێت) ..ئـەم کولتـورەت لـەکوێوە هێنـاوە، بەحەقـەت بـەڕێزیتو شـایەنی ئـەوە نـین رەخنـەتان لێبگیرێـت، بـەڕێز تـۆ هـەلگری کولتورێکی هەژاریت لەرووی مەعریفیو شارستانیو فەرهەنگییەوە.

هەر لەرۆژنامەی میدیادا سەرۆ قادر سەبارەت بـەبوونی ئـەو هەڵمەتـە لەدژی ئەو لەسلێمانی دەڵێت: (نەوشیروان مستەفاو کوتلەی ئەوی لەپشتە)،

بەرێز یەکەمجارتان نیە تۆو ئەمسالەکانتان هەر نارەزاییەکی مەدەنی رووبدات دەڵێن دەستی لەپشتەوەیە، هەرچییەك ماندەگرێت هەرچییەك خۆپیشاندان و رێپێوان ئەنجامدەدات پێیان دەڵێن دەستی لەپشتەوەیە یان خەترن بۆ سەر ئەمنی قەومی کە هیچیشی لەبارەوە نازانن، بەهەرحاڵ ئەم نارەزاییە مەدەنییەی دژی سوکایەتیکردنەکەی بەرێزتان دە هەزوار ئیمزایان کۆکردۆتەوە پیاوی کەس نین و خاوەنی کەسایەتی سەربەخۆی خۆیانن و کە پێککهاتوون لەفێرخوازانی زانکۆو پەیمانگاکان و دەرچوانی زانکۆو مامۆستاو فەرمانبەرو کاسبکارو کتێبفرۆش و رۆژنامەنوس و رۆشنبیر، هاوکات گوندنشین و قەزانشینەکانیشی تیادایە، واتە هەموو ئەو ئینسانانەی تیادایە کە بەشێکن لەم کۆمەڵگەیەی کە بەرێزت پێمان دەڵێت سەگ و بێ شەهامەت. هەروەها ئەو 18 رێکخراوە سەربەخۆیەی کۆمەڵگەی مەدەنی کە داوای یاسایمان لەسەر بەرێزت داوەتە دەستە دادوەری گشتی بریتین لەو رێکخراوانەی کە زوربەمان ئەندامین لەرێکخراوی نیۆدەوڵەتی ئەمنستی ئینتەرناشیناڵ و پەیوەندییەکی زۆر کاریگەرمان هەیە لەگەڵ UN و رێکخراوە نیۆدەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ و داکۆکیکاران لەمافە مەدەنییەکانی هاوڵاتیان.

<u>پاڵەوانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ سەرۆ قادر... ئەزانی لە پێشەوا شێخ سەعیدی پیرانەوە بۆ شۆرشگێری گەورە قازی محەمەدو تا شێخ مەحمودی نەمرو پێشەوا مەلا مستەفا بەرزانی و هەموو ئەم سەرکردە بەرێزانەو بەرپرسەکانی دەوروبەریان نەیانتوانییەوە بۆ چرکەیەك ئیهانەی کۆمەڵگە بکەن و جوێنیان بە کۆمەڵگە نەداوەو تا ئەوپەری رێزگرتن لەشکۆی مرۆڤ رێزیان لەهەموو کەسێك گرتووە، هەروەها سەرۆکی حیزبەکەشت بەرێز</u>

مەسعود بەرزانی هێندەی مـن ئاگـادار بمو کـه لەگەڵیشیدا دانیشتووم پیاوێکی زۆر بەڕێزە ئێمە جارێکیان لەبەردەمی خۆیدا بە ئامادەبوونی ئەو 18 ڕێکخراوە مەدەنییە سەربەخۆیەی کە ئێستاکە داوای یاسایمان دژی تـۆ پێشکەشی دادگا کردووە، بەڕێز مەسعود بـەرزانی بـەڕێزێکی زۆرەوە گوێی لێگـرتین‌و فـەرمووی منـیش لەگەڵتانـدام بـۆ دژایـەتیکردنی گەنـدەڵی‌و ناعەدالـەتی‌و ناشـەفافیەت. ئـەم نوسـین‌و ڕەخنانـەی ئێمـە دژی پـارتی دیموکرات نیـە، بـەڵام تـۆ دەخـوازی پارتی دیموکراتی تێوە بگلێنیـت، ئـەو خەیاڵەی بەڕێزتان لەخەیاڵی تاوانبارێکی خـەیاڵپلاو دەچێت، لەبەرئـەوەی هیچ کام لەئەندامانی حیزبەکەت رۆژێك لـەرۆژان بەدرێـژایی 60 سـاڵ بـە کۆمەڵگەیان نەوت سـەگ‌و بـە خـەڵکی لادێکانیـشیان نـەوت بـێ شـەهامەت، ئەگەر تۆ خەون بەوەوە دەبینیت رۆژێك لەرۆژان سەرۆکی حیزبەکەت یان حکومەت یان ئەندامانی حیزبەکـەت پـشتت بگـرن‌و دەستخۆشـیت لێبکـەن بەوەی کە بـە کـامی دڵ‌و بـەدەنگێکی زوڵاڵ بـە تـەواوی کۆمەڵگەت وتـووە سەگ، زۆر غەڵەتی ئەی پیاوە حەزینە دڵـڕەق‌و جوێنفرۆش‌و قـین لـەدڵ‌و نابەرپرسەکە. ئێمە زۆر لەتۆی جوێنفرۆش زیرەك تـرین، زۆر بـەئاگاترین لە فێڵ‌و پەلوپۆهاویشتنەکانی تۆ.. بەڵام ئێمە ڕەخنەیەکمان هەیە لەبەڕێز مەسـعود بـەرزانی، ئـەویش دەبوایـە کـاك مەسـعود بەدەسـتی خـۆی تـۆی تەسلیمی دادگا بکردایەو شکاتی لێبکردیتایە، چونکە کاتی خۆی بەڵێنی بـە ئێمە دا کە هـەر کەسێك ناهەقی‌و گەنـدەڵی‌و ناعەدالـەتی بکـات بەرامبـەر ئەم کۆمەڵگەیە خۆی دەیداتە دەست دادگا.

خوێنـــەرانی بـــەڕێز، ڕێکخراوەکـــانی کۆمەڵگـــەی مـــەدەنی، مرۆڤدۆســـتان‌و مـــاف پـــەروەران، شـــکاندنی کەرامـــەتی مـــرۆڤو

سـوكايەتيكردن بەشـكۆى مافـەكانى مـرۆڤ يەكێكـە لـەو تاوانـە گەورانەى كە دەرهەق بە مرۆڤايەتى دەكرێت، بەداخەوە بەرپرسە مشەخۆرەكان سەربارى ناعەدالەتىو گەنـدەڵى سوكايەتى بـە شكۆى مـرۆڤو سـەروەرى ياسـاوە دەكـەن، كاتێـك بەرپرسـێكى حيزبـى كـە لەپۆسـتى بەرپرسـى راگەيانـدنو ئەنـدامى سـەركردايەتى (PDK)بـە كۆمەڵگە دەڵێت سەگو بەخەڵكى لادێكانيش دەڵێت بـێ شـەهامەت.
لەراستىدا كـەمنين ئـەو بەرپرسـە حيزبيانـەى كـە مـافى مرۆڤيـان خـستۆتە ژێرپێيانـەوە، كـە دژايـەى كۆمەڵگـە دەكـەنو هەڕەشـە لەرۆژنامەنوسانو نوسەرو رۆشنبيرە سەربەخۆكان دەكەن.
لەبەرئەوەى دەسەڵات ئەم كومەڵگەيەى پڕكردوو لەناعەدالەتىو گەندەڵىو بێ ساحێبىو گرانـى بـازاڕو وەلامنەدانـەوەى حكومـەتو پەرلەمان بۆ داوكارييەكانى خەڵكو رەخنكانى رۆشنبيران، ئاشكرايە رۆژانە هاولاتيان لەدڵى خۆيانداو بەدەنگى بەرز رەخنە لەدەسەڵاتو حكومـەت دەگـرن، ئـەوەش راى ئـازادى هاولاتيانـەو مـافى هـەموو تاكەكەسـێكى كۆمەڵگەيـە بەرامبـەر ئێـوەى ناعاديـلو گەنـدەڵو خەمساردو بێ گوێو مورتاحو بەختەوەر، چونكە تـەواوى كۆمەڵگە بــەرەو هەژارييــەكى گـــەورەوگران دەڕواتو ئێــوەى حيزبـــىو دەسـەلاتدار بــەرەو دەوڵەمەنــدبوونێكى زيـاترو دەسـتكراوەتر بـۆ خاڵيكردنەوەى بودجەى وڵاتو داگيركردنـى سەرچاوە ئابوورييـەكان، بەلام ئێوەى دەسەلاتدارو زمانحاڵى حيزب هەرگيز بۆتان نيە جوێن بە تەواوى كۆمەڵگە بدەنو هەڕەشە لە رۆشنبيرانو رۆژنامەنوسـانو ميدياى ئازاد بكەن، لەبەرئەم خالانە:

1-ئێـــوەی دەســـەڵاتدار لـــەترۆپکی ناعەدالـــەتیو لەچـــڵەپۆپەی گەندەڵیـدانو کۆمەڵگـە لەهـەژارترین دۆخـی خۆیدایـە لـەرووی ئـابوریو شارستانیو رۆشنبیریو سیاسییەوە.

2-ئێـوەی حـاکمی موتڵـەقی حیزبـی لەبینـەقاقای دەوڵەمەنـدبونو زەنگینبونـدانو کۆمەڵگـە لـەرۆخی هـەژاریو گرانـی بـازاڕو نـەبوونی خزمـــەتگوزاریو ئەزمـــەی ســـوتەمەنیو بـــێ کارەبـــاییو ئەزمـــەی نیشتەجێبووندایە.

3-ئێوە گوێ لەهیچ کەسێکی دڵسۆزو خـەمخۆر نـاگرنو نابـەرپرسو خەمـسااردن بەرامبـەر تـەواوی کۆمەڵگـە، بـەڵام ئـەوە کۆمەڵگەیـە گـوێ دەگرێتو قسە دەکاتو رەخنە دەگرێتو بەشداری هەڵبژاردنەکان دەکات.

4- ئەوە ئێوەن مافی مرۆڤ پێشێلدەکەنو کەرامەتی مرۆڤتان خـستۆتە ژێر پێتانەوە، بەڵام کۆمەڵگە لەبەرئـەوەی وشـیارە بـە پرنـسیپەکانی مـافی مرۆڤ مافی ئێوەی ناعادیلیـان پێـشێل نـەکردووە، هاوکـات تائێـستاش هـیچ هاولاتییەك لەبەردەم رۆژنامەنوسو تەلەفیزیۆنەکاندا بـە ئێـوەی نـەوتووە سەگو بێ شەهامەت.

## هەڕەشەو کاڵفامی

ئەگەر تۆی جوێنفرۆش هەڕشە لەو رۆژنامەنوسو هەفتەنامـەو سایتانە دەکەیت کە رووی گەشی جوێنو سوکایەتیکردنەکانی تۆیـان خستۆتە روو بۆ رایگشتی، ئەوا من پێت دەڵێم تۆ ئەگـەر حیزبێکـت لەپشتە، ئێمە هەموو کۆمەڵگە بەرگریمان لێدەکات، تۆ ئەگەر چەند پارێزەرێکت هەیە دیفاع لە جوێنو سوکایەتیکردنەکانی تـۆ دەکـەن،

ئێمە چەندین حاکم‌و پارێزەری سەربەخۆ داوا یاساییەکانمان بەرزدەکەنەوە بۆ دادگایکردنی تۆی جوێنفرۆش، تۆ ئەگەر لەشیرن خەیاڵی ئەوەدای کە سەرۆکێکت لەپشتە ئێمە چەندین نوسەرو رۆشنبیرو هونەرمەندو کاسبکارو خوێندکارو فەرمانبەرو تەواوی هاوڵاتیانمان لەپشتە، تۆ ئەگەر چەند رۆژنامەیەکی حەزینی حیزبی کە خۆت‌و تاقمەکەت پارەتان بۆ هەڵرشتون بۆ چەواشەکردنی هاوڵاتیان بەوەی کە بەرێزت پەپولەیت‌و ناحەقی بەرامبەرت کراوە یان نوسەریت‌و خەڵك رقیان لێتە، بەداخەوە ئەم چەواشەکاریانە کۆن‌و سواون، هاوکات ئێمە خاوەنی چەندین رۆژنامەو هەفتەنامەو سایت‌و بلاوکراوەی سەربەخۆین، تا حەرفێك بلاودەکەیتەوە ئێمە سەدان وتارو کاری رۆژنامەگەری لەسەر قسە جوانەکانت دەکەین ئەی فەیلەسوفی سوکایەتیکردن بەمافەکانی مرۆڤو پێشێلکاری کەرامەتی مرۆڤ.

## مەلاو پەشیمانی

ئەوە بەعسییەکان بوون ئەنفالیان دەکردو کیمیاییان دەکرد بەسەر هەڵبجەداو هەندێك مەلاو خوتبەبێژی جاهیل بەدین‌و دنیایان دەهێنایە سەر تەلەفزیۆن‌و وایان لێدەکردن دەست بنێن بە قورئانی پیرۆزداو سوێندبخۆن‌و بڵێن ئەوە رژێمی سەدام نەبوو کیمیایی کرد بەسەر هاوڵاتیانی هەڵەبجەدا ئەوە ئێرانییە کافرەکان بوون جینۆسایدیان کردو خەڵکی بێ دیفاعی گوندەکانیان کوشت‌و ئەنفالیان ئەنجامدا، ئائەمە بوو کولتوری بەعس. ئێستاش سەرۆ

قادرو تەلەفزیۆنەکانی مەلایەك دەهێننەوە سەر تەلەفزیۆن‌و پەشیمانی دەکەنەوە، دەقاودەق ئەم ئەتوارە میراتی بەعسییەکانەو بۆ بەبەرپرسە جوێنفرۆش‌و جەریئەکان ماوەتەوە.

لە رۆژنامەی میدیاو گۆڤاری گولآنـدا سەرۆ قادر دەڵێت چەند کەسێك چەند قسەیەکی منیان لە سیاق دەرهێناوە، بەڕێز تۆ ئەزانی سیاق چییە، ئەزانی قسەکردن‌و گفتگۆی شارستانی‌و مەعریفی چییە، کێ زۆج ئەکەی ئێمە کاسێتەکەمان لایەو دەقاودەق بە دەنگێکی زولاڵ بە کۆمەڵگە دەڵێیت سەگ‌و بەخەڵکی لادێکانیش دەڵێیت بێ شەهامەت، ئیتر سیاقی چی‌و فەلسفەی چی، بەڕێز تۆ بەخۆت دەڵێیت : (لەکۆڕەکەدا کە قسەکەیان پێبڕیم وەك کەری نیوە زەڕم لێهات)، تولەو خوایەت ئەم قسەیە تۆ ئەیکەیت، ئەمە مەعریفەتە تۆ هەتە، ئێمە لەتۆ ناترسین ئەی پیاوە ئازاکەی حیزب، هیچ هەڕەشەیەکی تۆی ئەندامی سەرکردایەتی حیزبەکەت دینارێك ناکات لای ئێمە، هیچ سەرکردەیەکی حیزبەکەشت رووی نایەت پشتگیری‌و بەرگری لەتۆی جوێنفرۆش بکات، هەر کەسێکیش بەرگریت لێبکات وەك تۆی جوێنفرۆش‌و پێشێلکاری مافی مرۆڤ سەیری دەکەین.

# دەسەڵاتی زۆردار و
# پەرلەمانی کارتۆنی

"تەواوی مرۆڤایەتی مافی ئەوەی نییە، دەنگی نارەزایی
تاکەکسێك سەرکوت بکات."جۆن ستیوارت میل

ئەو دەسەڵاتانەی باس لەدیموکراسیەت دەکەن، فریان بە دنیای مۆدێرنەوە نیەو رایگشتییان خستۆتە ژێرپێیانەوە، ئەو دەسەلاتانەی تەلەفیزیۆنەکان پردەکەن لەهاشوهوشی سیاسیو ژێراوژێر مافی مرۆڤ پێشێلدەکەنو کەرامەتی مرۆڤ دەخەنە ژێر پێیانەوە، ئەو دەسەلاتانەی بە کردار پێیانوایە دەبێت حکومەت دەوڵەمەند بێتو کۆمەلگە لە نزمترین ئاستی هەژاریدا بێت، ئەو دەسەلاتانەی پێیانوایە دەبێت حکومەتو پەرلەمانو حیزبەکان لێورێژ بن لەبەختەوەریو کۆمەلگەش پربکەن لەناعەدالەتیو گەندەڵیو بێساحەبی، دەرەنجام دەبنە دەسەلاتگەلێکی فاشیلو زۆردارو نابەرپرسیارو ناعادیلو گەندەڵ.

## ناعەدالەتی تا بینەقاقا و گەندەڵی تاسەرئێسك

کاتێك ناعەدالەتی دەگاتە ئەوپەڕی جەهل بە کۆمەڵگەو دنیای مۆدێرن، کاتێك گەندەڵیو بەفیرۆدانی سەروەتو سامانی ئەم پارچە خاکە لەلایەن بەرپرسی نابەرپرسو حکومەتی ناحکومەتو پەرلەمانی نا پەرلەمانەوە بەخۆڕایی سەرفدەکرێت بۆ هەوسو ئارەزووەکانی پیاوانی دەسەلآت، ئەوکاتە قسەکردن لەسەر رایشگتی بێهودەییەکی گەورەیە، ئەوە دیکتاتۆرەکانن لەپێناو داگیرکردنی سەرلەبەری سەرچاوە ئابوورییەکانو کڕینەوەی بەختەوەریو فرۆشتنەوەی ناعەدالەتی بە خەڵك، ئەوە دەسەلآتە ستەمکارو زۆردارەکانن ژیان بە هەرزان لەخەڵك دەکڕنەوەو بەگران پێی دەفرۆشنەوە، دەنگی خەڵك بە هەرزان دەکڕنو بە گران دەرخواردیان دەدەنەوە، ئەوە ئەوانن پێیانوایە دەبێت تا قیامەت لەسەر تەختی دەسەلآت بنو شەیدای سازکردنی دۆزەخێکی گەورەی ناعەدالەتیو گەندەڵین، ئەوە دیکتاتۆرەکانن ئەخلاق کاڵ دەکەنەوەو عەنتەریات تۆخ دەکەنەوە، ئەوە ئەوانن تا ترۆپکی گەندەڵی دەست لەیەخەی کۆمەڵگە بەرنادەنو ژیان دەکەن بە کەلاوەو فەرهەنگو رۆشنبیریی بێمانا دەکەنو دیموکراسیەت لەقۆنتەراتخانەکانیاندا هەڕاج دەکەنو لەڕێی حیکایەتە کوشندەکانی سەروەرییە کارتۆنییەکانیانەوە کۆمەڵگە دەخەسێنن.

هاوڕێی زۆر ئازیزمان کاك مەریوان وریا لەستونەکەی خۆیدا بەناوی(مایەپوچبوونی ئەخلاقی) مەسەلەیەکی زۆر گرینگ

دەوروژێنێت کە لەرۆژنامەی نەیشندا کە رۆژنامەیەکی ئەمریکییە، رۆژنامەنوسێك بەناوی مارك ماکینۆنە، باس لەپەتای گەندەڵییەکانی کوردستان دەکات لەرێی پرۆژەی (شاری خەونەکان)ەوە کە لەهەولێر ئەنجامدەدرێت، دوابەدوای لێکدانەوەی ئەو راپۆرتە کاك مەریوان دەڵێت: "سیاسییەکانی کورد ئەوەندەی وەك هێزێکی مافیاییەکی رێکخراو دەردەکەون، وەك سیاسی میللەتێکی ژێردەستەو چەوساوە وێناناکرێن، بەڵکو وەك "شاری خەونی" دەستەیەك سیاسیو بەرپرسی نامەسۆڵ دەبینرێت کە ئامادەن بۆ بەدیهێنانی خەونە تایبەتەکانی خۆیان ئاگرێکی گەورە لەولاتەکە بەربدەن، ئەمەش تێکشکانێکی ئەخلاقییە بۆ مەسەلەیەك کە بەشێکی گەورەی شەرعیەتی خۆی لەسەر ئەو هەموو ناهەقیو ناشرینیانە کە دوژمنانی کورد بەرامبەر بە کورد ئەنجامیانداوە." رۆشنبیرانو خوێنەرانو سەرجەم ئەو ئینسانانەی بیردەکەنەوە، شاری خەونەکان نمونەیەکی گەورەی ناعەدالەتییو گەندەڵییە، هاوکات ناشرینکردنی ژیان لەرێی ناعەدالەتیو گەندەڵییە بێسەروبەرەکانی حیزبو حکومەت هەنگاونانە بەرەو دیکتاتۆریەتێکی ستەمکارانەو وێرانکارانە. کاتێك حکومەت بریاردەدات نزیکەی (5)ملیۆن دۆلار دابینبکات بۆ کرینی سەیارەی کەشخە بۆ وەزیرە بێئیشەکانو پەرلەمانتارە بێدەنگو خەوتووەکان، ئالێرەوە بە رۆژی نیوەرۆ گەندەڵیو ناعەدالەتی دەگاتە بینەقاقای حکومەتو قورقوراگەی پەرلەمان، ئالێرەوە بێدەنگی بەرامبەر نەبونی خزمەتگوزاری بۆ هاولاتیانو هەبوونی

بەختەوەرییەکی بەهەشتی بۆ بەرپرس و سیاسییە لەکارکەوتووەکانی ئەم پارچە خاکە، قوربەسەرییەکی گەورەیە، هیچ نەوتن بەرامبەر تێکشکانی سەرجەم بەها ئەخلاقییەکان و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەزیندانییەکانی دەزگای زانیاری و پاراستن و دەزگاکانی ئاسایش لەشارەکانی کوردستان و قسە نەکردن و دادگایی نەکردنی دەمڕاستێکی پاڵەوانی حیزب کە بە کۆمەڵگە دەڵێت سەگ و بێ شەهامەت، نەگبەتییەکی گەورەو گرانە.

کاتێك بەرپرسێکی حیزب بە ڕۆژنامەنوسێك دەڵێت وەك سەگ ئەو تۆپێنم، کاتێك بەنهێنی و ژێراوژێر بەرپرسە گەندەڵ و پیاوکوژەکان هەڕەشە لەنوسەر و هەفتەنامەکان و سایتەکان دەکەن، ئەوکاتە بێدەنگی ئێمە بەرامبەر ئەو هەموو ناهەقی و کاولکردنەی ژیان یەکسانە بە سفر. ئەوکاتەی گەنجانی ئەم وڵاتە بەدنیایەك نیگەرانی و تف لێکردنەوە لەدەرەنجامی بێئیشی و گەندەڵی و ناعەدالەتی و کرێی ناشرینی خانوو و بەهۆی بێبایەخکردنی توانا و بڕوانامەو خەونەکانیان لەلایەن حکومەت و پەرلەمان و حیزبەکانەوە وڵات بەجێدێڵن بۆ لۆبیەك لەبەرپرسی گەندەڵ و وەزیری ناعادیل و پەرلەمانتاری دەوڵەمەند و بەرپرسی جوێنفرۆش و جێگری مورتاح و سەرۆکی بەختەوەر.

## پەرلەمان چیە؟

پەرلەمان لەبەرئەوەی دەزگایەکی هەڵبژێردراوی میللەتە کاری سەرەکی یاسادانانە، لەسیستمی پەرلەمانیدا ئەرکی چاودێریکردنی

حکومەت لەڕووی یاسایی‌و چاودێریکردنی دارایی دەگرێتە ئەستۆ، هاوکات ئەو دەسەڵاتەشی هەیە کە متمانە لەوەزیری ناعادیل‌و گەندەڵ یان ناچالاك‌و کەموکوڕ بسەنێتەوە، واتە پەرلەمان لەتوانایدایە لێپێچینەوە لەگەڵیاندا بکات‌و لەسەر کاریش لایان بەرێت، ئەگەر ئەنجومەنی وەزیران بەرگری لەو وەزیرە کردو بووبە ڕێگر لەبەردەم پەرلەماندا، ئەوا پەرلەمان دەتوانێت وەزارەتەکە هەڵوەشێنێتەوە، لەمەش زیاتر پەرلەمان دەتوانێت سەرلەبەری حکومەتەکە هەڵوەشێنێتەوە. ئەمە ئیشی پەرلەمانە.

سەرۆکی پەرلەمان بێ چەندوچون مانای چییە؟ ئەگەر نازانی مانای چییە با من لەڕووی زمانەوانی سایکۆلۆژی‌و ڕۆشنبیریی‌و فەرهەنگییەوە بۆت شیبکەمەوە:

چەمکی بێ چەندوچون، واتە جەختکردنەوە لەسەر شتێك کە قسەی تیادا نیە، جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە کەس بۆی نییە قسە بکات لەسەر ئەو شتەی کە منی سەرۆکی پەرلەمان مەبەستمە، واتە کەس بۆی نیە ڕەخنە لەم بڕیارە بگرێت، کەس بۆی نیە بڵێت وانابێت، یان بڵێت ئەمە هەڵەیە، باشتێ کەمتر بێت یان زیاتر. ئەم قسەیەی بەڕێزتان زۆر لەقسەی دیکتاتۆرەکان دەچێت، بەلام تۆ دیکتاتۆر نیت، هەرچەند خۆت بۆخۆت پیاوێکی بەڕێزیت، بەلام ڕەخنەت لێدەگرین، لەبەرئەوەی بەڕێزی‌و موحتەرەمیت ئەوە ناگەیەنێت ئێمە ڕەخنەت لێنەگرین، ئەوەشمان بیرنەچێت کە تەنها دیکتاتۆرەکان جورئەتی ئەوەیان هەیە بە خەڵك بڵێن ئەم قسەیەی من دەیکەم بێ چەندوچون وایە.

ئەم چەمکە هێندەی چەمکێکە بۆ زیندوهێشتنەوەی ڕەهاگەرایی‌و یەقینخوازیی دەسەڵاتدارانە هێندە چەمکێکی دبلۆماسی یان یاسایی نیـە، لەبەرئـەوەی سیاسـییەکان تـەنها لـەکاتی تەنگـەژەو شـەڕو ململانـێ گەورەکاندا بە خەڵك دەڵێن: بێ چەندوچون، مـافی خۆمانـە، کـەس بـۆی نیە بڵێت نەخێر وا نیە، ئێمە بڕیار دەدەین‌و ئێوەش تەنها گوێگرن.تاد. هاوکات کەسە یاساییەکانیش پاش قەناعەت‌و تووێژێکی یاسایی گـەورە، پاش ئەوەی بڕیاری گونجاوی یاسایی بـۆ کەیـسەکان دەدۆزنـەوە، ئەوکاتـە بڕیـاری موتڵـەق دەدەن، بـەڵام ئێـوەی بـەڕێز پـاش هـیچ لێکۆڵینـەوەو تاتوێکردنێك، بەبێ هـیچ لێـدوانێکی ڕاڤەکارانـە بڕیـار دەدەیت‌ودەڵێت:( سـێ دەفتـەرو (700) دۆلار دەدرێـت بـە هـەر یەکـە لـەو ئەنـدام پەرلەمانانە بۆ کڕینـی سـەیارەو بـێ چەندوچون مـافی خۆیانـە). دواتـر هەور لەهەفتەنامەی ئاوێنەدا بە ماشێتێکی گـەورە نوسـراوە (نزیکـەی 5 ملیـۆن دۆلار دەدرێت بـە ئۆتۆمبیـل بـۆ وەزیـرو ئەنـدام پەرلەمانـەکانی کوردستان_ئاوێنە.ژ61).

ئەمـە حکومـەت‌و پەرلەمانـە خاڵـە یـان دوو مـەعرەزی سـایارەیە، لەکوردستاندا یەك مەعرەزی سەیارە نادۆزیتەوە تێکڕا (151)سـەیارەی کەشخەی تیادابێت، هیچ مەعرەزێکی سەیارە لەکوردستاندا لەیـەك ڕۆژدا بەیـەك هەناسـە (151)سـەیارەی نەفرۆشـتووە. بەداخـەوە ژمـارەی سـەیارەکانتان لـەدەنکی تـەزبیحی هەنـدێك پەرلـەمانتاری دنیـا زیـاترەو لەخەیاڵی هەموو وەزیرەکان زیاترە.

ئیـشی پەرلـەمان لەهـەموو دنیـادا یاسـادانان‌و بڕیـاردان‌و هەڵوەشـاندنەوەی بڕیـارە هەڵـەکانی حکومـەت‌و حیـزب یـان

داکۆکیکردن لەداواکاریو پرۆژەی هاولاتیان، پەرلەمان لەهەموو جیهاندا داکۆکیکارێکی یاساییە لەهاولاتیانو نارەزایيو رەخنەی کۆمەلگە لەحکومەتو حیزبو بەرپرسەکان، نەوەك داکۆکیکارێکی سەرسەخت لەمافە مادییەکانی خۆی، ئەمە ئیشی پەرلەمانە، بەرێز پەرلەمان قۆنتەراتخانە نیە، واتە ئێوە بە مەترەکاری ئیش ناکەن، بە دوو مانگ جارێك کۆدەبنەوە، زۆرجار پشوەکانتان هێندە درێژە حکومەتێکی تیادا دەروخێ، ئایا ئێوەی پەرلەمانتار کاتێك یاسایەك دادەرێژن بە مەترەکاری دەیکەن، ئایا ئێوە تا ئێستاکە چیتان کردووە؟ توانیوتانە داواکاریو نارەزایی خەلك بکەن بە پرۆژەگەلێکی جیدیو کاری گەورەی بۆ بکەن بۆ ناچارکردنی حکومەتو لایەنە بەرپرسەکان بۆ گرینگیدان بە هاولاتیان لەرووی خزمەتگوزاریو خۆشگوزەرانیو دابینکردنی مافە مەدەنییەکانی هاولاتیانو رێزگرتن لەشکۆی مرۆڤ، بەرێزم لەراپەرینەکەوە تا ئێستا لەم پارچە خاکەدا مافی مرۆڤ بە چەندین شێواز پێشێلدەکرێتو کەرامەتی مرۆڤ لەژێر پێی گەندەلیو ناعەدالەتیو ناحەقیدایە، بەلام ئەفسوس یەك پەرلەمانتاری ئازا نەیتوانی حەرفێك بلێت. بێدەنگی ئێوە بەرامبەر ناحەقیو نەهامەتیو هەژاری کۆمەلگە هێندە گەشاوەیە کە بەهیچ پێوەرێکی مۆدێرن ناپێورێت ئێمە لەنوسینەکانی پێشودا باسمان لەموچەی زۆری پەرلەمانتارەکانو وەزیرو سەرۆكو جێگری حکومەت کردوە، کە بەداخەوە ئەم حکومەتو پەرلەمانە هێندەی کاردەکات بۆ تۆخکردنەوەی ناعەدالەتیو گەندەلی هێندە

بیرناکاتەوە، هێندەی کاردەکەن بۆ دەوڵەمەندکردنی خۆتان، هێندە کەسانێکی قسەکەرو داکۆکیکارو بوێر نین بۆ دادگاییکردنی لێشاوێك بەرپرسی گەندەڵو نابەرپرسو مشەخۆرو جوێنفرۆش.

موچەی دەرچویەکی زانکۆ ناگاتە بەرپێی مەلحەمەتی موچەی زۆروزەوەندەی پەرلەمانتارێك، لەکاتێکدا مامۆستایەکی دەرەوەی شار سەد دۆلاری هیچ وەردەگرێت، کارمەندێکی خزمەتگوزاری شارەوانی(110000) سەدودە هەزار دیناری ئەم دراوە جوانەی عێراق وەردەگرێت، دەرچویەکی زانکۆ پاش ئەو هەمو خوێندنو شەو نەخونییە (157000)سەدوپەنجاو حەوت هەزار دیناری ئەم پارە حەزینە وەردەگرێت، بەلاّم ئێوەی تاسەرئێسك بەختەوەر لەمعاشی زۆروزەوەندەدا خەوتوون، هاوکات ئێوەی بێدەنگ بەرامبەر ئەو هەموو ناعەدالەتییە ناشرینەی کە لەم ولاّتەدا حیزبەکانتان خولقاندویانە بەنیازن پەرلەمانو ئەنجومەنی وەزیران بکەن بە مەعرەزی سەیارات، ئێمەی مرۆڤ بۆ نەگبەتی هاولاّتیان دەنگیان بە ئێوەدا، بۆئەوەی تۆزقالێك بەرگری لەهاولاّتی بکەن، ببنە دادگایەکی عادیل بۆ دادگایکردنی بەرپرسە گەندەڵەکانو ئەو پیاوە حیزبیانەی بوونبە دەرەبەگو هەزاران دۆنمی ئەم ولاّتەیان داگیرکردووەو کردویانە بە گوندی گەشتیاری بۆخۆیان، مەسبەحی گەورەو حەمامی تورکیو باخچەی پاشایان تیا دروستکردوە، بۆ حەزو ئارەزووە شەرابییەکانی خۆیان، ئێوە بەم بێدەنگییە کوشندەیە هەندێك لەمەسئولەکانتان دەستکراوەتر کرد بۆ ئیهانەکردنو شکاندنی کەرامەتی مرۆڤ، ئێوەی بێدەنگ دەمی پڕ

لەجوێنی سەرۆ قادرتان کردەوە بۆئەوەی بەتەواوی کۆمەڵگە بڵێت سەگ و بەخەڵکی لادێکانیش بڵێت بێ شەهامەت و بە گەنجیش بڵێت گەنجی ئەم کۆمەڵگەیە یەکی دە موچەیان هەیە.

تەرخانکردنی (3) ملیۆن و (415) هەزار دۆلار بۆ کڕینی سەیارەی کەشخە بۆ (111)ئەندام پەرلەمان، هاوکات بەگشتی تەرخانکردنی 5 ملیۆن دۆلار بۆ کڕینی مۆنیکا بۆ (40)وەزیر کە یەکی (41)هەزار دۆلاریان بەردەکەوێت و ئەوەی دیکەشی بۆ ئەندام پەرلەمانەکان کە لەسەرەوە ئاماژەم پێداوە. ناحەقییەکی گەورەیە و شێوازێکی دیکەی ناعەدالەتییە و شەرعیەتدانە بە فیرۆدانی سەروەتوسامانی ئەم وڵاتە بۆ کەمالیات، لەبری ئەوەی سەرۆکی پەرلەمان بڵێت نیو ملیۆن دۆلارم تەرخانکرد بۆ کرینی کتێب و دروستکردنی کتێبخانەیەکی گەورەو بۆ پەرلەمان بۆئەوەی ئیتر پەرلەمانتارەکان دەستبکەن بە کتێب خوێندنەوەو ئاگایان لەبواری رۆشنبیری بێت، لەبری سەیارە کڕین بودجەیەك تەرخان بکەن بۆ کڕینی تابلۆی شێوەکارە بەتواناکانی کوردستان و پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیرانی پێبڕازێننەوە، بەداخەوە ئەم بڕە پارەیە باڵەخانەیەکی گەورەی (20)نهۆمی پێ دروستدەکرا بۆ کەمکردنەوەی ئەزمەی نیشتەجێبوون و رزگارکردنی کۆمەڵێك کوڕو کچی ئەم وڵاتە لەکرێی سەخیفی کرێچێتی و نەهامەتی و بێجێی، ئەو بڕە پارەیەی ئێوە وەریدەگرن بەلایەنی کەمەوە (5370)کتێبی (300)لاپەڕەیی پێ چاپدەکرا، دەزگایەکی گەورەی سەربەخۆی رۆشنبیری پێ دروستدەکرا، نەخۆشخانەیەکی گەورەی پێ دروستدەکرا، مەکتەبێکی دواناوەندی پێ دروستدەکرا بۆ قەزاو ناحییەکان یان بۆ ئەو گوندە دووردەستانەی کە

تەنها خوا ئاگای لێیانە، ناڵێم مزگەوتێکی پێ دروستدەکرا لەبەرئەوەی ئەم حکومەتە هیوایەتی دروستکردنی مزگەوتە لەژیانیشیاندا یەك ركات نوێژیشی تیاناکەن.

ئافەرین سەرۆکی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم بۆ خۆتان و بڕیارە جوانەکانتان، لەکاتێکدا پەرلەمانتارانی ولاتە مۆدێرنەکان هەندێکیان بە پاسکیل یان بە تەکسی یان بە سەیارەی حکومەت هاتوچۆ دەکەن، بەلام پەرلەمانتارو وەزیرەکانی ئێمە دەبێت بە گەشخەترین سەیارە هاتوچۆ بکەن، چونکە زۆر قسەکەرن، زۆر داکۆکیکارن لەنەهامەتییەکانی خەڵك، زۆر گوێ لەهاوڵاتیان دەگرن، چونکە تائێستاکە چەندین وەزیرو بەرپرسی حیزبیتان راپێچی دادگا کردووە لەسەر گەندەڵی و ناعەدالەتی و داگیرکردنی سەروەت و سامانی گشتی. یاخوا نۆشی گیانتان بێت ئەو معاشە زۆرو ئەو سەیارە گەشخانە.

من وەك نوسەرێك رێزی زۆرم بۆ چەند پەرلەمانتارێکی قسەکەرو ئیشکەرو خاوەن هەڵوێست هەیە کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرین و کەسانێکی بێدەنگ نین و خەمی تەواوی کۆمەڵگەکەیانە. بەلام بەتوندی رەخنە لەو پەرلەمانتارانە دەگرم کە چەندین ساڵە بێجگە لەپاڵدانەوە حەرفێکیان نەدرکاندووە، دێڕێکیان نەوتووە، هەندێك لەو پەرلەمانتارانە بێجگە لەباوێشکی دوورودرێژ یەك چرکەیان لێوە نەهاتووە، هەندێکیان بێجگە لەسەیرکردنی بەرنامە تەرفیهی و گاڵتەئامێزەکانی تەلەفزیۆنە حیزبییەکانی خۆیان دێڕێکیان نەخوێندۆتەوە، لاپەڕەی کتێبێکیان بە عیشقەوە هەڵنەداوەتەوە.

ئێوەی پەرلەمانتارو سەرۆك پەرلەمان كاتێك دەتوانن شوقە بۆخۆتان بكڕن‌و سەیارەی كەشخە بخەنە ژێر خۆتانەوە كە توانیبێتان لانیكەمی ئەزمەی نیشتەجێبوونتان چارەسەر كردیبێت، خۆتان دەزانن‌و شوكور وشیارن بەوەی نیوەی خەڵكی هەرێمی كوردستان كرێچین‌و داهاتی مانگانەی هاوڵاتیان بەشی لە (30٪)ی ژیان‌و گوزەران ناكات‌و بەشی دابینكردنی خزمەتگوزارییە پێویستییەكان بۆخۆیان ناكات كە حكومەت دابینی ناكات، دیارە ئێوە تەنها بیر لەدەوڵەمەندبونی خۆتان‌و هەژاربونی كۆمەڵگە دەكەنەوە، دیارە گاڵتە بە شعوری خەڵك دەكەن.

بەداخەوە ئێوەی خاوەن سەیارەی كەشخە لەساڵی 1992 ەوە تائێستاكە كە (16)ساڵی رەبەق دەكات نەتانتوانی دەستوری حكومەتی هەرێم بێ چەندوچون تەواو بكەن، نەتانتوانی كاری جیدی بكەن بۆ جێبەجێكردنی ماددەی (140)، سەدانجار ئیمزای ناڕەزایی هاوڵاتیانمان بۆ ناردن وەك سكاڵاو ناڕەزایی لەباری قورسی ژیان‌و كەمی موچەو ئەزمەی نیشتەجێبوون‌و بەرەڵایی بازاڕەكانی كوردستان، بەڵام بەداخەوە هەر باستان نەكرد، وا بزانم هەر بیرتان چۆتەوە، ئەو هەموو ناحەقی‌و گەندەڵییە بەرامبەر ئەم كۆمەڵگەیە دەكرێ‌و سەدانجار لەرۆژنامەو هەفتەنامەو سایتەكانی ئینتەرنێتدا پێمان وتن ئەو بودجە خەیاڵییەی كە مانگانەو ساڵانە تەرخانكراوە بۆ معاشی زۆروزەوەندەی سەرۆكی حكومەت‌و جێگرو وەزیرو ئەندام پەرلەمانەكان كە كاتی خۆی هەفتەنامەی ئاوێنە كەشفی كرد، ئەگینا هاوڵاتیان هەر نەیاندەزانی (لە هەفتەنامەی ئاوێنەدا ئەم پەرەگرافەم بڵاوكردەوە: كاتێك موچەی تۆی سەرۆكی حكومەت

(67) جار زیاتره لەموچەی مامۆستایەکی دەرەوەی شار، کەواتە تۆو حکومەتەکەت زۆر ناعادیلن، کاتێك موچەی تۆی پەرلەمانتار (32)ئەوەندەو نیوی موچەی دەرچوویەکی زانکۆیە لەدائیرەیەکی حەزینی حکومەتدا، کاتێك موچەی تۆی وەزیری تازە(36)ئەوەندەی موچەی فەرمانبەرێکی خاوەن بڕوانامەیە، کەواتە ئەم کۆمەڵگەیە پڕ لەناعەدالەتیو خەمساردی بەرامبەر داواکارییەکانی هاولاتیان).

ئێوە بەو موچە زۆرەشەوە نەوەستان ئێستا وەك پەرلەمانتارانی عێراق پارەی مەترسیش وەردەگرن، هاوکات بودجەیەکی (3)ملیۆنو (415) هەزار دۆلاریش تەرخان دەکەن بۆ کڕینی سەیارەی کەشخە بۆئەوەی بەسەر شەقامەکانی شاردا پیاسەبکەنو بە پێکەنینەوە بڕواننە نەهامەتیو هەژارییەکانی هاولاتیان، بۆئەوەی بە مورتاحی بڕۆن بەرەو هۆڵی پڕ لەبێدەنگی پەرلەمانو هیچ نەڵێن بۆ باشترکردنی ژیانی خەڵكو بڕیاردەرکردن لەسەر گەشەپێدانی ئابوریو سیاسەتو فەرهەنگی کۆمەڵگە، بۆئەوەی قسە نەکەن لەسەر کێشەی نیشتەجێبونو کەمی داهاتی مانگانەی هاولاتیانو ئەزمەی سوتەمەنیو کەمی موچەی گەنجە خاوەن بڕوانامەکانو زۆری موچەی خۆتان، بۆئەوەی هیچ نەڵێن دەربارەی ئەوەی هەردوو حیزبی دەسەلاتدار سەرلەبەری دەزگا رۆشنبیریو فەرهەنگییەکانیان داگیرکردوەو کتێب بۆ هیچ نوسەرێکی جیدی چاپ ناکەن، ئەگەر بۆشی چاپ بکەن تا دەبێت بە کتێب بە چاوەڕوانی ئیمانی دەردێنن، هاوکات وەزارەتێکی بەناو رۆشنبیری هەیە کە لەوەتەی ئەو ئەندامە بەرزەی حیزب بووە بە وەزیر دە کتێبی جیدی چاپ نەکردووە بۆ رۆشنبیرە ئەکادیمیستو

ڕەخنــەگرەکان، ئائەمەیــە نەگبــەتیو قوربەســەری بــەڕێوەبردنو حوکمکردنو پەرلەمانو وەزارەتەکان.

بەداخــەوە ســەرۆکی پەرلــەمانو پەرلــەمانتارە بــەڕێزەکان، بــۆ نەگبــەتی تۆزێــك دڵمــان بــەئێوە خــۆش بــوو بــەرگریمان لێبکــەنو گوێمـان لێبگـرن، بـەڵام ئێـوەش بـەم بێدەنگییـە پـڕ لەخامۆشـییەوە بونەتــە ڕێخۆشــکەرێکی بەختــەوەر بــۆ دروســتبونی دیکتــاتۆری ئابوریو جوێنفرۆشی حیزبیو دەرەبـەگی ڕۆشـنبیریو پێـشێلکارانی مافی مرۆڤو شکاندنی کەرامەتی ئینسان.

ئەفسوس نەتانتوانی بە دەنـگێکی زوڵاڵ بەرپرسێکی تاسەرئێسك گەندەڵو وەزیرێکـی تـا بینـەقاقا شـەلاڵ لەبێئیـشیو کەمتەرخـەمی ڕاپێـچی پەرلەمان بکەنو لەرووی یاساییەوە سزای بدەنو سـەروەتو سامانە خەیاڵییەکەی دابەشبکەنەوە بەسەر خەڵکدا.

جەغار..سەدجار جەغار بـۆ ئێـوەی پەرلـەمانتار کـە بـەدەنگێکی زوڵاڵ بڕیار دەدەن موچە بۆ خۆتـان زیـاد بکـەنو بـڕی (3)ملیـۆنو (415)هەزار دۆلاریش تەرخان بکەن بۆ کڕینی سـەیارەی کەشـخەو بــە دەنگێکــی پــڕ لەجەبەروتــەوە دەڵــێن: ئــەم پارەیــە لەبودجــەی پەرلەمان دابینکـراوە بۆئـەوەی پەرلـەمانتاران ئۆتـۆمبیلی پێبکـڕنو مافی بێ چەندوچونی خۆیانە....

پەرلــەمانتار دەبێــت خزمــەتکارێکی گوێڕایــەڵ بێــت، نــەوەك دەوڵەمەندێکی بێدەنـگ، دەبێت داکۆکیکارێکی یاسـایی بێـت، نـەوەك قــسەنەکەرێکی موحتــاج، دەبێــت ڕەخنــەگرێکی ئــازا بێــت لەناعەدالەتیو گەندەڵیو ناحەقیو پێشێلکردنی مافی مرۆڤ، نەوەك موچەخۆرێکی بێدەنگو بێ پلانو بێ خەونی گۆڕانکاری...!

حکومـــەت دەبێــت خزمــەتکارێکی بەســەلیقەو گوێڕایــەڵێکی مرۆڤدۆســت بێــت، نــەوەك دەوڵەمەنــدێکی بــێ ئاگــاو خــەمخۆری کەمالیات، دەبێت بەڕێزەوە حساب بۆ رایگشتیو رۆژنامـەو نوسـەرو رۆژنامەنوسان بکاتو لەڕووی مەعریفیو یاساییەوە لێیـان بترسێت، نەوەك خۆی بکات بە پاڵەوانێکی چاونەترس لەرەخنـەو پێشنیارو میـدیاکان، لەراسـتیدا ئـەو حکومــەتو دەسـەلآتانەی حـساب بـۆ رایگـشتیو رەخنـەکان ناکـەن حکومەتگەلێکی فاشیلو نابـەرپرسو بێگوێو نەخوێنەوارن.

دواجـار ئــەم پەرلەمانــە بەختــەوەرترین پەرلــەمانی دنیایــە، بەختەوەرێکی بێدەنگ، بەختەوەرێکی دەوڵەمەند، بەختەوەرێك کە ئاگای لەکۆمەلگە نیەو تەنها خەمی خۆشییەکانی خۆیەتی....

لەکۆتایدا بەختیار عەلی پێمان دەڵێت:"رۆشـنبیر دەبێـت سنوری یاسـاکان گــەورە بکــات بــۆ دابینکردنــی ئــازادی زۆرتــر، ســنوری یاساکانیش تەسکبکاتەوە بەجۆرێك پلەوپایەی سیاسی نەبێتە مایەی دادگایینەکردنی هیچ کەس. هۆشیارییەك دروستبکات کۆمەڵ لەسەر بچوکترین بڕ لەسامانی خۆی بتوانێت یەخەی لێپسراوەکانی بگرێت، هەموو ئەوانە بەرێتە بەر دادگا کە لەمافی خۆیان زیاتر دەفرێنن."

"زۆرداران ســـێ جـــۆرن: هەنـــدێکیان لەلایـــەن خەڵکـــەوە هەڵدەبــژێرێن، هەنــدێکی دیکــەیان بــەزۆری تفــەنگو قــشوونی عەسکەران لەسەر کورسی دادەنیشن، گروپێکی تریشیان ستەمکاریان بە میرات بۆ دەمێنێتەوە." ئاتین دۆلابۆتی

# جیهانبینی، هێز، کۆنخوازی

"بەجیهانیگەرایکردنی مرۆڤ، لەرێی تۆڕەکانو
رێگەکانی راگەیاندنەوە دەروازەگەلێکی بۆ
رزگاربون لەبازگەکانی باوەڕو بەندیخانەکانی
شوناسە داخراوەکان کردەوە."عەلی حەرب

جیهانبینی مۆدێرن هێزێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی دنیای داخراو و روانینی داخراو، هاوکات کۆنخوازیش هێزێکی نەریتپارێزە بۆ داخستنی روانینو داگیرکردنی جیاوازییەکان، جیهانبینی مۆدێرن هێزێکە بۆ گۆڕانو بەرپاکردنی جیاوازیو خولقاندنی فەزایەکی کراوە، بەلاّم کۆنخوازی هێزێکە بۆ بەرپاکردنی دوبارەبونەوەو رەنگرێژکردنی نەریتو ئەخلاقیاتی مۆنوپۆلیزەکردن. ئەم شێوازە لەجیهانبینی دیاردەیەکی نویو تەوژمێکی کاریگەرترە، بۆ بەرهەمهێنانی هزرێکی دیکەو خەیاڵدانێکی دیکە، مرۆڤێك بەرهەمدەهێنێت کە دەکەوێتە دەرەوەی حیکایەتە بچوکەکانو دەرەوەی ئەو دنیا داخراوەی کە دنیابینییەکانو روانینەکان بچوکدەکەنەوە، واتە هزرێکی جیاوازی پاش حیکایەتە گەورەکانە.

خەیالگەیەکی دیکەی ئەو ناوەندە داخراوەی نەریتی بیرکردنەوەی نەوەکانی پێشوو دەشکێنێت، روانینێکی دیکەی ئەو سەرزەمینە بێدەنگەی مرۆڤە گوێڕایەڵەکانو خەیاڵدانە داخراوەکانو ئەو کولتوری سەرسامییە داغڵی گفتوگۆ دەکات، واتە ئەم تەوژمی جیهانبینییە بەرلەوەی تەوژمێکی کرداری بێت، تەوژمێکی مەعریفیو خەیاڵدانێکی جیاوازە بۆ دۆزینەوەی سەرزەمینێکی دیکەی تێڕامانو گەلاڵەکردنی تیکستێکی کراوەی رەخنەییو دۆزینەوەی ئاڕاستەیەکی دیکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو دنیا نەریتییەی کە بیرکردنەوەکانو خەونەکان بەئەندازەیەکی کاریگەر ناشرینو وێران دەکات. کەواتە جیهانبینی هێزێکی دیکەیە لەدەرەوەی پێوانە نەریتییەکانو لەدەرەوەی ئەو پانتاییە داڕێژراوەی ئایدۆلۆژیاو هزری باوی روانین، فەلسەفەیەکە بۆ کردنەوەی پانتاییەکی جیاوازی هزرو خەیاڵدانێکی نابەراوردکاری لێوانلێو لەپەیوەندیو بەریەککەوتن، کاردەکات بۆ دامەزراندنی کلێشەسازییەکی ناتایبەتمەندی کراوە.

روانینێك لەدەرەوەی ئەو ترادسیۆنە داخراوەی ژیان، لەدەرەوەی ئەو دنیا کۆنکرێتییەی کە روانین بچوکدەکاتەوە بۆ خەیاڵێکی بچوكو کۆمەڵە حیکایەتێکی بچوك، دنیابینییەکی دیکەو خەیالگەیەکی فراوانتری هەیە بۆ شکاندنی ئەو تەوقی حیکایەتانەی کاردەکەن بۆ وێناکردنی خەونو مەوداکانی روانین. هەروەها ئەو دنیابینییەی کاردەکات بۆ بچوکردنەوەی خەونەکان، کاریش دەکات بۆ بچوکردنەوەی مرۆڤەکان لەکۆمەڵە حیکایەتێکی هاوشێوەدا. ئەم دیاردەیە هەوڵێکی گەورەیە بۆ شکاندنی ستراکچەری حیکایەتەکانو ئەو نادنیابینییەی کە

گەمارۆی ژیانی داوەو سازکردنی ئەو کلێشە کولتورییەی کە دروستکەرو داڕێژەری قەیرانەکانە.

جیهانبینی مۆدێرن کار لەسەر دوو ئاستی جیاواز دەکات، بەواتایەك بزوێنەری دوو ئاستی بیرکردنەوەیە، ئاستی یەکەم هەڵوەشاندنەوەی داخرانی کولتوری‌و فەرهەنگییە، ئاستی دوەمیش پەیوەندییە. دنیای داخراوی کۆمەڵگە نەریتییەکان دنیایەکە بۆ بچوکردنەوەی ژیان‌و کولتورو هزرو فەرهەنگ‌و پەیوەندییەکان، دنیای لۆکاڵ کاردەکات بۆ بچوکردنەوەی ئینسان‌و بچوکردنەوەی خەونەکان، لەکاتێکدا ئەو فەرهەنگەی کە کۆمەڵێك خەونی گەورە لەپشتییەوە ئامادە نەبێت کۆمەڵگەیەکی بچوکە، فەرهەنگێکی داخراوە، شارستانیەتێکە لەپەراوێزی خۆی‌و دنیادا، وەك عەلی حەرب دەڵێت: ئەوڕۆکە لەبەردەم شۆڕشی زانیارییەکاندا ئیمکانیاتێکی بەرفراوان لەبەردەم مرۆڤدا کراونەتەوە، کە لەتوانستە کاریگەرەکاندا بۆ کردەو کارلێکردن بەرجەستە دەبێت، هیچ زیادەڕۆییەك نیە لەقسەکردندا گەر بڵێین جیهانێکی نوێ لەگەڵ دیاردەی جیهانگیریدا پێکدێت، هاورێ لەگەڵ دەرکەوتنی بکەری مرۆڤایەتییەکی نوێدا، کە بە مەوداو خێرایی تیشك یان هزر کاردەکات، بەقەدەر بەکارهێنانی ڕێگەکانی راگەیاندنی خێراو هەمەڕەنگی، یان لەگەڵ ئەو تۆڕە پەیوەندییە ئاڵۆزو لەرادەبەدەرانەدا مامەڵەدەکات. مرۆڤی پەیوەندیامێز کە دەماخێکی ئالی‌و تەکنیکاتێکی ژمارەیی‌و هزری‌و کارکردن بەرەو گەردوونگەرایی بە وێنەیەکی کیشوەربڕو کۆمەڵگابڕو کولتوربڕی بۆ رەخساوە."[14]

---

[14] علی حرب، حديث النهايات،2001،ل10"

ئەم ئەزمونە بەرلەوەی گەڵاڵەکردنی جیهانبینییەکی جیاواز بێت، بەرپاکردنی بیرکردنەوەو روانینێکی جیاوازە لەدەرەوەی ئەو دنیا داخراوەی دەسەڵاتە داخراوەکانی ئەو نادنیابینیەی کە دەکەوێتە ناوەوەی حیکایەتەکان و کرۆکی رووداوەکان و ئەو کۆنخوازییەی بەردەوام لەهەوڵی پاراستنی نەریتی داخراوی ئەو سەرزەمینەدایە کە ناوی نیشتیمانە، ئەو خەیاڵگەیەی کە ناوی حیکایەتی بچوکە، ئەو دنیایەی کە ناوی دوبارەبونەوەیە، ئەو رووبەرە نادیارەی کە ناومان لێناوە یادەوەری و مێژووی ئەم تەوژمە ئاراستەیەکە تەواو پێچەوانەی لۆکاڵیەت و هەرێمخوازییە، تەواو پێچەوانەی رەهەندە کورتمەوداکان و هزرە نەریتییەکانە، پێچەوانەی کۆنخوازی و نەریتخوازی و ئەخلاقپەرستییە، ئاراستەیەکە لەدەرەوەی دنیای چوارگۆشەی کۆمەڵگە داخراوەکان و بازنەی داخراوی هزرو روانین و نادنیابینییەکان.

ئەوەی لەپشت ئەم ئەزمونەوە کاردەکات نە تێکستێکی ئەدەبییە، نە خەیاڵدانێکی شیعرییە. بەڵام ئەم ئەزمونە بەبێ ئەو خەیاڵدانە جیهانبڕ و کولتوربڕەو بەبێ ئەو نیگەرانیانە چوارچێوەیەکی دیاریکراوەو هیچی تر، بەبێ ئەو خەونانە ستراکچەرێکی بەتاڵەو کلێشەیەکی دیکەی ئەو دنیا داخراوەیە کە سەرزەمینێکە بۆ بچوکردنەوەی مرۆڤەکان، بۆ بچوکردنەوەی دنیابینییەکان.

## نائومێدی و نیگەرانییەکان

مەودایەکی دیکە هەیە لەدەرەوەی مەودا داخراوەکانی رازیبون، لەدەرەوەی حیکایەتە گەورەکان، لەدەرەوەی نەریتی روانین و نەریتی

بێباکی، کە مەودای نائومێدییەکانە، کە دنیابینییەکی قوڵترە بۆ نیگەرانی، جەوهەریترە. نائومێدیی بەرلەوەی بارودۆخێکی سایکۆلۆژی بێت، پتر بارێکی مەعریفییە، جیاوازییەکی دیکەیە بۆ رەنگرێژکردنی کلێشەیەکی دیکەی ئەنتۆلۆژی، ئەوەی لەنائومێدییەکانەوە دێت، ئەوەی زادەی نائومێدییەکانە زادەی نادیارێکە، کوڕی نیگەرانییەکانە، لەبەرئەوە ئەوەی لەپشت ئەم ئەزمونەوەیە پتر ئەو نیگەرانییە گەورانەیە لەنەوەکانی پێشوو، نیگەرانی لەدەسەڵاتە داخراوەکان، لەجەنگ، لەشەهادەت، لەدەسەڵات، لەبێباکی، لەپوچی، لەدوبارەبونەوەی حیکایەتەکان، لەحیکایەتە بچوکەکانو لە مەرگدۆستی...تاد.

دواجار ئەو نیگەرانییە تەوژمێکی نوێیە بۆ دروستکردنی مەودایەکی دیکەی تێگەیشتن، بەڵام ئەگەر دنیابینییەکی جیاوازی لەپشتەوە نەبێت نابێتە بەرپاکەری خەیاڵدانێکی جیاواز بۆ گەڵاڵەکردنی روانینگەلێکی ناترادسیۆنی، بۆ وروژاندنی زیاترو زیاتری ئەو خەیالگە کۆنکرێتییەی کە پێیوایە لەدەرەوەی مانیفێستە داخراوەکەی ئەو شتێکی دیکە ناژی، لەدەرەوەی ئەو دنیا کلۆمدراوە هیچ روانینێکی دیکەو هیچ نیگەرانییەك بەقەدەر قەدەرەکانی ئەو نینو بەقەدەر ئەو رێکەوتە دیاریکراوەی ئەو نینو هیچ نادیارێك ناتوانێت رووە تاریکەکانی ئەو هەڵماڵێو مەودایەکی دیکە زیادبکاتە سەر ئەو ناوەندە.

## جیهانگیری بەرهەمی جیهانبینییە

واتە جیهانگیری بریتییە لەو دۆخە ئێستاییەی لەمرۆدا جیهانی تێکەوتووە، دۆخێك کە تیایدا بەشە جیاوازەکانی جیهان لەهەلومەرجێکی چڕو بەهێزو هەمەلایەنی توانای پەیوەندیکردن و پێکەوەبوندان. جیهانگیری جیهانە لەدۆخی سەفەرو گواستنەوەو کۆچ و بەناویەکداچونی ئینسان و ئابوری و کولتورو یاساو نۆرم و بەهاو کێشەو گرفت و مەترسییەکان بەیەکدی، بریتییە لەو پرۆسە تەکنیکی و کۆمەڵایەتی و کولتورییەی کە مانایەك بۆ دووری ناهێڵێتەوەو شتەکان بە جوڵەیەکی خێرا لەیەکدی نزیکدەکاتەوە. هەموو ئەمانەش بەسەریەکەوە کاریگەریی گەورە لەسەر ژیانی سیاسی و ئابوری و کولتوری و ئەخلاقی کۆمەڵگە جیاجیاکان بەجێدێڵێت.[15] ئەو دنیا داخراوەی کە دنیاکانی دیکە ناکەونە چوارچێوەی روانینەکانییەوە دنیایەکی سنوردارە، خاوەنی خەیاڵدانی بچوك و کۆمەڵێك حیکایەتی لۆکاڵییە، بەلام ئەو دنیایەی لەرێی دنیابینییەکی دوورمەوداوە دنیاکانی دیکە قبوڵدەکات و جیاوازییە فیکری و رۆشنبیری و کولتورییەکان قبوڵدەکات، دنیایەکی ناسنوردارەو مەودای حیکایەتە بچوکەکانی تێپەڕاندووە، ئەو کۆمەڵگەیەی بەدیار وێنە بچوکەکانی خۆیەوە، بەدیار دنیای شتە پیرۆزەکانی خۆیەوە بچوکدەبێتەوەو بەشدار نابێت لەو جیهانە گەورەیەدا کە بە ناو جیهانگیرییدا تێدەپەڕێت، کۆمەڵگەیەکە دەکەوێتە پەراوێزی شارستانییەوە، ئەو نەتەوەیەی بەدیار

[15] مەریوان وریا قانیع، شوناس و ئاڵۆزی، 2004، ل23-24

سەرزەمینی رەمزە سواوەکانی خۆیەوە خەیالگە لەسەر خەیالگە کەڵەکە دەکات‌و ناتوانێت دەستکاری ترادسیۆنی باوی روانین‌و کولتور بکات، خەمسارده بەرامبەر ئەو دیارده نوێیانەی جیهانی نوێی گرتۆتەوە، کۆمەڵگەیەکی نەخۆشەو دەبێتە خاوەنی فەرهەنگێکی بچوك، هێندەی چاوێکی گەورەیە تەنها بۆ تەماشاکردنی دنیا، هێندە سەرزەمینێکی گەورەی تەماشاکراوو بەشدار نیە، ئەم روانینەش زادەی تەماشاکردنێکی بێدەسەڵات‌و هەستکردنێکی قوڵە بە هەوابەرزییەکی کولتوری وێران‌و تاریکتر لەهەر بەشێکی فەرهەنگی دنیا کە ناکەوێتە سەر نەخشەی گۆڕان‌و تێگەیشتن‌و گەلاڵەکردنی پرۆژەیەکی فەرهەنگی‌و رۆشنبیری‌و شارستانیی پەیوەندیامێز.

ئەگەر جیهانگیری بۆخۆی خاوەنی مێژوییەکی درێژ بێت، ئەوا جیهانبینیش هەلگری مێژوییەکی دورودرێژترە، بەواتایەك بەرلەوەی جیهانگیری ببێتە مۆدێلێکی کولتوریی سەرتاسەری، جیهانبینی دەبێتە ئەو فلاشباکە گەورەیەی کە بە خەیاڵدانەکانیدا تێدەپەڕێت، هاوکات ئەو داینەمۆ گەورەیەی جیهانگیریش هزری مۆدێرنەیە، واتە ئەوە نوێگەرییە خەیالگەکانی جیهانبینی بەپیت دەکات‌و سەرزەمینە فیکری‌و کولتورییەکانی بۆ دەرەخسێنێت.

هەڵبەت هەر رۆشنبیر یان بیریار نیە دەکەوێتە بەردەم نوێگەری‌و ئەو دیاردە بەرفراوانەی جیهانگیری ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاری تێدەکات‌و کارتێکراو دەبێت پێیان، واتە هەر رۆناکبیر نیە دەستی تازەگەی لەیەخەی گیردەبێ‌و دەیخاتە نێو

تەمومــژو ئاڵۆزیــەکانی خۆیــەوە، بــە واتایــەك، بەڵکــە تــەواوی مرۆڤایــەتی کەوتۆتــە نێــو ئــەم بارودۆخــەوە کــە دیاردەی نوێگــەری خوڵقاندوێتیو ڕاستەوخۆ ئێمە لەناویدا دەژینو پیایدا تێدەپەڕینو دەگەڕێینەوە بۆیو بونەوەرێکی کارتێکراوین، هاوکات تــەواوی ئــەو ئاســتە ژیاریــیە بــە کولتــورو فەرهــەنگو ئــاینو هۆشــیاریو دنیــای سیاسەتو تەکنۆلۆژیا، لەوپەڕی ئــامێری ســەرەتاییەوە بــۆ ئەوپــەڕی پێــشکەوتوو، تــەواوی ســیــستمی ئــابوری جیهــان لــەدنیاو ناوچــە جیاوازەکانــدا (تــەواوی تــەکنۆلۆژیای جــەنگو ململانێــی ســەربازیو جیهانییەکان، بە تەواوی مرۆڤایەتییەوە ڕاستەوخۆ کەوتونەتە ژێــر فشاری تازەگەرییەوەو بە تەواوەتی گــەر لەســەدەی نۆزدەشــەوە بێــت تــا ئــەم ســەروەختە نوێگــەری کــاریتێکردوو‌و بــە ئاقــارێکی دیکــەدا بردووینی).

سەرباری ئەوە هەرچــەند نوێگــەری گوزارشــت بێــت لەدنیایــەکی نوێو تەکنۆلۆژیاو ئاسودەگی نوێ، هاوکــات فاشــیزمو دیکتاتۆریــەتو جینۆسایدی نــوێ نــەوەی دوەمــی نوێگــەرین، بەواتایــەك نوێگــەری تــەنها ڕوویــەکی جــوانو پــڕ ئاشــتیخوازیو ئاســودەگی نیــە، بەڵکــە خاوەن ڕوویەکی ناشرینو دژوارو پڕ کوشتاریشە، بەمانایــەکی دیکــە نوێگــەری بــارێکی نائاســایی دەخاتــەوە لــەنێوان چــێژو شــەڕانگێزیدا، لەنێوان پێشکەوتنو وێرانکردندا. لەلایەك شەڕانگێزی لەکولتورێکی نوێــوە دێتــە ئــاراوە، بەڕادەیــەك زۆر گرانــە ناســینەوەی؛ بۆنمونــە لەکاتێکدا شەڕانگێزی لەبەرگی ئاینیدا دەبێتە چەند پارچەکراوێکی مەزهــەبی دژ بەیــەكو نــاکۆك لەگەوهــەردا، لەکاتێکــدا تــەواوی ئــەو

دژایەتیانە لەسەردەمی نوێداو بە کولتورێکی نوێو بەخەونی نوێوە خۆی ڕادەگەیەنێو بەرگێکی دیکەی پەیوەندیو ڕاڤەکردن دەپۆشێ، لەهەناوی تازەگەریشدا شەڕانگێزی خۆی بەخێودەکات. لەکاتێکدا تەکنۆلۆژیای ئەتۆمی بە دیوێکدا دەبێتە کارخانەی دروستکردنی نوێترین وزە بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی، بە دیوێکی دیکەشدا هەر هەمان کارخانەی وزەی ئەتۆم بۆمبای ئەتۆمی دروستدەکاتو هیرۆشیماو نەکازاکی پێ کاول دەکات. لە کاتێکدا، لەم سەردەمەدا لێکۆڵینەوەکان لەبواری کیمیاداو دۆزینەوەی مادەی نوێو تایبەتمەندیەکانی ئەو مادانەو گونجاندنو بەکارهێنانیان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیو پێشکەوتن بەکاردەبرێ، لەلایەکی دیکەوە هەمان تاقیگەو هەمان کەرەستە هەڵدەستێت بە دروستکردنی بۆمبی کیمیاویو لەجەنگی دوەمی جیهانیو جەنگی ئێراقو ئێراندا بەکاردەهێنرێو هاوکات کوشتارگەکانی دوو جەنگی جیهانی پێ سازئەکرێ، ئەم نمونانەی کە باسمان لێوەکرد، تەنها دیاریکردنی ڕووەکانی نوێگەری بوو بۆ ئاشنابوونو تێگەیشتن لەوەی کە لەم سەردەمە ئاڵۆزەدا ئێمەی مرۆڤ ناتوانین بەو کولتورە هەزارەی ڕوانینی خۆمانەوە، بەو تاك ڕەهەندییەی تێگەیشتنەمانەوە لەنوێگەری تێبگەینو بگەڕێین بەدوای شوناسێکی تایبەتدا بۆ دیاریکردنی پێناسەیەکی شیاوو ڕاڤەکردنێکی سەرەتاییو قوڵ بۆ ئەو دیاردەیە کە پەیوەندی بە تەواوی ژیانو شارستانیەتەوە هەیە.

ئالان تۆرین لە کتێبی "ڕەخنە لەنوێگەری" دەنوسێ: بیرۆکەی نوێگەری پەیوەندییەکی ئەوتۆی هەیە بە عەقلانیکردنەوە.

وازهێنان لەیەکێکیان واتە ڕەتکردنەوەی ئەوەی دیکەیان، بەڵام ئایا دەتوانرێت نوێگەری بۆ عەقڵانیکردن کورتبکرێتەوە؟ ئایا مێژوی پێشکەوتنی عەقڵە، واتە مێژوی پێشکەوتنی ئازادیو ئاسودەگیو سڕینەوەی نەریتەکانو پێبەندیو فەرهەنگە نەریتییەکانە؟ ئەوەی هزری خۆرئاوایی، لەبەهێزترین ساتەوەختی تەماهیبونیدا لەگەڵ تازەگەریدا جیادەکاتەوە، بریتیە لەئیرادەی گواستنەوە لەخولێکی سنورداری پرۆسەی بە عەقڵانیکردنەوە بۆ بیرۆکەی کۆمەڵگەیەکی عەقڵانی پتر سەرتاپاگیر"[16]. ئەگەر عەقڵانیەتی خۆرئاوا وەرچەرخانێکی دیکەی شارستانیەت بێت لەتەواوی خۆرئاواو و دنیادا، ئەوا بەلایکەمەوە لەدیاردەی نوێگەری دێرینترەو فەلسەفەیەکە بۆ خستنەوەی دەرئەنجامێکی وەك نوێگەری، لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر دوا دەرئەنجامی عەقڵانیەت، وەك ئالان تۆرین باسی لێوەدەکات تەواوی ئازادییەکانو هاتنەکایەی ئاسودەگیو بەختەوەری بێت بۆ فەرهەنگو مرۆڤایەتی، ئەگەر لەکردارو داواکاریشدا بێت، هەر مۆرکی عەقڵانیەتە، هاوکات ئەگەر عەقڵانیەت تەنها ڕەتکردنەوەی نەریتو پێبەندی بێت بە فەرهەنگە نەریتییەکان، ئەوا بەر لەهەرشتێك، عەقڵانیەت دروستکردنی نەریتێکی دیکەی ڕوانینو مامەڵەکردنە لەگەڵ دنیاو جیهاندا، بەڵام مامەڵەکردنێکی جیاوازو نوێ، بەئەندازەیەك کە تیایدا زۆرێك لەجیاوازیەکانی خۆی، سەرباری جیاوازیی ڕەوتی بیرکردنەوەو کردەی مامەڵەکردنی ڕەوتە عەقڵانیەکانی ئەو

---

[16] ئالان تۆرین،النقد الحداثة،ترجمة: انور مغیث، درا المجلس الاعلی للثقافة-لا 30.

سەروەختە، تا ئەم کاتەش، لەڕێی ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی نەریتی باوی ڕوانین و کورت مەودایی ڕاڤەکردنی دنیا لەڕێی تاکەیەك تەفسیر و تاکەیەك فەلسەفەوە. بەهەرحاڵ ئەو خاڵەی یان ئەو جومگەیەی نوێگەری بە عەقلانیەتەوە.. یان بە عەقلانیکردنەوە دەبەستێتەوە نەریتشکاندنی عەقلانیەتە، بەواتایەك کاتێك عەقلانیەت هەڵدەستێت بە دۆزینەوەی مەودایەکی دیکە بۆ ڕوانین، کاتێك لەڕێی کۆمەڵە ڕەهەندێکی دیکەوە دنیا دەخوێنێتەوەو داوای کۆمەڵێك مافی دیکە دەکات بۆ مرۆڤایەتی و ئازادییەکی عەقلانیش بەرهەم دەهێنێت لەگەڵ تازەگەریدا یەکدەگرنەوە. هاوکات کۆمەڵێك خاڵی وەرچەرخانی کردەیش دروستدەکەن بۆ هێشتنەوەی ئەو پەیوەندیانە. دوابەدوای دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە ئالان تۆرین بەردەوام دەبێت و دەڵێ: بەر لەهەرشتێك پێویستە ئەم چەمکە بۆ نوێگەری و تازەکردنەوە بەو شێوەیە وەربگرین کە دروستکاری کۆمەڵگەی عەقلانییە ئەم چەمکە هەندێکجار کۆمەڵگە وەك سیستم و بیناکراوێك وێنادەکاتە سەر حیسابی، هەندێك جاری دیکە وا لەعەقڵ دەکات ببێتە ئامرازێك بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی تاکەکەس و چێژ وەرگرتنیان، هەندێك جار وەك چەکێکی ڕەخنەیی دژی سەرجەم شێوەکانی دەسەلات بەکاریدەهێنێ بۆئەوەی ئەو "سروشتی مرۆڤایەتی"یەی کە دەسەلاتی ئاینی تێکومەکانی داوە ئازاد بکات."[17] لەدیاردەیەکی گەورەی وەك تازەگەریدا زۆرێك لەچەمکەکانی ژیان و یاساو چەمکە ژیارییەکانی

---

[17] هەمان سەرچوە، لا 30

نێـو کولتـوری بیرکردنــەوەو هـزری کردەیــی ژیــان دەگۆڕێـت یـان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر تێکەڵدەبن بۆ بارێکی دیکەو فەزایـەکی دیکــە، لەکاتێکـدا لیبیــدۆ لەگــەڵ شــەڕانگێزیدا تێکــەڵ دەبێــت، سەرلەبەری بیرکردنەوەو ڕوانینـەکانی مـرۆڤ دەکەونـە نێـو دۆخێك لـــەقۆناغی گەشەســـەندنی ســـۆزە هەســـتیارەکانو عـــەقڵی شەڕانگێزییەوە، لەکاتێکدا بـە ئەندازەیـەك پێشکەوتنی تـەکنۆلۆژیا دەکەوێتە خزمەتی مرۆڤایەتییەوە، بەڵام لەلایـەکی دیکـەوە هـەمان ئەو تەکنۆلۆژیاو پێشکەوتنە دەکەوێتە کوشتنی ئەو ڕۆحەو تـەواوی شارستانیەتیش دەخاتـە بـەردەم مەترسییەکی گـەورە...بەبێئـەوەی لەبابەتەکە دوربکەوینەوە. نزیك لـەم ڕوانینـەوە، بیریـار جـان پـۆڵ گادامێر دەڵێ: "گۆڕانی کۆمەڵگە بۆ سوپایەکی پیشەسازی مەحکومە بەڕێگەیەکی دەسەڵاتگەراییی"[18] هەڵبەت ئەو میراتـە فەرهەنگییـەی لـە دەسـەڵاتەوە، یـان لەتـەواوی میکانیزمـەکانی دەسـەڵاتەوە بـۆ عەقلانیــەت بەجێــدەمێنێت، هــەمان ئــەو میراتــە لــەقۆناغی عەقلانیەتـدا ناگاتـە تاکەیـەك مـەوداو تـەنها بەیـەك پانتایـشدا تێناپـەڕێ‌و لـەڕێی یـەك کەناڵیـشەوە مامەڵـە لەتـەك کۆمەڵگـەو تاکەکەس‌و دامەزراوەکاندا ناکات، بەڵکە هەماهـەنگ لەتـەك تـەواوی جیاوازیـــەکانی خۆیـــدا، هـــاوڕێ لەتـــەك زۆرێـــك لـــەڕوانین‌و ڕاڤەکردنەکانیـدا بـە تـەواوی ئـەو میراتـەوە مامەڵـە دەکـات‌و لـە بازنەیـەکی دیکـەی ژیانـدا، کـە جیاوازییـەکان، ڕەخنـەکان تیایـدا دەژیـن، دەیانخاتەگـەڕو کـارلێکی دیکـەیان بـۆ دروسـتدەکات، هاوکـات

---

[18] لە ئاماژەیەکی ئالان تورینەوە بۆ گادامێر وەرگیراوە- لە کتێبی ڕەخنە لەنوێگەری.

لەوێـدا،    واتـە لـەو پانتاییـە بەرفراوانـەی زانـینو دەسـەڵاتدا گەورەدەبنو گەشەدەکەن. دوورنەڕۆین دواجار نوێگەری؛ دەبێتـەوە بە خـاوەنی یەکـەمی سـەرجەم ئـەو میراتـە کولتوریو عەقڵانییـەی دەسـەڵاتو عەقڵانیـەتو سـەرلەبەری مێـژووی ڕەتکردنـەوەی نەریتـەکانو ئـەو فەرهەنگـە نەریتیانـەی کـە دنیـا بەیـەك دیـودا دەبینـنو تـەواوی گۆڕانکارییـەکانیش لەیـەك ئاسـتدا دەخـەملێنن. فۆکـۆ لـە کتێبـی "چـاودێریکردنو سـزا"دا دەڵـێ: "تاکەکـەس هەڵکەوتەیـەکی دروسـتکراوە بـەهۆی تـەکنۆلۆژیای تایبـەت بـە دەسەڵاتو ناوی لێدەنێت دیسپلین."[19]

دواجـار ئـەو پەیوەندییـەی نێـوان نوێگـەریو عەقڵانیـەت تـەنها پەیوەندییەکی ڕێژەییە، هەڵبەت ئەمەش ئەوە ناگەیـەنێت لـەنرخو بـەهای عەقڵانیـەت یـان نوێگـەری کەمبکەینـەوە، بەڵکە بـەهاکانی نوێگەری هیچی کەمتر نیە لەدەستکەوتەکانی عەقڵانیەتو مێـژووی هزری مرۆڤایەتی لەساتەوەختی ڕەتکردنەوەی هەنوکەی دیاریکراوی میراتـی کـۆنو نـەریتی بـاوی ڕوانینـی کۆمەڵگـەو ئـاین. لەلایـەکی دیکەوە ئەوەی مرۆڤایەتی دەگەڕێنێتەوە بۆ ساتەوەختی دابڕان یـان دەیخاتە نێو دڵەڕاوکێیەکی کوشندەوە کاتێك پەیوەندییـەکانی خـۆی یان جومگەی پێکەوەگرێدانی بەو میراتەی پێش خۆیەوە، کە بەدەر نیـە لـەمیراتی بیروبـاوەڕی نـەوەکانی پێـشخۆی تازەگەرییـە، یـان بەرئەنجامەکانی خودی نوێگەریو عەقڵانیەتە لەدنیای ئەوڕۆدا.

---

[19] میشێل فوکۆ، چاودێرکردن و سزا، لا196، لە کتێبی (ڕەخنە لە نوێگەری) وەرگیراوە .

جیهـانبینی مـۆدێرن بەرلـەوەی هەڵکەوتەیـەکی نێـو ئاسـتە ژیاریيـەکانی مرۆڤایـەتی بێـت، بەرلـەوەی پانتاییـەکی گـەورەی دروسـتکردنی جیهـانگیری بێـت، سـەرەتا فـەنتازیاو خـەیاڵێکی ئەفسانەیی بوو، کۆمـەڵێك حیکایـەتو خولیـای دورمـەودا بـووە بـۆ گەلاڵـەکردنی روانینێکـی فـەنتازی بـۆ دنیـا، بڕینـی سـنورەکانو دورکەوتنـەوە لەدنیای داخراوی ماڵو هەرێمی ژیانی ئاسایی‌و زادگە، دروسـتکەری روانـینو خەیالگەیـەکی گـەورە بـوو بـۆ مرۆڤایـەتی، لەبەرئەوە ناکرێت ئێمـە بـە کەسایەتییەکی وەك کولۆمبـوس بڵێین تەنها پیاوێکە لەمێژودا، بەڵکە فەرزەندەیەکە لـەدەرەوەی مێـژوو و لەدەرەوەی ئەو دنیا سنوردارەی پێی دەوترێت جوگرافیا، لەدەرەوەی ئەو ترادسیۆنەی کولتورێك لەکولتورەکان دائەرێژێت، ئەو بەرلەوەی زەریاکان ببڕێتو سنورەکان بەجێبهێڵێت خەیاڵدانێکی جیهانی ئـەو دنیابینییـە سەرسـامەی بـۆ دروسـتدەکات کـە دەچـێتەوە نێـو سـەرزەمینێکی دیکـەی روانینـی ئەفـسانەیی‌و رووبـەرێکی دیکـەی دەرەوەی حیکایەتەکانـە. ئەگـەر مرۆڤـی مـۆدێرن کۆلۆمبـۆس‌و هاوڕێکـانی وەك کەسـایەتی لەمێـشکی خـۆی دەربکـاتو زیـاتر وەك روانینو سـەرەتای فەلـسەفەیەکی سـەرەتایی بۆ دنیـابینی تێبگـات، ئـالێرەوە دورخـستنەوەی مـەوداکانی روانـین دەبێتـە مـۆدێلێکی جیـاوازی شارسـتانی کـە لەتوانایدایـە رەهەنـدەکانی بیرکردنـەوە والابکـات بەسـەر پانتاییـەکی بـەرفراوانی روانینـدا، ئـەوە تـەنها تەکنولۆژیا نیە مرۆڤایەتی هاندەدات بۆ دۆزینەوەی دیکەو روانینـی دیکە، بەڵکە ئەوە خـەیاڵو خولیاکانـە، ئـەو فەلـسەفەی روانینـە کە

دنیاکـــان لەیـــەکتری نزیکدەکاتـــەوەو رەمزەکـــان‌و پیرۆزییـــەکانی نیشتیمان دەخاتە بـەردەم مەتـرسی کالّبونـەوەو تێکـەڵبوون بـەدنیا، مەریوان وریا لەم بارەیەوە دەنوسێ: هەمیشە لەپاڵ خەون‌و خولیـاو ئارەزووی مرۆڤدا بۆ کۆکردنەوەی جیهان لەماڵێکدا، ترس لەهێرشی هەمان جیهـان بـۆ نـاو ئـەو ماڵـە لـەئارادا بـووە، لـەپاڵ ئـارەزوی بـە هـاوڵاتیبونی جیهانیـدا تـرس لەکێـشەو گرفـت‌و نەهامەتییـەکانی تێکـەڵاوبون بـــە نـــەناس‌و نـــەزانراو ئامـــادە بـــووە. شانبەشـــانی پێکەوەبون‌و خەونی سەرتاسەری‌و جیهاننیشتیمانی، ترس لەنەمانی سنور، ترس لەکەوتنە نـاو پانتـایی بێـسەرەتاو بێکۆتـایی‌و بێمـەودا، تـرس لەنەناسـراو، تـرس لەدەسـتدانی دڵنیاییـە سـادەکان هەمیـشە بەشێك لەرۆح‌و وێناکردنەکانی مرۆڤ بووە[20]...، هاوکـات خـودی ئـەو جیهانبینیـەش یان خولیای جیهانگیریش مەترسییەکی گەورەیـە بـۆ تەواوی ئەو کەرەسـتەو خەیاڵـە لۆکاڵیانـەی کـە دەیانـەوێت روانـین‌و فـــەنتازیاکانی دنیـــابینی لەچوارگۆشـــەیەکی کۆنکرێتیـــدا بـــەناوی نیـــشتیمان یـــان نەتـــەوە یـــان کولتـــورەوە بەندبکـــەن‌و تێکـــەڵی شوناسـێکمان بکـەن خـاڵی لـەروانین، بـەتاڵ لەهـەر دنیابینییـەکی دوورمـەودا، ئـەو ترسـە تـەنها ترسـێکی کـاتی نیـە، بەڵکـە ترسـێکی خۆرسکە، سـەردەمانێکە ئـەم خولیـاو ترسـە لەگـەڵ مرۆڤـدا دەژیـن، ترسی لەدەستدان بەرەنجامی ترسە لەتێگەیشتن لەنەزانراو، هاوکـات بـەرەنجامی دووركەتنەوەیـە لـەکولتوری بـاو، خـەیاڵی لەقاڵبـدراو، ترسـە لەدەسـتدانی نـەریت‌و ئـەخلاقی مامەڵـەکردن لەگـەڵ ژیـان‌و

---

[20] شوناس‌و ئاڵۆزی، ل20

دنیای شته پیرۆزەکانو هیماو بەها کۆمەلایەتیو کولتورییەکان، بەلام دنیای مۆدێرن دنیایەکی بێرەحمە، بەواتایەك دنیاکە بۆ ئاوێتەبونو نزیکبونەوە، دنیایەکی گەورەیە بۆ بچوکردنەوەی نیشتیمانو کولتورو کۆمەلگەکانو ونکردنی شوناسە نەریتییەکان، دنیای مۆدێرن دنیای حیکایەتە بچوکەکان نیە، رەنگە دنیای تاکەیەك حیکایەتی گەورەی بێکۆتایی تەواوی مرۆڤایەتیی بێت، بەلام دنیای حیکاتە گەورە لابەلاکانیش نیە، دواجار دنیای ئەو حیکایاتانەیە کە دەتوانن گوێ لەحیکایەتەکانی ئەوانی دی بگرنو بەشداربن لەتێگەیشتنو گۆڕانکاریو کالکردنەوەی ئەو مێژووە دوورودرێژە نەریتیو ئەخلاقیو کۆنپارێزییەی کە دنیا بەسەر دوو مەودای داخراوی بێقسەدا دابەشدەکات، واتە دابەشکردنی دنیا بەسەر قەدەغەو ئاساییدا، حەرامو حەلالدا.

## کۆنخوازیو نادنیابینی

بەلام دنیابینییە جیاوازەکان شانبەشانی ئەو کۆنخوازیو نەریتپارێزییە بەردەوامبونی خۆیان وەرگرتووە،..ئەوەمان لەبیرنەچێت کۆنخوازی بۆئەوەی لەسەردەمە نوێکاندا نەمرێ، فۆرمی جیاجیا دروستدەکاتو رێگاو شێوازی جۆراوجۆر بەکاردەباتو وێنەی جۆراوجۆر لەسەر خۆیو ئەو میراتییە کولتورییە دروستدەکات. ئەورۆکە نەوەکانی پێشوو بەو کەرەستە کۆنانەی خۆیانەوە لەبێئاگاییەکی گەورەدا دەگوزەرێن، لەخەیالێکی پڕ لەیادەوەریدا دەژین، لەئاکامێکی سەرتاسەریدا ئێستاو ئایندەو مێژوویان پێکەوە گرێداوە، خاوەنی

خەیاڵدانێکن بۆ بەخێوکردنی بێمانایییەکان، بۆ تۆکمەکردنی ناوەندو سەرتاسەرییەکان، بۆ دانانی ئەو کۆڵەکانەی کە کۆنخوازی لەسەری رادەوەستێ. بۆ داگیرکردنی پانتاییەکانی بیرکردنەوەو تێڕوانینی نوێ، بەلایکەمەوە هزرێکی تاریك لەدیوە نادیارەکانەوە ئامادەیە بۆ داگیرکردنی ئێستاو دووبارەکردنەوەی خۆی.

کۆنخوازی نایەوێت لەئێستادا نەژی، نایەوێت لەئێستاو داهاتوو خۆی دابڕێت، خوازیار نیە تەنها لەمێژوویەکی تاریكو لەشارستانییەتێکی دووردا بگوزەرێ، بێزارە لەبێماناییەکانی خۆیو شەیدای ژیانێکی نوێیە لەئێستادا، بەلام بەهەمان کەرەستەو هزرو عەقڵی پێشووەوە، بەهەمان خەیاڵو رامانو بێئاگاییەکانی خۆیەوە دەیەوێت لەئێستادا ئامادەگییەکی هەمەلایەنی هەبێت، دەکارێ لەسفرەوە دەستپێبکاتەوە، دەیەوێت تا دوایەمین ژمارە لەگەڵ نەوە نوێکاندا گوێزی خۆی بژمێرێو کەرەستە کۆنەکانی فەنتازیا داغڵی ئێستا بکاتەوە. بەلام ئەو دنیابینییە جیاوازەی لەدەرەوەی ئەودا دەژی بەلایکەمەوە جیاوازییە هەرە جەوهەرییەکانی ئەو دەدۆزێتەوەو شوناسیی واقعی ئەومان بۆ دەردەخات. هەڵبەت ئەوە دنیابینی مۆدێرنە کە لەتوانایدایە دنیا داخراوەکانمان بۆ کەشفبکاتو کاردەکات بۆ دۆزینەوەی ئەو بۆشاییەی گەورانەی کە لەنێوان دنیاکەی تۆو روانینەکانی ئەوانیدیدا لەئارادایە، کاردەکات بۆ بەستنەوەی ئێستا بە هەنوکەکانی روانینەوە، بەستنەوەی هەنوکەکانی روانینیش بە ستارکچەرێکی کراوەترەوە، کە سەرلەبەری کایەو پێکهاتەکانی لەپانتاییەکی بەرفراوانی روانینو هەنوکەدا بگوزەرێت.

## فەزای کراوە

کارکردن لەفەزایەکی کراوەدا، شوناسێکی دیکەو خەیاڵگەیەکی دیکەی هەیە، هێمایەکە بۆ ڕەتکردنەوەی داخران و شکاندنی وێنە دووبارەکانی ئەو سەرزەمینە زەمەنییەی کە ناوی شوێن و جوگرافیای بیرکردنەوەو خەونەکانە، جیاوازی ئەو جیهانبینییە لەسەرەتاوە لەو فەزا کراوەیەوە دەستپێدەکات کە خاڵییە لەهەر فیگەرێکی وەستاو بێجگە لەکارئەکتەرەکان، خاڵییە لەهەر مەودایەکی زەمەنی دیاریکراو، لەڕاستیدا خۆیبۆخۆی ئەم کارکردنە هەوڵێکە بۆ کردنەوەی مەودایەکی دیارکراو بۆ ڕوانین، هێندەی ئیشکردنە لەعەقڵدا ئیشکردن نیە لەشوێندا، هێندەی جیاکردنەوەی زەمەنە لەپێکهاتە کۆنکرێتییەکانی و دابەشکردنەوەی بەسەر ڕوانین و فەرهەنگ و دنیابینییەکاندا هێندە ژیانکردنە لەگەڵ زەمەنی ئاسایدا، بەواتایەك ئەزمونێکە بۆ بەرهەمهێنانی گوتارێکی جیاوازو، دنیابینییەکی جیاواز لەڕێی تێکستێکەوە کە لەخەیاڵدانی ئێمەدا مەودایەکی کراوەترو نابەرجەستەی پەیوەندیامێزی دروستکردووە.

## نۆستالژیا و بێهودەیی

کۆکردنەوەی ئەم دوو چەمکە لەیەك وتاری دیاریکرودا خۆی بۆخوی کارێکی قورسە، لەبەرئەوە هەریەك لەم دوو چەمکە سەر بە چەند قوتابخانەیەکی فیکری و فەلسەفی جیاوازن، هەرچی نۆستالژیایە بەرهەمی کارکردەیەکی هزری واقع و ئەدەبی کلاسیکە،

هەروەها ئامادەگی بەردەوامی ئەم چەمکە لەهزری مۆدیرنەدا کلێشەیەکی دیکەو رەنگێکی دیکە وەردەگرێت، دەبێتە تێزێکی دیکە لەخەیاڵدانی ئەدەبیو لەهزری هاوچەرخدا، نۆستالژیا کە سۆزێکی گەورەیە بۆ رابردوو، بۆ نیشتیمان، بۆ عیشق، بۆ خەونەکان. هەموو ئەمانە لەکلێشەو مەودای جیاجیادا لەدنیای هاوچەرخدا بەفۆرمێکی دیکەو بەدنیابینییەکی دیکە دەردەکەون، ونبونی ئەم دنیابینییە، ونبونی یادەوەریو ئەو حیکایەتانەیە کە لەپشت هەر روانینێکی نۆستالژیەوەیە، بەلاَم ئەزمونی دنیای داخراو لێوانلێوە لەنۆستالژیاو، پرە لەگەڕانەوە بۆ ئەو خەونانەی کە گرێدراون بەو سۆزو نیگەرانیانەوە، هاوکات دەرچوون لەحیکایەتەکان دەرچوون نیە لەنوستالژیا، هەروەها دوورکەوتنەوە لەیادەوەری یەکلایکردنەوەی ئەو نیگەرانیانە ناگەیەنێت، بەڵکە پتر کارکردنە بۆ هەڵپەساردنی ئەو دنیایەی کە دەکەوێتە نێوان یادەوەریو سۆزو نیگەرانییەکان. هاوکات ئەوەی دەکەوێتە نێوەندی دڵەڕاوکێو بێهودەییەکانەوە گەڕانەوەیە بۆ ئەو زاکیرە داخراوە، پتر ئەو هێزی راکێشانەیە کە لەدەرەوەی دنیابینییەکانو لەدەرەوەی ترادسیۆنی نوێی ئەو ئاستە ژیارییە کاردەکات بۆ رامکردنی زەمەنو شوێنو مرۆڤو پانتاییەکان. دەرئەنجام ئەو خەیالگەیە دەگەڕێت بەدوای دۆزینەوەی جوگرافیایەکی داخراودا بۆ دابەشکردنی هێزو روانینی خۆی بەسەر زەمەنو گۆڕانکارییەکاندا.

## مۆدێرنەو جیهانبینی

نوێگەری لەڕاڤەکردنێکی هەرە سەرەتاییدا تەواوی ئەو ڕەخنە نوێیانەیە کە ئاڕاستەی دنیای کۆن‌و کولتوری نەوەکانی پێشوو دەکرێ، هاوکات کۆمەڵێك ڕوانینی نوێیە لە وەرچەرخانێکی درێژخایەنی عەقڵی مرۆڤایەتیەوە هاتۆتە گۆڕێ، کەمتازۆر زۆرێك لەبیریارانی ئەو دیاردەیە دەیگەڕێننەوە بۆ دۆزینەوەی کەرەستە هەرە کاریگەرەکانی پرسیارو گومانی مرۆڤایەتی لەمێژووی دێرین‌و نوێی سەرهەڵدانی شارستانیەت، بۆ سەروەختێك کە تیایدا زۆرێك لە چوارچێوە دیاریکراوەکانی شوناس‌و ڕاڤەکردنی دنیا کەوتونەتە بەر مەترسی هەڵوەشاندنەوەو فرە شوناسی، هەڵبەت بە دیوێکدا ئەو پرسیارانە کۆمەڵێك ڕەخنەی جدیش دێنێتەکایەوە، کۆمەڵە ڕەخنەیەك کە تەواوی نەریتی باوی ڕوانین‌و بۆچون‌و تێگەیشتنەکانی مێژوی دێرینی بیرکردنەوەو عەقڵ دەخاتە بەر مەترسی هەڵوەشاندنەوەو ڕاڤەکردن‌و گۆڕانکاری‌و ململانێوە، ئەوەی نوێگەری لەدیاردەکانی دیکەو لەڕوانینەکانی دیکە جیادەکاتەوە ئەو ئاستی جیهانبینییەیە کە شانبەشانی نوێگەری هزرو ڕوانینەکان فەزایەکی کراوەی گفتوئامێزو پەیوەندیامێز دروستدەکات بۆ بەرهەمهێنانی ئاستێکی ژیاری کراوەتر لەپانتاییەکی بەرفراوانی ڕوانیندا، بەڕای "ئۆکتـــــافیۆ پاز"،نوێگەری ڕەخنەیەکی سەرتاسەرییە لە تەواوی پێکهاتەو کەرەستەکانی ژیان‌و ژیاری‌و گۆڕانکاری‌و عەقڵی بیرکەرەوەی مێژوو، بۆیە لەکتێبی "شیعرو کۆتاییەکانی سەدە"دا دەنوسێ: "سەرەتا نوێگەری بەو سیفەتە

دەستیپێکرد کە ڕەخنە بوو لەئاین‌و فەلسەفەو ڕەوشت‌و یاساو مێژوو، ئابوری‌و سیاسەت، ڕەخنە دیارترین سیفاتی جیاکەرەوەی بوو، هاوکات سەرجەم ئەو شتانەی سەردەمی نویٚ نوێنەرایەتی دەکات دروستکراوی ڕەخنەیەکە، بە واتایەك لێپێکهاتوی میتۆدێکە لەگەڕان‌و خولْقاندن‌و فرماندا. چەمکە بنەڕەتییەکانی سەدەی نویٚ پێشکەوتن‌و گەشەکردن، شۆڕش، ئازادی، دیموکراسی، زانست‌و تەکنۆلۆژیا کە لەبنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ ڕەخنە".[21] ئەو ڕاڤەکردنەی ئۆکتافیۆپاز، سەرەتایەکە بۆ تێگەیشتن لەچەمکی نوێگەری‌و هاوپەیوەندی لەتەك ڕەخنەو عەقلاْنیەتی بیری مرۆڤایەتی. بەگشتی ئەو دنیایە بەسەر دوو بازنە، یان دوو پانتایی جیاوازو دژاودژدا دابەشدەکات، لەلایەك دنیایەك هەیە هەلْکەوتەی ژیان‌و بیرکردنەوەو مێژووی ئێمەیە کە تیایدا کولتورو بیروباوەڕو دابونەریت‌و ئاین‌و سەرەتاکانی تێگەیشتنی ئێمەی مرۆڤی تیادا کۆبۆتەوە، ئەگەر ئەو دنیایە، دنیای دێرینی ئێمە بێت، ئەوا لە بارێکدا واقع‌و ڕابردوو سەرچاوەی مەرجەعی گەڕانەوەی ئێمەیە بۆ ژیان، ئەگەر لێرەدا بەناچاری بگەڕێینەوە بۆ کۆمەلْێك چەمك، کە دەتوانین لەڕێیانەوە ئەو دنیایەی پیٚ ڕاڤەبکەین‌و زۆرێك لەو ڕەگەزە دیارو نادیارانەی هەلْوەشێنینەوە.

کەواتە ڕەگەزە هەرە دیارەکانی کولتوری کۆمەلاْیەتی کۆمەلْگەیەك لەتەواوی جیاوازی کۆمەلْگەکانی دیکەدا، لە پێناسە گشتییەکەیدا بریتیە لەتەواوی ئاگایی گشتی کۆمەلْگەیەك،

---

21 ئۆکتافیۆ پاز- شعر والنهایات القرن. و: ممدوح عدوان-دارالمدى- لا31

لەهۆشیاری گشتییەوە تائەوپەڕی ڕەگەزە نادیارەکانی بیرکردنـەوەی کۆمەڵایـەتی کۆمەڵـە مرۆڤێکـی هاوڕەگـەز یـان هـاوکولتور، لـەو نێوەندەشدا دابونەریتو یاساو بیروباوەڕی گشتیو ڕەمـزو فـەنتازیاو نمایـشی هاوتائـامێزی پێکهاتـە کۆمەڵایەتییـەکانی کۆمەڵگەیـەك، هەڵبـەت ئـەوەی لێـرەدا مەبەسـتی ئێمـە دەوروژێنێـت، بەتایبـەتی لەنێوەنـدی زانینـەوە بـۆ نێوەنـدی نوێگـەریو جومگـەی بەیەکـەوە بەستنەوەی نوێگـەریو ڕەخنـە، سـەرباری ئـاڵۆزی جیاکردنـەوەی ئـەو چـــەمکانە لەیـــەکتریو پۆلێنکردنیـــان لـــەڕووی ئەکادیمیـــەوە، پەیوەندییەکانی ئەو نێوەندە مەعریفییە پەیوەندیگەلێکی دابڕاو نیەو بـــەدەر نیـــە لـــەکۆی پڕۆســـەکەو هاوکـــات خـــاڵی دەســـتپێکردنو سەرەتایەکیشە بۆ گەڵاڵەکردنی پەیوەستنامەیەکی شارستانیی جیهـانی کەتەواوی کۆمەڵگەکانی دنیـا دەگرێتـەوە، ڕاستەوخۆ یـان ناڕاستەوخۆ دەکەونــە ژێــر کاریگــەری ئــەو پەیوەســتنامە مەعریفییــەوە کــە عەقڵانییـــەت لـــەنێوان نوێگـــەریو ڕەخنـــەدا گەڵاڵـــەیکردوەو دەرئەنجامەکانی کەمتازۆر لەخۆرئاوادا دەرکەوتون، بەڵام کۆمەڵگەیـەك نیـە لـەدنیادا لـەدەرەوەی ئـەو مەجرایـە بگـوزەرێو لەپـەراوێزی کاریگەرییە نادیارەکانی تازەگەریدا بژی. بـەختیار عـەلی لەنوسینێکیدا دەربارەی نوێگەری دەڵێت: "وشەی نادیـار وشـەیەکە دەشێت چـەندەها مانـای جیـاوازو جیـاوازو قاڵبو سنووری جیاجیـا لـەخۆبگرێت، بـەڵام لەبەرئەوەی پەیوەندی نێـوان نادیـارو نوێگـەری پەیوەندییەکـە هێـشتا دیارینـەکراوە، لەبەرئـەوە هـەر دەقێـك کـە لەتاریکییـەوە دێـت، هـەر ئایدایەك کە لەبەرگی نادیاری دۆزراوەدا خۆی دەخاتە ڕوو..مافی ئـەوە

دەدات بەخۆی ناوی تازەگەر بەسەر خۆیدا ببڕێت. تا ئەمڕۆ هیچ زانیاریەکمان دەربارەی نادیار نییە، لەبەرئەوە هەموو دەقێك، هەموو نوسینێكو هەموو نوسەرێك دەتوانێت بێتو بڵێت من لەنادیارەوە هاتووم، من کوڕی تاریکییەکانی ناو نادیارمو لەو تاریکییەوە سەرمهەڵداوە. لەم جۆرە ڕۆشنبیریانەدا کە ململانێی زانستی تیایدا ونو بەرتەسکە، دەشێت هەموو پارچەکان هەموو بەشەکان ناوی تازەگەر لەخۆیان بنێن، کە نوێگەری زەمەنێك بێت تیۆریزە نەکرابێت. هیچ سنورێکی بۆ دیارینەکرابێت، مانا مەعریفییەکانی ونبێت، سیفەتێك نەبێت بەرهەمە دێرینەکانی جیابکاتەوە... سیستمێکی پێوانەیی نەبێت نوێگەری لەتەقلیدو ئاسایی جیابکاتەوە هەموو یەکێك لای خۆیەوە بۆی هەیە ناوی تازەگەر بەسەر ئەزمونی خۆیا ببڕێتو واقیعی حاڵیش (لە ڕۆشنبیری ئێمەدا) هەروایە"[22]، نادیار ئەو خاڵی پەنهانەیە کە گەڕانەوەیە بۆ پانتاییەکی بێکۆتای نادیاریکراو لەزانینو پشکنینو دۆزینەوە، لەبەرئەوە کارێکە لێوانلێو لەفەنتازیاو حیکایەتی جۆراوجۆر، تەواوی ڕوانینو بۆچونەکانمان دەخاتەوە نێو گومانێکی سەرتاسەرییەوە، هاوکات ئەوەی لەپەنهانەوە ئاڕاستە دەکرێ، ئەوەی لەنادیارەوە دێتە ئاراوە، ئەو دیارە نیە کە لەبەرچاوی ڕوانیندا ڕووتدەبێتەوەو تەواوی ڕوەکانی خۆی بۆ جیاوازییەکانی دەرەوەی خۆی ئاشکرادەکات، ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ نادیار، بەڵام نادیار سەرباری ئەوەی لەپەنهانەوە هاتوەو شوناسێکی دیاریکراوی نیە، لەتواناشیدایە

---

22 بەختیار عەلی، دیارو نادیار (2)ئیمپراتۆریەتی وەهم، مانای نوێگەریو...، گۆڤاری ڕەهەند،ژ5/ 1998-لا35-36.

بگەڕێتەوە بۆ نادیارو لەوێشەوە خۆی جارێکی دیکەو لەزەمەنێکی دیکەدا بەرەو دەرەوەی پەنهان ئاڕاستەبکاتەوەو لەتەواوی ڕوناکییەکانی سەردەمی نوێدا خۆی دوبارەبکاتەوەو پەیوەندییەکی دانەبڕاوی دیکە لەگەڵ تەواوی دەرکەوتوەکانی دیکەدا بخاتەوە سەر نەخشەی روانینو دنیابینییەکانی خۆی، کلێشەسازیەکی تازەگەرانەی دیکە لەزەمەنێکی دابڕاوی خۆیدا بهێنێتە ئاراوەو بەسەردەمی نوێدا تێپەڕێتەوە. گەر لێرەدا نوێگەری وێنەی کلێشەسازێکی خەیاڵی یان واقعیی بێت، ئەوا دەکرێ پرسیار لەو بکەین، ئایا نوێگەری ڕەتکردنەوەی سەلەفو بیروباوەڕی نەوەکانی پێشووە؟ یان هەماهەنگیەکی دۆستانەیە لەتەك تەکنۆلۆژیاو عەقلانیەتی پێشکەوتن؟ ئایا نوێگەری تەنها وێناکراوێکی خەیاڵییە بەرامبەر فەرهەنگیی نەریتی باوی ڕوانینو تەفسیرکردنی دنیا، ئایا پەیوەندییەکانی نوێگەریو عەقلانیەت دەکەونە کوێی ئەو دەرئەنجامو کارلێکردنەوە؟ ئایا نوێگەری زەمەنێکی دیاریکراوی هەیە، ئایا خاوەن فەلسەفەیەکی دیاریکراوە کە سیفاتەکانی بناسینەوە، ئایا قۆناغێکی دابڕاوە لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی، ئایا ئەو ساتەوەختە زنجیرەیەکی بەدوایەکداهاتوی ڕەخنەییە لەسەرەتای گومانەوە تائێستا "وەك هنری لۆڤیڤەر نوێگەری دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕەخنەو ململانێی نێوان کۆنو نوێ"؟ کەواتە ئایا نوێگەری تەنها ڕەخنەیە لەکۆنو سواوو باوو نەریتو دنیابینی نەوەکانی پێشوو؟ تەواوی ئەم پرسیارانە بەرەو کلێشەسازییەکی دیکەمان دەبات کە سەرەتاکانی تازەگەرییە لەرووبەرێکی نادیاریکراوی مێژوودا، هاوکات بەردەوامبونێکی بێهودەشە لەعەقڵەوە بۆ نوێ، لە کۆنەوە بۆ تازە، لەواقعەوە بۆ خەیاڵو

وێناکردنی دنیایەکی دیکەو خەیاڵێکی دیکە بۆ ژیانو گۆڕانو پێشکەوتنو گواستنەوەی چەمکەکان لەقۆناغێکی ناهەستیارەوە بۆ قوناغێکی هەستیار، لەرووبەرێکەوە بۆ رووبەرێکی دیکەی روانین، ئۆکتافیۆ پاز سەبارەت بە نوێگەریو ئەو ڕەخنانەی پشتیوانی لەنوێگەری دەکەن، کە لەپێشدا ئاماژەمان پێدا، دەڵێ:"هاوکات ئەو ڕەخنەیە کۆمەڵێك ڕەخنەی دیکەشی گرتەخۆ، ڕەخنە لەجیهان، ڕابردوو و ئێستا، ڕەخنە لەڕەهاکانو بەها ترادیسیۆنیەکان، ڕەخنە لەدامودەزگاکانو دابونەریتو سۆزو هەستگەراییو سێکسگەری: لەڕۆسۆ، دیدریۆ، شەدرلۆدو لاکلۆ، ساد، ڕەخنەیەکی مێژوویش لەجیبۆنو مۆنتسیکۆ، دۆزینەوەی(ئەوی دی) لەچینو فارسو هیندەسورەکان، هاوکات گۆڕانکارییەکی دیدگایی لەگەردونو جوگرافیاو فیزیاو بایلۆژیادا. لەکۆتاییدا نوێگەری ڕەخنەیەکی بەرجەستەبووە لەڕووداوە مێژوویەکاندا: شۆڕشی ئەمریکیو شۆڕشی فەرەنسیو بزووتنەوە سەربەخۆییەکان لەکۆلۆنیالەکانی ئیسپانیاو پورتوگال"[23].

گەر لێرەوە بگەڕێینەوە بۆ کاریگەرە هەرە دیارەکانی ڕوانینی مرۆڤەکان بۆ ڕابردوو، بۆ مێژوو، بۆ شوێنەواری کاریگەری قۆناغی ئاستە ژیارییەکان لەمێژوودا، لەو گەڕانەوە مێژووییەی ئۆکتافیۆ پاز بۆ نوێگەری تێدەگەین، کەواتە پێکهاتە هەرە دیارەکانی ئەو دنیایە، سەرەتاکانی بیروباوەڕی مرۆڤایەتی گەڵاڵەدەکات، هەڵبەت جوگرافیایەکی نادیاریکراوی مەعریفیشە، لەڕێیەوە مرۆڤەکان دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە، سەرچاوەکانیش تەنها مێژوویەکی دوورنین،

---

23 ئۆکتاڤیۆ پاز- شعر والنهايات القرن. ترجمە: ممدوح عدوان-دار المدى- ص31

کە گەڕانەوە بۆی زەحمەتو گران بێت، ڕەنگە ئەو سەرچاوە کولتوریانەی مرۆڤایەتی بەگشتی لەئاستێکی سروشتی وادا دەهێڵێتەوە، کۆمەڵێك پەیوەندی هەڵکەوتەی ژیانو مامەڵەکردنو تێگەیشتنو ململانێ بخولقێنێت. کەواتە دنیای ئەو پەیوەندییە جیاوازانە کۆمەڵە بەرجەستەکراوێکی مرۆییە، هاوکات گەڕانەوەیەکی زۆر ڕۆحیو خەیاڵی مرۆڤەکانە بۆ تەواوی ئەو سەرچاوانە؛ بۆنمونە ئاین پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیو کولتوریە کە تیایدا کۆگەڵێ ترادسیۆنی ئەخلاقی، نەریتی، ڕوانینگەرایی کۆدەبنەوە، سەرباری ئەوە پەیوەندیەکی زۆر ڕاستەوخۆیان هەیە بەڕەچەڵەکەوە، یەکێك لەو سەرچاوانە گەر زیادڕۆیی نەبێت، ڕەچەڵەکە، ئەم چەمکەش زۆر نوێ نیە، بەڵکە زۆر دێرینە، بەڵام بەردەوام ئامادەگییەکی مێژووییو کردەیی کولتوری هەیە لەکۆی ساتەوەختە ئارامو گۆڕاوەکانداو دەمانکاتەوە بە بونەوەرێکی ئامێراساو پڕماندەکاتەوە لەنۆستالژیا بۆ رابردویەك کە پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتەوە تێکەڵەیەکی ئاڵۆزو جیانەکەرەوەیە.

## کۆنخوازیو نەریتپارێزی

کۆنپارێز بۆئەوەی خۆی بەکوڕی هەموو سەردەمەکان بزانێت، بۆئەوەی لەهەموو بارودۆخەکاندا خۆی دوبارەبکاتەوە، بۆئەوەی خۆی بکات بە ماڵی هەموو زاراوەکانداو جارێکی دیکە بە خەیاڵی خۆیو بە روانینی خۆی تەفسیریانبکاتەوە؛ هەڵئەسێت بە بەکارهێنانی شێوازی خاوەنداریێتیو خۆی بە خاوەنی سەرلەبەری

هـەبووەکان، سـەرلەبەری روانینـەکان دەزانێـتو خۆیدەکاتـەوە بـە سەرچـاوەی دنیابینییـەکان. خـاوەنی فەلـسەفەیەکە بـۆ بەرجەستەکردنەوەی دنیا لەفەرهەنگەکەی خۆیدا، هاوکات خـۆی بـەخاوەنی رۆشنبیریو کولتـورو فەرهـەنگی گشتیو جیاوازییـەکان دەزانێـت، خـۆی بـە دایکـی هـەموو گروپـەکانو هـەموو روانینـەکان دەزانێت، خۆی دەکات بە مەرجەعی شارستانیو روناکبیریو ئاستە جیاجیاکانی دنیابینی، ئەو دەیەوێت بلێت هـەموو ئـەو روانینانـەی تـۆ لەهەگبـەی روانینـەکانی منـەوە هاتونەتـە دەرەوە..(هەڵبـەت هەموو وێناکراوەکانی کۆنپارێزیی درۆیـەکی گـەورەو فەنتازیایـەکی داخـراوی لەپـشتەوەیە)، ئـەو ئەگـەر لەتوانایـدا بوایـە دەیـوت: هـەمووتان لەمنـەوە سەرچـاوە دەگـرنو لەمنـدا کۆتایتـان دێ.. لەمنەوە بیردەکەنەوە بە مندا تێدەپڕنو لەمنیشدا خـەیاڵتان تـەواو دەبێت...ئەو دەیەوێت بلێت ئەم سەردەمە نوێیە من خولقاندومـەو مـنم خـاوەنی هـەموو سـەردەمەکان (کۆنپـارێز هێنـدەی لەمـەرگی خـۆیو کاڵبونـەوەی خـۆی دەترسـێت، هێنـدە لەتـەوژمی نـوێو دنیـابینی نـوێ ناترسـێ، بـەڵام مـەرگی ئـەو لەنادنیابینییـەکانیو گەندەڵییە مەعریفییەکەیەوە سەرچاوە دەگرێ).

گەورەترین بێئاگایی لەوێوە دەستپێدەکات، کـە کاتێك دەگەینـە بـاوەڕێکی دیـاریکراوی رەهـا بـۆ دنیـاو دروسـتکردنی وێنەیـەکی بەرجەسـتە وەك وێنـاکراوێکی ئایـدیاییو فەزایـەکی داخـراو بـۆ خۆمـانو روانینمـانو کلێـشەیەکی تایبـەت بـۆ تاکەیـەك چەشـنو نەخـشەی دنیـابینی دروسـتدەکەین، لـەوە خـراپتر ئەوەیـە کاتێـك

دەگەینە باوەڕێکی تەواو سەبارەت بەوەی شتێك لەشتەکان، فەزایەك لەفەزاکان، دنیایەك لەدنیاکان کۆتاییان هاتووە، بەو نیازو مەبەستە داخراوەی خۆمان کە دەبێت هەموو شتێك پەیامو پێغەمبەرێکی هەبێت، دەبێت سەرلەبەری هزرەکانو بیرکردنەوەکانو لێکۆڵینەوەکانو داهێنانەکان ئاڕاستەیەکی دۆگماتیکی سنورداریان هەبێتو گوزارشت لەفەزایەکی دیاریکراو و دنیایەکی داڕێژراو بکەن لەبناغەوە تا کلێشە واقیعیو فەنتازیو رەمزییەکانی، هاوکات دەربڕی تاکەیەك گوزارشتو تاکەیەك قسەبێت، گەر قسەی دیکەش هەبێت، دەبێت دوبارەبوەکانی خۆی بن. مەعشەرەکانی ئەم بیرۆکەیە بەتوندی داکۆکی لەدوبارەبونەوەی خودو کولتورو کەلەپورو رەگەزەکانی یادەوەریو تێڕوانینو چەمکەکان دەکەن. لەپاڵ ئەو داکۆکییەدا ستراتیژێکی خەتەرناك خۆی مەڵاس داوە، ئەو ستراتیژە پەرجوویەك نیەو رێکەوتێکی نەشازی دابڕاویش نیە لەنێوەندی بیرکردنەوەی کۆی بنەما پەیڕەوسازییەکانی پێوانەیەکی هەمیشەیی بۆ بینینی دنیاو گوزارشتەکان، بۆئەوەی خۆمان لەدوبارەبونەوەی ئەو پەیامە رزگاربکەین، دەبێت بەرلەهەر شتێك، بەرلەهەر خەیاڵێکی جیاواز مەوداکانی دوبارەبونەوە، روانینەکانی، پەیامەکانی، پێوانەکانی، پێبەندیەکانیو خەیاڵدانەکانی دوبارەبونەوە بناسینو شوناسەکانی دیاریبکەین. گەمژەییە لەو باوەڕەدابین دنیای پڕ دوبارەبونەوە بەدوای جیاوازیو ئەفراندندا ناگەڕێ، لەبەرئەوەی بونەوەرەکانی ئەو دنیایە سەرقاڵی کردنەوەی دەروازەگەلێکی داخراون کە بەسەر رووی خۆیانو دنیادا

دایانخستووه، بەڵام کەرەستەگەلێکی کۆن و سواو بەکاردەبەن، هەڵبەت ئەم خەمەش وەك ئەو گەشتە دێتە پێشچاو کە بەم شێوەیە دەستپێدەکات: من زۆر دەرەنگ بەشەمەندەفەرێکی بوخاری سەدەی نۆزدە دەگەمە وڵاتێکی دیکە، بەڵام بە فڕۆکەیەکی تیژڕەو ئەوەندەم پێناچێ، هەرچەند گرنگ نیە من بەچی دەگەمو تۆ بەچی دەڕۆی، بەڵکە ئەوەی مەبەستە تۆ لەکاتی ئەو سەفەرەدا خواردن دەخۆی، یان کتێب دەخوێنیتەوە، یان ئەڕوانیتە سروشتو دەستت لەملی کیژێك دایەو پڕاوپڕی لەعیشوە. لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە تۆ لەو سەفەردا بیردەکەیتەوە یان تەنها خواردن دەخۆی، روانینەکانت دابەشدەکەیتەوە بەسەر خەون و خولیاو ئارەزووەکانتدا یان بەدرێژایی ئەو سەفەرە دەخەویت، وەك ئەو موسافیرەی کە خەیاڵی بچوکترە لەسەفەرێكو خاوەنی تاکەیەك خەون نیە.

دوبارەبونەوە کەرەستەگەلێکی جۆراوجۆرو هەمەڕەنگ بەکاردەبات بۆ خزمەتکردنی دنیا داخراوەکەی خۆی، کە مەوداکانی خۆی بەسەر تەواوی پانتاییەکاندا رایەڵ دەکاتو هەناسە بۆ هیچ جیاوازییەك ناهێڵێتەوە، لەو فەزایەدا مەوداکان سەرەتاو کۆتاییان هەیە، رەهەندەکان لەقۆناغی وێکچوو، لەسەرزەمینی وێکچوودا دوبارەدەبنەوە، تەنها ئاوێنەیەك هەیە بۆ روانین و پێچەوانەکردنەوەی تاکە مۆدێلێکی روانین، بوونەوەرەکانی ئەو مەودا بەرفراوانەی کە دوبارەبونەوە حوکمی تیادا دەکات، جیاوازیو هەمەڕەنگیەکان قبوڵناکەن، هیچ بوونێکی دیکەو روانین و کایەیەکی

دیکەو جوڵەو ئەکشنێکی دیکە جێی بایەخو سەرنجیان نیە، بێزارن لەزۆری ئاوێنەکان، لەبەرئەوەی روبەرەکانی ئەو مۆدێلە کەشف دەکات و دوورونزیك لەچەند لایەکەوە دەریاندەخات، دوبارەبونەوە تاکەیەك پەیام و تاکەیەك مەبەست ئاراستەی دەکات، کەرەستەکانی کەرەستەگەلێکی سەرەتایین بۆ جوڵاندنی ژیان و مامەڵەکردن بە رەگەزەکانەوە، کەس نیە رەگەزو کەرەستەکان و وێنەکانیان نەناسێتەوەو ئاشنایان نەبێت. دەرئەنجام دوبارەبونەوە کاردەکات بۆ بەرجەستەکردنی دنیایەکی داخراو و نەریتامێز، کە تیایدا سەرلەبەری هەبوەکان لەبەرجەستەکراوێکی نەریتیدا دەپارێزرێن و هەموو جیاوازیەك و هەموو روانینێك دەکەوێتە دەرەوەی مەوداکانی ژیانەوەو نزیکترە لەهەر مەودایەکی ئاسایی بێبایەخ. بەڵام لەپاڵ ئەو دنیایەدا، لەپاڵ و ئەو مەوداو روانین و ئاوێنە داخراوانەدا دنیایەکی دیکەو مەودایەکی دیکەی روانین مەزراکانی ئەو واقیعە داگیردەکات و خەیاڵدانێکی بەرفراوان بۆ بوون و دنیابینی دەخولقێنێ، کەرەستەکانی ئەم دنیا جیاوازە کەرەستەگەلێکی جیاوازن لەقەبارەو کارو ئەرك و فەنتازیاو رەمزو مانادا، کە ستراکتۆرێکی گەورەتریان لەپشتەوەیە، ئەو ستراکتۆرە کلێشەی پەیامێك یان ئامانجێك یان ستراتیژێك نیە، دنیایەکی دیکەیە، بەڵام پڕاوپڕە لەجیاوازی و نوێخوازە بەمانا فەرهەنگی و فەلسەفی و روحییەکان، بەڕاستی ئەوەی پێیوایە رۆحی مرۆڤایەتی بێبەشە لەگەشەکردن و دەرکەوتنی شێوازە نوێکانی فەلسەفەو دیاردەی نوێگەری و پۆست مۆدێرنیزم و تەواوی کایە فەلسەفی و هزرییە

هاوچەرخەکانی دنیا، زۆر بێئاگاو داخراوانە دەڕوانێتە سەرلەبەری تێڕوانینو خەیاڵو ئەنتۆلۆژیا، لەبەرئەوەی مرۆڤ سەنتەری کۆی گەشەسەندنەکانو کۆی گۆڕانکارییەکانو کۆی فەلسەفەکانی ژیانو هزری مرۆڤایەتییەو هێزێکە بۆ خولقاندنی ئاستێکی دیکەی شارستانیو ئاستێکی دیکەی ترادسیۆن. ئەوەی جیهانبینی مۆدێرن لەکۆنخوازیو نەریتپارێزی جیادەکاتەوە ئەو توانایو توانستە هزرییەیە کە کاردەکات بۆ بەرپاکردنی پانتاییەکی بەرفراوانی هزری رەخنەیو سڕینەوەی ئەو نەخشە سنوربۆکێشراوەی روانین کە مەودای حیکایەتەکانو ئاستی نەریتی کۆمەڵگە تێناپەڕێنن.

# رۆشنبیری کوشنده/

# حیکایەتی کوشندە

"گرنگ نیە تۆ نوسەریت یان نا، تێکستت هەیە یاخود نـا، خـاوەنی بەرهـەمێکی راسـتەقینەیت و کاریگـەرێکی لەسـەر لایـەنێك لەلایەنـە کولتورییەکانی ئێمە جێهێشتووە یاخود نا... ئـەوە گرنگـە حیـزب وەك کـادیرێکی رۆشـنبیریی دەتناسـێت و دەسـەلاتت دەداتـێ و میـدیاکانت دەخاتـە بەردەسـت و دەتکاتـە ئـەو کەسـەی کـە لەسـەر داهێنـان بڕیاربـدەیت."[24]، رۆشـنبیر بەرلـەوەی بونـەورێکی کۆمەلایـەتی و فەرهەنگی و سیاسی بێت، پێویستە بوونەرێك بێت خـاوەنی دنیـابینی و روانینـە جیاوازەکـان بێـت، جیـاوازتر لەهـەر کایـەو پێکهاتەیـەکی ترادسـیۆنی، بارگـاوی بـەدنیای گۆڕانکـاری و دیـاردە نوێکـان، ئـەوەی رۆشـنبیر لەپێکهاتـەو ستراکـچەرەکانی دیکـە جیادەکاتـەوە پـتر ئـەو روانـین و جیاوازیانەیـە کـە لـەدەرەوەی ئـەو ترادسـیۆنە داخراوانـە راڤـەکاری و دنیـابینی خـۆی هەیـە، سـەرباری ئـەم سـەرەتایە، رۆشـنبیر

---

24-(بەختیار عەلی، خوێنەری کوشندە، ل37 )

دروستكەری پرسیارو گومانە بۆ هەر دیاردەو گۆڕانێك‌و ستراكچەرێكی داخراو یان ئەو ناوەندو پانتاییە قفڵدراوانەی كە قسەكردن لەسەری وێكچووی شكاندنی موقەدەسات‌و دنیای شتە پیرۆزكانە یان قەدەغەكراوەكانە.

دروستكردنی دیالۆگ‌و بەرهەمهێنانی نێوەندی كراوەتر بۆ روانین‌و بەرپاكردنی گفتوگۆو ئیلتیزام بەرامبەر هەر شتێك كە لەناوەوەڕا تەواو پەیوەستە بە ژیان‌و فەرهەنگ‌و ئاستی ژیاریی نادیاریكراوی كۆمەڵگە، ئەو رۆشنبیرانەی خۆیان بەدوور دەگرن لەهەر رەخنەو گفتوگۆو هەڵوەشانەوەو راڤەكارییەك بۆ دەسەڵات‌و كۆمەڵگەو فەرهەنگ‌و دیاردەو گۆڕانكارییەك‌و ئەو ئاستە رۆشنبیرییە ئیفلیجەی ناوەندە رۆشنبیرییەكان، ئەوا ئەو رۆشنبیرە هیچی كەمتر نیە لەو كارمەندە تەمەڵانەی كە بەیانیان هەر لەخۆیانەوە دەچن بۆ دەوام‌و پاش نیوەڕوانیش هەر لەخۆیانەوە دەگەڕینەوە بۆماڵەوە. هاوكات ئەو رۆشنبیرە وەك سیاسییەكان دنیایەك كەموكوڕی مەعریفی‌و رۆشنبیری هەیە بۆ شاردنەوەی ئەو حاڵەتەو بەشدارە لەحیكایەتەكانداو بۆتە واعیزو خوتبەبێژیان‌و دنیای لێبووە بە مزگەوتێكی سیاسی گەورەو هەموو رۆژێك لەلای ئەو رۆژی هەینییەو رۆژێكی دوورودرێژەو نابڕێتەوە. بەلاَم خاوەنی دنیابینییەكی جیاوازو روانینێكی رەخنەگرانە نیە.

یەكێك لەو رۆشنبیرە رەخنەگرانەی كە بە دنیابینیەكی رەخنەگرانەوە كار لەسەر هەڵوەشاندنەوەو تاوتوێكردنی ئەو دنیا رۆشنبیرییەی ئێمە دەكات‌و دەیان پرسیارو گفتوگۆی جدی لەو بوارەدا

دروستکردووە مەریوان وریا قانیعە، بەداخەوە ئێمە وەك چۆن هیچ شتێك ناکەوێتە نێوەندی بایەخدانی ئێمەوەو لەبێباکییەکی زۆر حەزین‌و لەتەمەڵخانەیەکی زۆر گەورەی رۆشنبیری‌و ژیاریدا دەگوزەرێین‌و بەتاکەیەك حیکایەتی سیاسی‌و نەتەوەیی رازین‌و ئاستی دامەزراوەیی رۆشنبیری ئێمەش لە ئاستێکی هەژارو لەناکاریگەرییەکی بێشوماردا دەژین‌و هیچ گفتۆگۆو دیالۆگێکی جیدی رۆشنبیری‌و فەرهەنگی لەئارادا نیە ئەو خەیاڵ‌و خەونە بچوکانە هەڵداتە دەرەوەی کارکردنەوەو بەدنیابینییەکی جیاوازەوە گرنگی‌و بایەخی ئەو نوسین‌و کتێب‌و دنیابینیانە وەك خۆیان بکەونە نێو گفتوگۆو پێبەندی‌و بەرپرسیارێتییەوە. رۆشنبیرانی رەخنەگر بەتەواوی جیاوازی‌و دنیابینیانەوە لەلای دەسەڵات‌و دەزگا فەرهەنگییەکان‌و حکومەت‌و دامەزراوەکانی کە گرفتاری نەخوێنەواری‌و بێباکین‌و کەمتەرخەم‌و نابەرپرسیارن، نەبونەتە سەرمایەیەکی رۆشنبیری‌و نەتەوەیی کە جێی بایەخی حکومەت‌و ناوەندە رۆشنبیرییەکان بن‌و نوسین‌و روانینەکانیان بەهەند وەربگیرێت‌و کاریان لەسەر بکرێت، لەراستیدا ئەم خەمەی من لێرەوە سەرچاوە دەگرێت کە بلاوکردنەوەی نوسین‌و رەخنەی جیاواز ناکاتە شلەژانی ئەو ناوەندە داخراوە ساختانەی دەسەڵات‌و ئەو پانتاییە پڕ لە گەمژەیی‌و سیخناخ بە جەهلانەی دامەزراوە رۆشنبیری‌و فەرهەنگییەکان، هەڵبەت تەرویجکردن‌و بازاڕ پەیداکردن بۆ جەهل لەئاستێکی بەرزی سیاسی‌و رۆشنبیری‌و حکومی‌و رۆشنبیریدا هیچی کەمتر نیە لەو روانینە سەلەفی‌و هەمەجییەی نێو کۆمەڵگە هەرە دواکەوتوەکانی وەك ئەفغانستان‌و عێراق‌و ئەو کۆمەڵگە سەرەتاییانەی

که ڕهههندی بیرکردنهوه تیایدا سنورهکانی ئهو حیکایهتو ئهفسانهو سروته ئاینیو کۆمهڵایهتیانه تێناپهڕێنێتو دنیابینی ئهو جۆره کۆمهڵگایانه داخراوتره لهو ستراکچهره کۆمهڵایهتیو فهرههنگیو سیاسیانهی خۆیان که ناکهونه سهر نهخشهی ڕۆشنبیریو بایهخدان به مرۆڤو جیاوازییهکان.

له ڕاستیدا لهو کۆمهڵگایهنهدا که ڕۆشنبیره ڕهخنهگرو جدییهکانی جێی بایهخو بهرپرسیارێتی نین لهلایهن کۆمهڵگهو حکومهتو ناوهندهکانهوه بهسهربهخۆیی، کۆمهڵگهیهکی نهخۆشو خاوهن حکومهتێکی فاشلنو به جدی خاوهنی دامهزراوهی فهرههنگیو ناوهندی ڕۆشنبیری سهربهخۆو ئازاد نیینو لهئاستێکی ههژاری شارستانیدا داغڵی دنیای مۆدێرن بوونو سات لهدوای سات بهتاڵ دهبنهوه لهروانینو پڕدهبن لهجههل، خاڵیدهبنهوه لهدنیابینیو لێوانلێو دهبن لهخامۆشیو بێباکیو مهرگدۆستی، ئهو دهسهڵاتهی گوێ لهڕۆشنبیره ڕهخنهگرهکانی ناگرێتو به حورمهتهوه ناکهوێته گفتوگۆو وهڵامدانهوهیان دهسهڵاتێکه تاسهرئێسك بێئاگایهو تا ئهوپهڕی جههل دهسهڵاتێکی جاهیلو بهرههمهێنهری خامۆشییهکی گهورهوگرانه، هاوکات ئهو دامهزراوه ڕۆشنبیریانهشی که پاشکۆی ئهو دهسهڵاتو ناوهندی هێزانهن هیچیان کهمتر نیه لهو دهسهڵاته جاهیلهو لهروانینێکی داخراو و نابهرپرسیاردا دهژین، لهراستیدا تهنها هۆکارهکان لهدهسهڵاتهوه سهرچاوه ناگرێت، بهڵکه لهو جههلو بێباکییه گهورانهوه سهرچاوه دهگرێت که ئهو دهزگاو کهسایهتییه ڕۆشنبیریو حیکایهتخوانانه لهسهرهتاوه کاری بۆدهکهنو لهڕێی

میکانیزمی خەیاڵکوشتن‌و خەونکوشتن‌و دیالۆگ کوشتنەوە ئەو جەهلە سەرتاسەرییە وەبەرهەمدەهێنن‌و هەزاران خوێنەری کوشندەو بێئاگات بۆ دروستدەکەن.

مەریوان وریا لەگفتوگۆیەکدا دەڵی: "ئەو رۆژگارە بەسەرچوو کە رۆشنبیر هەڵگری گوتارێکی سیاسی سادە بێت‌و پێی وابێت کە گوتی کورد چەوساوەیە ئیدی نوقسانییە فیکرییەکانی داپۆشیوە. ئەمڕۆکە بۆئەوەی بتوانیت وەك رۆشنبیر کاری فیکری‌و مەنهەجی راستەقینە بکەیت، بۆئەوەی بە کایەی رۆشنبیری‌و بەڕۆڵی رۆشنبیران قورساییەکی رەمزی ببەخشیت، دەبێت سەرقاڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بیت بۆ کایەی رۆشنبیری تا بتوانیت بەپێی مەرجە ناوەکییەکانی کاری فیکری‌و زانستی‌و مەنهەجی بنوسیت. کاتی ئەوە هاتووە فیکرو خوتبەی ناو مزگەوت، فیکرو نوسینی ناو دەزگای راگەیاندنی حیزبی‌و رۆشنبیرو ئەکتیڤیستی سیاسی لێکجیابکەینەوە"[25]، جیاکردنەوەی رۆشنبییر لەو ژانرە سیاسی‌و ئاینی‌و فەرهەنگییانەو سەیرکردنی لە گۆشەنیگایەکی دیکەو باسکردنی لەدەروازەیەکی کراوەترو دەرهێنانی لەحیکایەت‌و ئەو ناوەندە داخراوانەو روتکردنەوەی بۆ بونەوەرێکی سەربەخۆی جیاواز لەهەر دنیایەکی کورتمەوداو دانانی لەمەودایەکی نەفەس درێژترو لەبوارێکی مەنهەجی‌و هزری جیاوازدا کارێکی هێندە قورسە بە ئەندازەیەك کە تۆی خوێنەرو چاودێر بەسەر ئەم ناوەندە ئاڵۆزەی رۆشنبیرییەوە کەمتر دەتوانیت رۆشنبیر لەسیاسەتمەندارو خوتبەبێژو پیاوماقوڵ‌و حیکایەتخوان

---

[25] (مەریوان وریا، بەختەوەری‌و بێدەگی، ساڵی 2003، ل84)

جیابکەیتەوە، وەك چۆن ئەستەمە دەزگایەکی رۆشنبیری لەدیوەخانی سەرۆك خێڵ جیابکەیتەوە، وەك چۆن ناتوانین جیاوازییەکی ئەوتۆ بدۆزینەوە لەنێوان مزگەوتو بارەگایەکی حیزبو دەزگایەکی رۆشنبیریدا.

## دیوەخانی رۆشنبیری

هاوکات ئەو بازنە داخراوەی سیاسەتو رۆشنبیریو دیوەخان ئاوێزان بەهەر ترادسیۆنێکی داخراو لەحیکایەتو خۆدوبارکردنەوەو نائەکتیڤیو بێباکیو تەمەڵخانە کە هەوڵێکی گەمژانەیە بۆ بچوکردنەوەی دنیا لەیەك روانینی سواوداو غەرقکردنی هەر دنیابینییەکی جیاواز لەپانتاییەکی بەرفراوانی جەهلو سونەتگەراییداو پارچەپارچەکردنی هەر فەنتازیایەك لە حیکایەتێکی کۆنو دوبارەو هەزیلدا.

بەختیار عەلی زۆر نیگەرانتر دەڕوانێتە ئەو نێوەندە رۆشنبیرییە بچوکەی کە دنیای لەحیکایەتو خەیاڵە بچوکەکانی خۆیدا بچوکردۆتەوەو دەڵێ: " کێشەکە لەدامەزراندنی دەزگاو گرتنی فیستیڤاڵو خەلاتکردندا نیە، هەموو رۆشنبیرەکانی دونیا سالآنە پێویستیان بە گرتنی چەندین فیستیڤاڵو بەخشینی چەندین خەلاتی ئەدەبی هەیە، ئەمەیان قسە هەڵناگرێت، بەڵکو ئەوەی دەبێتە گرفت ئەوەیە کە ئەو دەزگایانەی حیزب دروستیاندەکات، ئەو ژێرخانە مەعریفییەیان نیە بتوانن ئەو پڕۆسانە ببەن بەرێوە. مەبەستی سەرەکی پشت ئەم دەزگایانە ئەوەیە کە پڕۆسەی هەڵسەنگاندنی تێکست، دروستکردنی نوسەر، دروستکردنی ناووناوبانگ بۆ ئامێرەکانی

حیزب مۆنۆپۆلبکەن."[26] ئەم وتارەی بەردەستان هێندەی دروستکردنی گفتوگۆو تاوتوێکردنی روانینو دنیابینییەکانی بەختیار عەلیە لەرێی کتێبی (خوێنەری کوشندە)وە هێندە خوێندنەوەیەکی سەرپێیو بەپەلە نیە بۆ کتێبێك کە کەوتۆتە بەردیدەی خوێنەران، نەخێر، ئەکرێ لێرەوە ئێمە باس لەو کورتکردنەوەیە بکەین کە کاری دەزگاکانو ناوەندە رۆشنبیرییەکانی ئەم دەڤەرەیە لەجوگرافیای مۆنۆپۆلکردنو وێرانکردنی هەر روانینێکی جیاواز لەرێی جەهلو ساختەکارییەوە.

لەم کۆمەلگەیەدا سەرلەبەری دەزگاو ناوەندە رۆشنبیرییەکان بەسەر دەسەلاتو حیزبەکاندا دابەشبوون، هاوکات شتێك نیە بەناوی میدیای ئازادەوە، لەکاتێکدا تەواوی میدیاکان لە تەلەفزیونی ئاسمانییەوە بگرە تا لۆکالییەکانو رادیۆو رۆژنامەو هەفتەنامەو وەرزنامەو سالنامە بەسەر دیوەخانەکانی حیزبدا دابەشبوونو بوونەتە دیوەخانۆچکەی ئەو دیوەخانسازە گەورانەی کە خۆیان بەرهەمدەهێننەوەو کۆپیکراوی یەکترینو لەهەزارییەکی بێ ئەندازەدا رووبەرێکی بەرفراوانی دواکەوتویی داگیردەکەنو بێباکانە لەپەراوێزی دنیاو گۆڕانکاریو فەرهەنگی مۆدێرنو هزری مۆدێرندا دەژین.

سالانە لەولاتە دواکەوتو و نابەرپرسیارو نادیموکراتەکانی دنیادا دەیان فیستیڤالو کەرنەڤالو بۆنەو موناسەبە سازدەدرێت، لەکاتێکدا کێشەکە لەسازدانو پێشکەشکردنیدا نیە، بەلکە کێشەکە لەجەوهەری ئەو چالاکیو بلاوکردنەوانەدایە، کە لەپشت ئەو کەرنەڤالانەوە دەیان

---

[26]-(خوێنەری کوشندە، ل36)

کەسی نەخوێنەوار، دەیان پسپۆری بێئاگاو نادنیابین‌و سەلەفی ئامادەگییەکی بەردەوامیان هەیە، هاوکات لەناوەڕۆکی ئەو فیستیڤالانەدا میکانیزمێك هەیە بۆ بەرهەمهێنانی جەهل‌و بێئاگایی زیاترو بێبایەخکردنی تێکستی جدی‌و ڕەخنەگرانەو سوککردنی نوسین‌و خوێندنەوەو بواری ڕۆشنبیری‌و بێبایەخکردنی هەر ژانرێکی ئەدەبی‌و فیکری لەڕێی نەخوێنەوارییەکی گەورەوگران‌و حیزبایەتییەکی کوێرانەو سەلەفییەتێکی مۆدێرنەوە، هاوکات دەیان هەوڵی مۆنۆپۆلیزەکراو هەیە بۆ بەرهەمهێنانی خوێنەری کوشندەو ڕۆشنبیری کوشندە لەڕێی هەزاران حیکایەتی بچوکی کوشندەوە.

دابەشکردنی دیوەخانەکان بەسەر چەندین دیوەخانی بچوکی هاوشێوەدا دەکاتەوە هەمان ئەو دیوەخانە گەورانەی کە زادەی ئەو هەژارییە فەرهەنگییەن‌و ڕوانینیان ناگاتە دەرەوەی سنوری ئەو ئایدیا بەبەردبووانەی کە تروسکایی گۆڕان تیایدا خامۆشترە لەهەر خەیاڵێکی کەرنەڤالی هەژار، بۆنمونە دەرکردنی ئەو هەموو ڕۆژنامەو هەفتەنامەو گۆڤارو بلاوکراوانە، سەرباری ئەوەی (٩٩٪)لە سەدا نەوەدونۆی بێجگە لەکۆمەڵە دیوەخانێکی بچوکی ئایدۆلۆژی‌و حیزبی‌و بەرەکەتی ئەوان هیچی دیکە نین‌و هەر بەرهەمی خەیاڵ‌و خولیای حیزبەکانن‌و زادەی فەرهەنگێکی کراوە نیین‌و لەبازنەیەکی داخراوی کانزایی ڕزیودا دەخولێنەوە، هاوکات بەرهەمهێنەری سەرلێشێواوییەکی گەورەن بۆ خوێنەران‌و دروستکارێکی ڕاستەوخۆی ئەو خوێنەرە کوشندەیەن کە بەختیار عەلی باسی لێوەدەکات. دابەشکردنی ڕۆشنبیری لەلایەن حیزب‌و دیوەخانەکانەوە بۆ دەیان ژووری بچوکتری ئەو

دیوەخانانە بێجگە لە بەرهەمهێنانی جەهلێکی کوشندەو بەرپاکردنی فەزایەکی گەورەی بێباکی هیچی تر نین، ئەو هەوڵە جدیانەشی کە لەو نێوەندانەدا جیاوازییەکانی خۆیان دەپارێزن، لەفەزایەکی وا داخراودا راستەوخۆ گرفتاری ئەو دیوەخانانەن‌و بەردەوام بەدەست ئەو قەیرانی داخران‌و بێباکییە گەورانەوە دەناڵێنن. هەڵبەت ناوەندەکانی دەسەڵات ئەم فەزا بێسەروبەرو بێباکییە بە میدیای ئازاد ناودەبەن‌و وەك هەڵپەیەکی دیموکراسی بە هاوڵاتیانی دەفرۆشنەوە، دیموکراسی تەنها ئازادی رادەربڕین نیە، بەڵکە گوێگرتنیشە لەراوبۆچونە جیاوازەکان، وەڵامدانەوەو بەدواداچونە، ئیعترافکردنە بە سەربەخۆیی دەزگاکان‌و ناوەندە رۆشنبیرییەکان‌و گرنگیدانە بە فەرهەنگی کرانەوەو دیالۆگ‌و بایەخدان بە مرۆڤو رەخنەو شەفافیەت‌و بەرپرسیارێتی.

## کۆمەڵگەیەکی شاراوە

لەراستیدا کۆمەڵگایەك هەیە لەدەرەوەی ستەمکارییەکانی دەسەڵات، دنیایەکی دیکە هەیە، خەیاڵێکی دیکە هەیە، نەوەیەکی دیکە هەیە کە باوەڕی بە ئایدۆلۆژیا داخراوەکان‌و سەرزەمینە وەهمییەکانی ترادسیۆن‌و فەرهەنگی بچوککردنەوەی ژیان نەماوە، لەگەڵ حیکایەتە گەورەکاندا ناژی، ئەو داخرانە فەرهەنگی‌و کۆمەڵایەتی‌و شارستانیانەی کە بە پانتاییە وەهمییەکانی ئەو کولتورە هەژارانەدا تێدەپەڕێت کە خاوەنی کۆمەڵگایەکی بێ خەون‌و بێ ئیرادەو بێ پرسیارن، کە خاوەنی فەرهەنگێکن قبولکردنی ئەوی دی‌و جیاوازییەکان بەقەدەر تاکەیەك فەنتازیای ئەو دنیابینییە نیە کە لەکۆنخوازی‌و نەریتخوازییەوە

سەرچاوە دەگرێت. هاوکات ئەم نەوەیە، واتە نەوەی دەرەوەی وەهمەکان‌و بەڵێن‌و مژدە ساختەکان‌و نەوەی پاش کەرنەڤاڵە نەبڕاوەکانی کۆنخوازی‌و نەریتپارێزی، پتر خەمی گۆڕان‌و کرانەوە بەڕووی دنیادا داگیریکردووە، بەلاّم سەرجەم ئەو خەمانە دەروازەگەلێکی سەرەتایین بۆ دەرچوون لەداخران‌و کردنەوەی دەرگا داخراوەکانی ئەو تەوقە کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی‌و ئایدۆلۆژی‌و کولتوری‌و ئاینییانەی کێشراوە بەدەوری نەوەکان‌و کرانەوەکاندا. پتر خولیایەکە خوازیاری خۆبەتاڵکردنەوەیە لەهەر ترادسیۆنێکی بچوك‌و لەهەر حیکایەتێکی گشتگیر، ئەم خولیایە چەند پڕە لە پاشەڕۆکانی ئەو کەلاوە فەرهەنگی‌و نەریتییەی کۆمەلگەو ئارەزووە خەفەکراوەکانی وێرانەیەکی سایکۆلۆژی‌و ژیاری، هێندەش خاڵیە لەهەر حیکایەتێك کە دەچێتەوە سەر نۆستالژیایەکی کوشندە بۆ رابردوو، خەمێکی نەبڕاوە بۆ مێژوویەکی بێ سەرچاوەو ئامادەکردنەوەی رەمزو پیرۆزی‌و کەرەستەو ماناکانی رابردوو لەئێستاداو شەڕکردن لەگەڵ زەمەن‌و گۆڕانکاری‌و دیاردە نوێکانی دنیای مۆدێرندا بە چەك‌و کەرەستەگەلێکی کۆن‌و بەتاڵ لەهەر مەعریفەیەکی شیکاری‌و راڤەکاری بۆ ئێستاو سەرلەبەری ئەو دیاردە نوێیانە، واتە نەوەیەك هەیە چیتر ترادسیۆن ناتوانێت سەرلەبەری خەونەکانی لەتاکەیەك حیکایەتدا کۆبکاتەوە، سەرلەبەری خولیاکانی لەدەیان دیوەخانی کۆپیکراودا رامبکات، چیتر حیکایەتە گەورەکانی کۆمەلگەو نەتەوە ناتوانن لەرووبەرێکی بەرفراوانی مژدەبەخشیدا بەخێویبکەن. هاوکات ئەم نەوەیە لەبەردەم دوو ئاستی لێکدژو ناهەوسەنگی رۆشنبیریدا دەژی، لەنێو خەیاڵی

بچوکی ناوچەگەریتیو رووبەرە نادیاریکراوەکانی دنیابینیدا، لەبەردەم قەدەری فەرهەنگیو رۆشنبیریی نەوەکانی پێشوو بەرابەر رەخنەی نەوەیەك لەدەرەوەی ئەو ناوەندە داخراو و ئەو دەزگا هەزارنەی کە کاریان بەرهەمهێنانی فەرهەنگێکی بەکاربەرەو هیچی تر.

بەختیار عەلی پێمان دەڵێت: "ئەو ملیۆنەها دۆلارەی لەبواری رۆشنبیریدا خەرجکراوەو رژاوەتە ئەم کەناڵانەوە هێندەی رژاوەتە گیرفانی نوخبەیەکی رۆشنبیری مشەخۆرەوە، کە لەئاستی داهێنانو مەعریفەدا بچوکترین جێدەستیان دیار نییە، نەرژاوەتەوە خزمەتی پرۆژەیەکی داڕێژراوەوە کە عەقڵو خەیاڵێکی داهێنەرانەی لەپشت بێتو بە دەوڵەمەندبوونی رۆشنبیری ئێمە تەواو بێت. دیارە هەندێك لەم دەزگایانە هێندەی دەزگای بلاوکردنەوەی جەهلن، رۆڵی پۆلیسی رۆشنبیری دەبینن، دەزگای شەرعیەت بەخشینن بە نەخوێندەواری هیچی تر نیین، نە پرۆژەیەکی رۆشنبیری جدیان پێیەو نە لەداهاتوشدا هیچ شتێك لەم دەزگایانەوە دێتە دەرێ ستێك لەژیانی رۆشنبیری ئێمە بگۆرێت. هێزی هەڵسەنگاندنو خوێندنەوە لەم دەزگایانە چەندین جار لەخوار زەوقو گەشەی فیکری برێکی زۆری خوێنەرانەوەن."[27]، هەڵبەت ئەوەی بەختیار عەلی هەڵیدەوەشێنێتەوە ئەو ستراکچەرە داخراوەیە کە کاریان مۆنۆپۆلکردنی ئەو ناوەندە رۆشنبیرانەیەو داخستنی بەردەوامی رووبەرەکانی روانینو دنیابینی فەرهەنگێکە کە ئەگەرەکانی داخستنی سەدئەوەندەی ئومێدەکانی کرانەوەیەتی، ئەو بونیادە هەڵدەوەشێنێتەوە کە پتر بونیادێکی کۆنکرێتی فەرهەنگییەو

---

[27] خوێنەری کوشندە ل36

روانـــین تیایـــدا مەودایـــەکی کـــورتو بـــچوکی هەیـــە، ئـــەو بونیـــادە دابەشکراوێکی هەرەمی حیزبە، خەیالگەیەکی کۆمیتەییە، هەرەمێکی گـەورەی جەهلـە لەسـەرەوە تـا خـوارەوە، جـەهل تـەنها رووبـەرێکی دیاریکراوی نەفامیو نەخوێنەواریو بێئاگایی نیە، بەڵکە پتر هێزێکە بۆ داگیرکردنـی رووبـەرەکانی روانـین، چەکێکە بـۆ پاراستنی نـەریتو مۆراڵی بچوكو حیکایەتی بچوكو فەرهـەنگی لۆکاڵی، هاوکات لەپشت ئەو جەهلە گەورەیەوە دنیایـەك حیکایـەتی بـچوك ئامادەیـە، دنیایـەك خولیای دەرەبەگی ئامادەیە، دنیایەك میرزای رۆشنبیریی بەناوی شیعرو رۆشنبیریو هزرو فەلسەفەو ئەدەبـەوە قسەدەکەنو بوونەتـە واعیـزو مەلای رۆشنبیریو دەروێشی حیـزبو سۆفی تەریقـەتی سونەتگەرایی رۆشنبیریی.

جـەهل بـەبێ حیکایـەتی گـەورەو یاداشـتنامەی نـەوەکانی پێـشوو نابێتە جەهل، دەسەڵاتی جەهل دەسەڵاتێکە جـەهلێکی گـەورەی هەیـە بەرامبەر ژیانی مۆدێرنو دنیابینی جیاوازو خەیاڵو خولیای کرانـەوە، دەسـەڵاتێکە دەیـەوێت رازیمانبکات بـە حیکایەتـەکانیو لەسـەرزەمینە بەتاڵـەکانی خۆیـدا پڕمانبکاتـەوە لەموقەدەسـاتو رەمـزی سـاختەو بـەهای بـەتاڵو ئـەخلاقیاتی بێبـاکیو ئـەو دەیـەوێت لەزەمهـەریرە بەباچووەکانی خۆیدا غەرقی جەهلێکمان بکات تا روانینو خەونەکانی دەرەوەی خۆی زیاترو زیاتر کاڵببنەوە، لەکۆتایدا ئـەو جەهلە لێوانلێو دەبێت لەعیشوەی بچوکردنەوەی خەیاڵو خەونو خولیاکانی مـرۆڤ لـە بازنەیـەکی داخـراوی شارسـتانیدا دابـڕاو لەهـەر پارچـەیەکی دیکـەی فەرهەنگی بێبەش لەهەر دنیابینییەکی جیاواز.

بەختیار عەلی لەسەر ئەو دەزگا رۆشنبیریو حیزبیانە لەرێی سەرنجێکی رەخنەگرانەوە کار لەسەر دابەشکردنی ئەو جەهلە دەکات کەبەسەر رووبەرە بەرفراوانەکانی فەرهەنگی کۆمەڵگەو ئەو ئاستە ژیارییەدا دابەشدەبنو مۆنۆپۆلی زۆرێك لەو ناوەندو دەزگایانە دەکەنو دەبنە هێزێکی بەکاربەر بۆ بەکاربردنی جەهل بەدنیایاك شێوازو بەدنیایەك خەیاڵی بچوکەوە. "ئەو دەزگایانە خۆیان جۆرێکن لەخوێنەری کوشندە، بەلاّم لەدەرەوەش جۆرە خوێنەرێکی دیکە پەروەردە دەکەن کە ئەوانیش وەك خۆیان لەخزمەتی مەرگی فەرهەنگو داهێناندان. ئەوەی ئەم دەزگایەو خاوەنەکانیان ناتوانن بیشێوێنن، ئەوەی خۆیان لەژیانی رۆشنبیریو فیکری ئێمەدا ناتوانن بیکوژن، بەجۆرە خوێنەرێکی جاهیل دەیکوژن کە پێشتر لەکارخانەکانی راگەیاندنی حیزبیو رۆشنبیری تەقلیدیدا گەورەبووە، ئاستی چەشەو رۆشنبیری ئەم خوێنەرە بە ئەندازەی ئاستی چەشەو رۆشنبیری ئەو تاقمە بلیمەتەیە کە ئەمرۆ ژیانی رۆشنبیری ئێمە دەبەن بەرێوە."[28] خوێنەری جدی کە هێزێکە بۆ بەرهەمهێنانی روانێکی دیکە لەدەرەوەی ئەو ستراکتۆرە داخراوەی روانینی کۆنکرێتی بۆ دنیا، هێزێکی فەرهەنگی جیاوازو پشکنەرە، بەدوای جیاکردنەوەی دەقی زیندووە لەدەقی مردوو، هەڵوەدای خوێندنەوەی نەنوسراوەکانی نێو دێرەکانە، خوێنەرێکە لەپشت روانینەکانی نوسەرەوە، لەپشت خەیاڵدانەکانی نوسینەوە بەدوای دنیابینییەکی دیکەو شاراوەیەکی دیکەو پەنهانێکی دیکەدا دەگەرێت، خوێنەری جدی لەرێی سەرزەمینە

---

[28] (خوێنەری کوشندەل39)

وههمییهکانی ئهو دەزگا رۆشنبیریانەوە رامناکرێت، خوێنەرێکە هێندەی غەرقی دەریاکانی راڤەکردنو هەڵوەشانەوە دەبێت، هێندە لەسەر رووی ئەو دەریایە بە کۆمەڵێك روانینی بچوکەوە سواری ئەو یەختە نابێت تا کەنارەکانی ئەو جەهلەی کە لەسەرەتاوە هەڵگری کەرنەڤاڵێکی وهمییەو تاکۆتایی هەر جەهلە، بەڵام خوێنەری کوشندە پەروەردەی ئەو جەهلە گەورەیەیە کە دنیا لە روانینەکانی ئەودا دورگەیەکی بچوكو داخراوە، سەرزەمینێکی بەڵێنپێدراوی جەهلە، خەیالگەیەکی بچوکە بۆ سەرسامییە بچوکەکان، بەڵام ئەوەمان لەیاد نەچێت خوێنەری کوشندە ئەو دەزگاو ناوەندە رۆشنبیرییانە بەرهەمیدەهێنن کە غەرقی جەهلو دنیابینییەکی بچوکبوونو کار لەسەر رامکردنی رۆشنبیریی دەکەن لەژوورە تاریکەکانی خەیاڵدانو روانینە کورت مەوداکانیاندا. خوێنەری کوشندە ئەو سیاسەتمەندارو ئەو سەرکردانەش دەگرێتەوە کە هیچ بەهایەکی جوانی کتێبو تێکست لەلای ئەوان نیە، "بەشی هەرە زۆری سیاسییە باڵاکانی ئێمە کەسانێکن لەباشترین حاڵەتدا سەرچاوەکانی رۆشنبیریان لەخوێندنەوەی رۆژنامەو تەماشاکردنی هەندێك سایتی ئینتەرنێت تێناپەڕێت، تێکستو داهێنان شتێك نیین نرخێکیان لەلای ئەمانە هەبێت. هەندێك لەوانە بە ساڵ کتێبێك ناخوێننەوە"[29]، لەڕاستیدا ئەم نوسینەی من هێندەی دروستکردنی گفتوگۆو رەخنەیە هێندە رامکردنی کتێبێك نیە، لەبەرئەوەی لەراستیدا رامکردنو خوێندنەوە بۆ ئەم کتێبەی بەختیار عەلی دەیان وتارو گفتگۆ هەڵدەگرێت، هەڵبەت منیش نامەوێت زۆر

---

[29] خوێنەری کوشندە/ل37"

بەسادەیی بەسەر ئەو کتێبەدا تێپەڕم، زۆر بەساکاریی بیخوێنمەوە وەك ئەو رۆشنبیرە بێئیشانەی ناو زۆرێك لەو دەزگا رۆشـنبیریانەی هێنـدەی بەرهەمهێنـەری نەخوێنەوارییـەکی کوشـندەن هێنـدە بەرهەمهێنـەری گفتۆگـۆ نـین، هێنـدەی کـار لەسـەر سـوککردن و فەرامۆشـکردنی دەق و کتێبـە جوانـەکان دەکـەن، هێنـدە کـار لەسـەر فراوانکردنـی روانـین و رەخنەو دنیابینییەکان ناکەن.

## جەهل و دنیابینی

دنیابینییـەکانی جـەهل کۆمـەڵێك دنیـابینی سـنوردارن و مـەودای حیکایەت و موقەدەس و رەمزە بەناڵەکان تێناپەڕێنن، ئەو کە تامەزرۆی بەتاڵکردنـەوەی ژیانـە لەهـەر مانـاو بەهایـەکی مـۆدێرن و مرۆڤگەرانـە، هاوکـات بێئەنـدازە تامـەزرۆی پەخـشکردنی جـەهل و نـەریتی بیرکردنەوەیەکە لێوانلێو لەبێئاگایی و ئەمساردی بەرامبەر هەر گۆڕان و روانینێك لەدەرەوەی خۆی، ئەو دەسـەڵاتە تاکەیـەك سـتراتیژی هەیـە کـە جەهلـە، دەسـەڵاتێکە سادیـستە، بـۆ بـچوکردنەوەی ژیـان لەخولیایـەکی چێژبەخشی بێ مانادا، بۆ بچوکردنەوەی خەون لەسەرزەمینە بەتاڵەکەی خۆیدا، تامەزرۆی دابەشـکردنی رەمـزو بـەها رزیوەکانـە بەسـەر تـەواوی مرۆڤەکاندا. خولیاکانی ئەو بۆ هەر ئاستێکی رۆشـنبیری لەبـچوکردنەوەو سـوکردن زیـاتر هیـچی تـر نیـەو سـەرزەمینێکە لەتاکەیـەك دەروازەی روانینەوە دەستپێدەکات و بەهەمان دەروازەش کۆتایی دێت.

ئێمـە لـەزۆر شـوێندا باسمـان لـەمۆنۆپۆلیزەکردن و داگیرکردنـی پانتاییە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتییـەکان کـردوە لەلایـەن دەسـەڵاتە

داخراوەکانەوە، لێرەدا تەنها بەخێرایی ئاماژە بەوە دەدەین، دەرەنجام بەرهەمی ئەو جەهلەی کە دەسەلاَتە داخراوەکان تیایدا دەژینو سەرلەبەری ژیانو پرۆژەو خەونەکان داگیردەکەنو دنیایەك وەزارەتی بەتالّو پەرلەمانتاری تەمەلّو بێدەنگو بەڕێوبەری سەلەفی دروستدەکات، ئەو دەسەلاَتە دەبێتە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ بەرهەمهێنانی ناعەدالەتیو غەرفکردنی جیاوازییەکان لەیەکەیەکی دۆگمایی هاوشێوەو ئاڕاستەکراودا. ئەو دەسەلاَتە تەنها لەحیکایەتەکاندا دەژیو بەردەوام لەدووبارەکردنەوەی خۆیو موقەدەساتەکانیدا خالّیدەبێتەوە، دەسەلاَتێکە سیخناخە لەجەهلاو لێوانلێوە لەساختەکاریی فەرهەنگیو ناعەدالەتی، بەلاَم بەتالّە لەدنیابینییەکی کراوەو قبولّکردنی ئەویدیو خەونی گۆڕانو خولیاو روانینی مۆدێرنو سازکردنی کلّێشەسازییەکی شارستانی بۆ دروستکردنی گفتوگۆو پانتاییەکی گەورەی بەرپرسیارێتی.

ستراکتۆری کایەو پێکهاتەکان بەسەر تەواوی پانتاییو دروستکراوە سیاسیو کۆمەلاَیەتیو ئابوریو ژیاریو کولتوریو ئاینییەکاندا دابەشدەبن، پانتاییە ژیارییەکانی ئەو سەرزەمینە چالاکانە داگیردەکەن، ستراتیژی کارکردنی ئەو بوونەوەرە ئایدۆلۆژییانە ستراتیژێکی کورتبینو وەهمێکی دوورمەودایە، خەونێکە لەئێستادا ناژی، ئەمەش بەو مانایە نیە کە بۆ داهاتوو دەژی، بەلّکە ڕوویەکی ئەو مەترسییە مێژوو و سەروەرییەکانە، رووەکەی دیکەی یۆتۆپیایەکی نەبڕاوەیە. ئایدۆلۆژیایەك نیە لەدنیادا بەبێ یۆتۆپیا بژی (بەپێی تێڕاوانینەکانی هۆرکهایمەر)، خەونێك نیە یۆتۆپیایەکی گەورەی

لەپــشتەوە نــەبێت، فەنتازیایــەك نادۆزیتــەوە یۆتۆپیــا كارخانەیــەكی بەرفراوانی فەنتازی بۆ دروست نەكردبێت.

لێرەدا ئـەو سـتراكتۆرە دەكـەین بەچـەند پێكهاتـەو هۆبەیەكـەوە، پێكهاتەی فـەنتازیای نـەوەكانی پێـشوو؛ ئـەم پێكهاتەیـە پێكهاتووە لـە: كولتوری نەوەكانی پێشوو، خەیاڵدانی فەرهەنگی مێگەلو دەستەو كایە ژیارییـەكانی پێـشخۆی، هۆبـەی مێـژوو، هۆبـەی دابوونـەریت، هۆبـەی گەلاڵەكردنی روانین. هەریەكێك لەم هۆبـەو كایانـە دەبنـە پێكهێنـەری بەشـێك لـەو سـتراكتۆرەی كـە كـۆنترۆڵی كایـەو پێكهاتـەكانی كـردووە، هەرچەندە گەڕانەوەی ئێمە بـۆ ئـەو نێوەندانـە گەڕانەوەیـەكی جیـاواز دەبێـت، بـەو مانایـەی بەهـەمان كەرەسـتەكانی پێـشوو، بەهـەمان ئـەو ئـامرازی راڤەكردنانــەی لەســەرەتادا بــەكارمان بــردوون نایــەین ئــەو راڤەكردنو شیكاریانە بۆ ئەو پێكهاتانە گەلاڵەبكەین.

لەراستیدا تاكەیـەك حیكایـەتی گـەورە ناتوانێت كۆمەڵگایـەك لـە كۆمــەڵگاكان، شارســتانییەك لەشارســتانییەكان بــۆ هەمیــشە گرفتــاری فەنتازییــەكی گــەورە بكــات، لەبەرئــەوە كۆمــەڵێك حیكایــەتی گــەورەو بـچوك لەپــشت ئــەو ترادســیۆنەی ژیانــەوە ئــەو خــەیاڵو فەنتازیایانــە گەلاڵەدەكــەن. لەكاتێكــدا ســـەرومرییەكانی نەتـــەوە تێكـــەڵ بـــە سەرومرییەكانی ئایدۆلۆژیاو كایە سیاسییەكان دەبێت، هاوكات حیكایەتی نەوەكانی پێشوو تێكەڵ بە حیكایەتەكانی كولتورو فەرهەنگو كۆمەڵگاو كایە سیاسییەكانی دەبێت، لەكاتێكدا كۆمەڵگای داخراو لەڕێی سـتراكتۆری حیــزبو دەســەڵاتە لۆكاڵییەكانــەوە بــەردەوام لەبەرهــەمهێنانی ئــەو نوستالژیا پڕ لەحیكایەتانەدان كە لەبۆشاییەكی بێئەنـدازەدا كار لەسـەر

ئامادەكردنەوەی رابردوو دەكرێتەوەو رەمزو دنیای حیكایەتە بچوكەكان بە ئێستا دەفرۆشرێتەوە، بوونەوەرە بچوكەكانی ئایدۆلۆژیا لۆكاڵییەكانیش لەهەوڵی پەخشكردنی ئەو حیكایەتانەدان، لەڕاستیدا كەناڵەكانی پەخشكردنی ئەو حیكایەتانە لەتاكەیەك كەناڵدا بەندناكرێت، بەڵكە لەڕێی كەناڵگەلێكی هەنوكەییەوە ئەو كارانە ئەنجامدەدرێت، بۆنمونە دەسەڵاتە بچوك‌و لۆكاڵییەكان لەكۆمەڵگا داخراوەكاندا سەرزەمینی هاوشێوە دەخولقێنن بۆ دوبارەكردنەوەو كۆپیكردنی خۆیان، بێگومان كۆمەڵگا دەبێتە ئەو سەرزەمینە وەهمییە بۆ ئایدۆلۆژیاو تاك ئاڕاستەیی بیركردنەوەو روانین بۆ دنیا، هاوكات كایەو پێكهاتەكانی وەك دەزگاو ناوەندو ئاستە ژیاری‌و كولتوری‌و كۆمەلآیەتییەكانی كۆمەڵگاش بە زانكۆو پەیمانگاو سەندیكاو دەزگا مەدەنیەكانیشیەوە دەبن بە كەناڵە بچوكەكانی بەخێوكردنی كاریزماكانی دەسەڵات‌و حیكایەتەكانی‌و دەبنەوە بە بەرهەمهێنەری ئەو سەرزەمینەی كە بەتاڵە لەگوڕان‌و دنیابینی نوێ بەلآم پڕە لەوەهم‌و خۆشباوەڕی‌و بەرهەمهێنانی جەهل.

لە فەنتازیایەكی دیكەشدا، كایەكی دیكە بەناوی فەنتازیای تەقلیدییەوە پێكهاتەیەكی نەریتی چەند نهۆمی‌و چەند كەناڵی بەرهەمدەهێنێت: كۆمەڵگاو كولتورو ئاین‌و خێزان‌و مزگەوت‌و دامودەزگاكان‌و سیستمی پەروەردەو سەندیكا پیشەیی‌و فێركارییەكان‌و رادیۆو تەلەفزیۆن‌و كەناڵەكانی دەسەلآت بەگشتی دەبنە هۆكارگەلێكی شیاو بۆ بەرهەمهێنان‌و بەكارخستنی حیكایەتەكان. لەنێوان ئەم دوو فەنتازیایەدا، لەنێوان بێسەروبەری ئەو حیكایەتانەدا، لەنێوان كولتورە

سەرسەختەکانی داخران و حیکایەتەکانیدا، لەنێوان خەیاڵی نەوەکانی پێشوو و فەنتازیای بونەوەرە بچوکەکانیدا، نەوەیەك دەژی، دابڕاو نیە لەئاستە ژیاری و کولتوری و فەرهەنگییەکانی کۆمەڵگاو، لە پەراوێزی ئەو حیکایەتانەشدا نیە، بەڵکە کەوتۆتە نێوەندی بەکاربەری ئەو حیکایەتانەوە، ئەو نەوەیە بونەوەرێکی بچوك و هەزیلی نێو ئەو حیکایەتانە نیە، بەڵکە کارئەکتەر و حیکایەتخوانی ئەو مەودا فەنتازییەن کە لەسەرچاوگەلێکی بەرفراوانەوە کار لەسەر بەستنەوەی رابردوو دەکەن بە ئێستاوەو خەمی ئەوان دابەشکردنەوەی زەمەنە بەسەر حیکایەتەکانداو بەخشینەوەی شوناسێکی مێژوویی بە ئێستاو کرینەوەی ئایندەو درێژکردنەوەی یۆتۆبیای ئایدۆلۆژی و وەهم و بەرهەمهێنانی خۆشباوەڕی.

نەوەیەك هەیە لەنێوان داخرانی کۆمەڵگاو دەروازە رەنگاڵەییەکانی کرانەوەدا، سەرسامە لەنێوان هەژاری شارستانی و فەرهەنگی بەرابەر دنیای مۆدێرنی پەیوەندی و گۆڕانکاری و دیاردەی نوێ، بێئومێدە لەحیکایەتی نەوەکانی پێشوو، بێهیوایە لەو هەموو وەهمەی کە روانین و دنیابینییەکانی پڕ دەکەن لەفەنتازیای بەتاڵ و موقەدەسات و تابۆی ساختەو وێناکردنەوەی رابردوو، بەلام بێئەندازە سەرسامە بەرامبەر وێنەو وێناکراوەکانی ئەوڕۆی مۆدێرنەو جیهانگیری و فەنتازیای تەکنۆلۆژیاو چێژو سیحرەکانی ئێستای ژیان و سێکس و سەفەر و گەشت و خۆشگوزەرانی.

نەوەیەك هەیە بەجیدی دەیەوێت ماڵەکەی، قوتابخانەکەی، شەقامەکانی، ژیانی کەسێتی خۆی، فەنتازیاکانی بەڕووی ئەو

حیکایەتانەدا دابخات، دەکارێ لەو خەیاڵە دارِزاوە خۆی قوتاربکاتو هەڵبێت، نەوەیەکت هەیە لەبەردەم ئارەزووە فەرامۆشکراوەکانو واقعی گرانەوەی دنیادا دۆشداماوە، ئەو بونەوەرە لەناوەوەرا کەرەستەگەلێکی کولتوریو کۆمەڵایەتیو ئاینی لەترادسیۆنێکی هەژاردا بەندیانکردوە، لەدەرەوەرا هێزە بچوکەکانی کایەو پێکهاتەکان لەترادسیۆنی چێژو ویستدا ئارەزوو داواکارییەکانی فەرامۆشدەکات. لەئەنجامی ترازانی ئەو ئاستە ژیارییەدا، کە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی ئەو کۆنتراکتە وەهمیانەیە کە لەنێوان مرۆڤو کۆمەڵگەدا دەبەسترێت، لەنێوان مرۆڤو ترادسیۆنو فەرهەنگو ژیاندا واژۆ دەکرێت، کە لەنێوان مرۆڤو ئەو ئاستە شارستانییە وێرانەدا دەبەسترێت، لەئەنجامی خەیاڵەکانی دەرەوەو کۆنی کەرەستەو ئامرازو یۆتۆبیاکانی کۆمەڵگای داخراو، نەوەیەك هاتۆتە ئاراوە، جیاوازتر لەنەوەکانی دیکە، سەرسامتر، خاڵیتر لەحیکایەت، بەلاَم پرتر لەگۆمراییی، بەتاڵ لەسەروەریو موقەدەساتو رەمزو بەهای فەرهەنگیو نەتەوەیی، بەلاَم لێوانلێو لەپرسیارو تەماشاکردنی ئەویدی. ئەو نەوەیە بە کردەوەو زۆر راستەوخۆ تەواو پابەند نیە بە مۆراڵێکی دیاریکراوەوە کە لەناوەندە داخراوەکانی ترادسیۆنەوە سەرچاوەی گرتبێت، تارِادەیەك پابەند نیە بە شوناسی نەتەوایەتیو وڵاتو نەتەوەو ئاستی ژیاری کۆمەڵگاوە، بەلاَم کارتێکراوەو غەرقی سەرلەبەری ئەو کاریگەرییانەیەو لەپەراوێزی ئەکتیڤیستە کۆمەڵایەتیو کولتورییەکاندایە، سەرسامە لەبەردەم ئەو کولتورەدا، ناکەوێتە بۆتەی هیچ حیکایەتێکی گەورەوە، بێئومێدە لەحیزبو دامودەزگاو پاشکۆکانی، بێئومێدە لەو ترادسییۆنە کۆنەی

ژیان، بێئومێده لەخودی ژیانو گۆڕانکاریو چالاکییەکانی، بێئومێده لەو نوێنەرایەتییەی دامودەزگا تایبەتییەکانی وەك ڕێکخراوە حیزبییە بەناو خوێندکاریو لاوانیانەی موزایەدە بە تەمەنو خولیاو ئەو ئاستە ژیارییەی ڕوانینەکانو دنیابینییەکانەوە دەکەن، بەلایکەمەوە بێئومێده لەئایدۆلۆژیاو حیکایەتەکانیو دەسەڵاتو دەزگاکانی، بێئومێده لەکۆمەڵگاو کولتورو ئاینو هێزەکانی. بەختیار عەلی پێیوایە:" وشەی نەوە لەگەڵ هەستێکی قوڵدا بە تاریکی دەستپێدەکات، لەگەڵ ئەو هەستەدا کە دڵنیا دەبین ((بینینی ئێستامان)) چیتر سودێکی نیە بۆ تێپەڕینو پەڕینەوەو تێگەیشتنو مانادان بە ژیان. نەوەی نوێ هەمیشە لەتاریکییەوە دێتە دەرێ، تاریکییەك کە لەبنەڕەتدا دەرئەنجامی کۆنبونو کاڵبونەوەو تاریکبونی ماناو سیستەمو تامو ئارەزووەکانە. بۆئەوەی نەوەیەك دروستبێت، تورەبون، تاریکی، گۆڕان، بەشدارینەکردن، هاوارکردنو، هەستکردن بە پوچی، نەهلستییەت، ئانارشیەت، کەمبونەوەی چێژی ژیان، گەڕانو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شتێکی دی سەرەتای هەرە گەورەن، بەڵام هەموو ئەوانە سەرەتان، سەرەتان بۆ دروستبونی شتێکی دی کە دەشێت هەرگیز دروست نەبێت"[30]. لەڕێی ئەم تێڕوانینەوە، لەڕێی ئەم وێناکردنەوە بۆ نەوەی نوێو تاریکییەکانی ناوەو دەرەوەی ئەو نەوەیە دەگەڕێینەوە بۆ ئەو وێرانەیەی کە یادەوەرییەکانی نەوەیەکی گەورەی هەڵکۆڵییەوە،

---

[30] ( بەختیار عەلی، کێن ئەوانەی دەبنە نەوەیەکی دی؟ بەشدارییەك لەو گفتوگۆیانەدا کە دەربارەی (شوێنی گەنجان لە کۆمەڵگادا) سازدەکرێت.ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژ(101) دووشەممە 2002/2/2.ل9)

دەگەڕێینــەوە ســەر ســتراكتۆری ئــەو تاریكییــە بەرفراوانــەی بووەتــە باكگراونــدی ئــەو نەوەیــەی كــە هەنوكــە باســی دەكــەینو دنیاكــەی راڤەدەكــەین، تاریكییــەكانو تاریكاییــەكان زۆر لــەوە گــەورەترن كــە بــە وتاریك یان لێكۆڵینەوەیەك یان بە گفتوگۆیەكی تەلەفزیۆنی ببڕێتەوەو دۆسیێكەی دابخرێت. ئایا ئــەوە تــاریكی نیــە نەوەیــەك لەئێستادا دەژی؛ بــەلام زادەی ســەردەمە تاریكــەكانی ســەركوتكردنو ســتەمكاریو وێرانەییەكانی كۆمەڵگایەكە لەپەراوێزی دنیادا؟ ئایا ئــەوە تــاریكی نیــە نەوەیــەك رازی نیــە كلیلــی دەرگــا كلۆمــدراوەكانی كۆمــەڵگاو كولتــورو فەرهــەنگو مــۆڕاڵی خەســاندنی ئارەزووەكــان تەســلیمبكاتەوە. بــەلام نائومێــدی لــەم كۆمەڵگەیــەدا تــا ئەوڕۆكــە لــەقۆناغی تەماشــاو سەیركردندایە، نەگەیشتۆتە قۆنـاغی سەرسامییەكی گــەورەو قۆنـاغی تێگەیشتنو دروستكردنی پرسیاری گەورەو خوێندنەوەیەكی رەخنەیی بۆ رابردوو و بۆ ئێستا.

ئەو حیكایەتە گەورانەی كۆمەڵگاو دەسەڵاتو ناوەندە وێرانەكەی كولتــوری داخــراوی كۆمــەڵگا دەبنبــە پانتاییــە بەرفراوانــەكانی ئــەو خامۆشیو خەڵۆەتگە سەرتاسەرییە، لەلایەك ترادسیۆنی ئــەو مۆڕاڵە گشتگیرە داخراوە دەبێتە زادگایەكی تاریكو سەرچاوەیەكی داخــراو بــۆ هەنوكــە ژیارییــەكانی تاكەكــەسو پەیوەنــدی مــرۆڤ بــە پێكهاتــە زیندووەكانــەوە، لەلایــەكی دیكــەوە ئــاین دەبێتــە ئــەو خەیاڵدانــە سەرتاسەرییە بۆ داخرانی دنیای نـوێو فەلسەفەیەكی دیكەی ژیـان، دەبێتـە سـتراكتۆرێكی تـاریكتر لەكۆمـەڵگاو خێـزانو ناوەنـدە سیاسـیو ئـابوریو حیزبـیو كۆمەڵایەتییـەكان. بێگومـان لـەدنیادا بێزارییـەكان

دەبنە سەرەتايەكى گەورە بۆ گەلاڵەكردنى گومانو پرسيارگەلێكى جياواز لەتاريكييەوە بۆ سەرزەمينێكى ديكە لەدەرەوەى يۆتۆپيا تاريكەكانى نەوەكانى پێشوو، لەدەرەوەى كۆمەلگا، حيزب، دەسەلات، كولتور، ئاين، مۆراڵى گشتىو ترادسيۆنى باوى ڕوانين.

لەڕاستيدا گەمژەييەكى گەورەيە گەر بمانەوێت بەو كەرەستەو ئامرازە كۆنانەى بيروڕوانينو مۆڕاڵەوە مامەڵە لەگەڵ دنياى نوێى ئەو ئاستە ژيارييەدا بكەين كە لەهەنوكەدا تەواوى ژيانو چێژو ئارەزووەكانى ئێمەى سەرسامكردوە، تەمەڵييەكى گەورەيە گەر لەڕێى ئەو ترادسيۆنە تاريكەى خۆمانەوە فەنتازيايەك گەلاڵەبكەين بۆ خەملاندنى يۆتۆبيايەكى ديكە بە مەبەستى كرانەوەو بەكاربردنى كەرەستەكانى مۆديرنەو ژيان لەگەڵ ئاستە هەنوكەييەكانى جيهانگيريىدا، نەفامييەكى گەورە لەئارادايە ئەگەر دەسەلاتو حيزبو ناوەندە حكومييەكان لەو باوەڕەدابن لەڕێى كەناڵە حيزبىو سياسىو پاشكۆيىو ناوەندە هەزيلەكانيانەوە مامەڵە لەگەڵ دنياى مۆديرنو نەوەى ساتەلايتو ئينتەرنێتو وێنەو بەها نوێكاندا بكەن.

هەرچەند ئاشناييەكانى ئێمە بە دنيا داخراوەكەى خۆمان لەزيادبوندا بێت هەر كەمە، بێگومان شەڕى نەوەى نوێ لەسەر دەسەلاتو ململانێى هێزەكان نيە، ئەو شەڕە لەتاريكييەوە بۆ ئێرە دێ، لەتاريكييەوە سەفەر دەكات بەرەو خەونێك لەدەرەوەى ئەو خەونە مێگەليانەى كە كۆمەلگە لەتاكەيەك وەهمدا كۆدەكاتەوە، كۆمەڵە چێژێكى ديكەيە، جياوازتر لەو چێژەى كە لەتاريكييەوە دێ، بەرەو ئەفسانەكانى سەفەر، تاڕادەيەك سەفەرێكە بە ناو نائوميدىدا،

سەفەرێکە بۆ تێگەیشتن لەفەرامۆشبونو بێبایەخی، تێگەیشتن لەخەساندنو چەپاندنو حەرامەکان، لەراستییدا لەتاریکاییە سەرتاسەرییەکاندا دنیایەك قسەو گفتوگۆ لەسەر حەرامو قەدەغەکراوەکان دەکرێت، دنیایەك قسە لەپوچییەکانو وێرانەییەکان دەکرێ، نەخێر دنیایەك جوێن ئەدرێ بە دەسەڵاتو کۆمەڵگاو هێزو حیزبو ئاین، لەبەرئەوە دەبێت بگەینە ئەو باوەڕەی کە:"تازەگەری ئەو جیهانە پیرۆزەی پارچەپارچەکرد کە لەیەککاتدا خوداییو سروشتی بوو، هاوکات بونەوەرو شەفاف بوو بەرامبەر بە عەقڵ، بەڵام جیهانی عەقڵو جیهانگیری شوێنیان نەگرتەوە، هەروەها کاتێك تازەگەری ویستە کۆتاییەکانی بۆ جیهان راگەیاند، مرۆڤ ناتوانێت پێیبگات، جیابونەوە هاتە گۆڕێ لەنێوان خودی دابەزیو لەئاسمانەوە بۆ زەوی کە روخسارێکی مرۆیی بۆ خۆی وەرگرتووەو لەنێوان جیهانی بابەتەکان کە تەکنیکسازی گەمەی پێدەکات. تازەگەری ئەو یەکبونە جیهانییەی کە ئیرادەی خودایی دروستیکردبوو داگیرکردوو و وێرانکرد، یان عەقڵ یان مێژوو، بەعەقلانیکردنو سەرئەنجامکردنی، خود جێیگرتەوە."[31] ئەوە بەرهەمی مۆدێرنەیە کە کار لەسەر گۆڕینی چێژو ئارەزوو، گۆڕینی تەماشاو روانین دەکات، ئەوەی لەسەردەمە کۆنەکاندا ستەمکاری بوو ئێستاکە بەناوی سیستمێکی دیکتاتۆریەوە کاردەکات، ئەوەی لەڕێی شۆڕشەکانەوە وێراندەکرا ئەوڕۆکە بەناوی دیموکراسیەوە وێراندەکرێت، ئەو روانینو دنیابینییە جیاوازو نوێیانەی کە لەسەردەمە کۆنەکاندا بەناوی ئاینو دەسەڵاتی کڵێساو

---

[31] ئالان تۆرین، نقد الحداثة ، ترجمة: انور مغيث، دار الحداثة، ل22-23)

سوڵتان‌و خولەفاكانەوە دەكوژران، ئەوڕۆكە بەناوی دەزگا مۆدێرنـەكانی چاودێركردنەوە، بەناوی ئاسایشی نەتەوەوە، بـەناوی دیموكراسیەتەوە، بەناوی حیزب‌و دەوڵەتەوە خەفەدەكرێن. ئەوەی جاران ناوی دزی بـوو ئەوڕۆكە بەناوی گەندەڵیەوە تێدەپەڕێت، ئەوەی لەرابردوودا بـەناوی ستەمكارییەوە پیـادەدەكرا ئەوڕۆكـە بـەناوی دبلۆماسـیەتەوە ئەنجامدەدرێت.

## رۆشنبیری كوشندە

لـەدنیای داخـراودا رۆشـنبیران‌و فەرهەنگییـەكان بێجگـە لەكۆمـەڵێك دەنگـی جیـاوازو رەخنـەگرو ئەكادیمیـستی چـالاك‌و سـەربەخۆ، بەگـشتی دابەشـدەبن بەسـەر تاكەیـەك روانـین‌و دنیابینیدا، بـەلام لـەناوەوەڕا دابەشـدەبن بەسـەر زیـاد لەكایەیـەك‌و پێكهاتەیەكی فەرهەنگی‌و سیاسی‌و ئـابوری، بـە واتایـەك دابەشـدەبن بەسـەر حیـزب‌و پێكهاتەكانیـدا، بەسـەر ئایـدۆلۆژیا جیاجیـا هاوشـێوەكاندا، ئـەوە بێجگـە لـەو رۆشـنبیرە سـونەتییەی كـە تاسەرئێـسك لەكـەلاوە مەعریفییـەكانی خـۆی‌و ئـەو پانتاییـە داخـراوەدا دەژی كـە بارگاوییـە بـە دنیابینییـەكی ترادسـیۆنی یـان ئاینی یان ئایدیای سونەتیی.

"ئەوانن واقعـی سیاسـی‌و رۆشـنبیری ئێمـەیان خـستۆتە بـەردەم ئـەو راستییەوە، كە حیزب لەرێی دەسەلات‌و پارەو هێـزی خۆیـەوە، دەتوانێت خۆڵبكـات بـە زێـڕ، بـەلام ناتوانێـت جـەهل بكـات بـە مەعریفـەت، حەقیقەتێكە حیزب‌و فەرمانبـەرە ئیفلیجـەكانی لـەناو رۆشـنبیراندا وەك

تاعون لێی دەترسن."32 لێرەدا نوسەر باس لەخوێنەرێکی تێکستناس‌و جیهانبین دەکات کە لەتوانایدایە تێکستی زیندوو لەتێکستی مردوو جیابکاتەوە، بەلاّم پێچەوانەی ئەم خوینەرو رۆشنبیرە لەرێی ئەم پەرەگرافەوە دەرەوازمیەکی ئالۆزتر لەدنیای داخراوی ئەو رۆشنبیرە کوشندەیەو ئەو حیکایەتە کوشندانە دەکاتەوە.. هەڵبەت ئەو دەزگایانە تەنها لەرێی تاکەیەك میکانیزمەوە کار لەسەر بەرپاکردنی ئەو جەهلە ناکەن، بەڵکە لەرێی هەزاران حیکایەتی کۆپیکراوەوە، هەزاران وەهمی بچوکەوە دەکارن مەوداکانی بیرکردنەوەو جیاوازییەکان‌و رەخنەکان لەتاکەیەك مەودای کورت‌و نادیاردا ونبکەن، لەراستیدا تەنها لەم جۆرە رۆشنبیرییەدا دەسەلاّت‌و دەزگا رۆشنبیرییەکانی لەهەوڵی سوککردنی دەق‌و تێکستی جدیان‌و کار لەسەر بێبایەخکردنی رەخنەو نوسینی ئەکادیمی‌و رۆمانی نوێ دەکەن کە هیچیان کەمتر نیە لەو رۆمانە جیهانیانەی کەخەلاّتی گەورە وەردەگرن‌و شیعری نوێ‌و روانینی نوێ کە لەئاستی بەرزی شیعردان بەبەراورد لەگەڵ تێکستە جیهانییەکان.

بەلاّم لەدەرەوەی ئەو دنیا داخراوە، لەدەرەوەی ئەو سەرزەمینە پاوانکراوە، دنیابینییەکی دیکەو روانینێکی دیکە هەیە کە رەخنەئامێزانە دەروانە کۆمەڵگەو کولتورو ئەو ترادسیۆن‌و ناوەندە کۆنکرێتیانەی وەك حیزب‌و ئایدۆلۆژیاو دەزگا رۆشنبیرییەکانی دەسەلاّت کەکاریان تەنها دوبارەکردنەوەی روانین‌و ئەو خەیالگە سونەتیەیە کە سنورەکانی روانینیان ئەو مەودا کورتانە تێناپەرێنێت کە دنیای قەدەغەکراو لەدنیای رێپێدراو جیادەکاتەوە، ئەو ناوەندانەی کە ناتوانن

---

[32](خوێنەری کوشندە، ل43)

لەو بەراوردە کوشندەیە دەربچن کە دنیای شتە پیرۆزەکان لەدنیای ئاسایی جیادەکاتەوە، ناشتوانن دنیابینییەکی جیاوازیان هەبێت بۆ بەرپاکردنی گۆڕان و گەردونگەراکردنی دنیای هاوچەرخ و شکاندنی هەر بێدەنگییەکی جاهیلانە بەرامبەر بە خودو گۆڕان و هەر روانینێکی بەشدار لەو نەخشەسازییە کیشوەربڕانەی کە لەدەرەوەی ئایدیا بەبەردبوەکان و ئەو میتافیزیکا وەهمیانەوە سەرزەمینە پاوانکراوەکانی ترادسیۆن تێدەپەڕێنن.

هاوکات تاکەیەك مەودای دیاریکراو کۆی ئەو رەهەندانە لەخۆی کۆدەکاتەوەو لەپێکهاتەیەکی نەریتی و ئەخلاقیدا جێگیریان دەکات. لەو کۆمەڵگەیانەدا کە دەسەڵاتێکی داخراو و رۆشنبیرانێکی سونەتی بێشومار دەبنە بیرکەرەوەو داڕێژەری راڤەکردنی دنیا لەنیگا داخراوەکانی خۆیانەوە دەبنبە بەرهەمهێنەری دوبارەکردنەوەی وێنەکانی خۆیان لەکەرنەڤاڵ و فیستیڤاڵ و بۆنەو موناسەبەی ساختەو داگیرکردنی ئەو ئاستە ژیارییەو خاوەنداریێتیکردنی سەرلەبەری هەر روانینێك کە دەکەوێتە بازنەی کەرنەڤاڵەکانیانەوە. ئەو جۆرە لەرۆشنبیر بێئەندازە لەهەوڵی جێگیرکردنی کەلاوە مەعریفییەکانی خۆیدایەو بەردەوام خولیایەکی گەورە بۆ داگیرکردن و مۆنۆپۆلکردنی هزرو دنیابینییە جیاوازەکان لەگەڵیدا دەژی و کاردەکات بۆ بەرپاکردنی خەیاڵدانێکی بچوك لەچوارچێوەیەکی کەرنەڤاڵی ساختەو دوبارەدا بۆ شاردنەوەی هەرچی کەموکوڕی و ئەو هەژارییە گەورە مەعریفییەی کە تیایدا دەژی.

مەریوان وریا ئاستێکی دیکەی ئەو قەیرانی دیوەخانسازیو حیکایەتخوانییە دەخاتە بەرباس‌و رەخنەسازییەکی کراوەترەوەو دەڵێ: "ئێمە پێویستمان بە نەوەیەك لەرۆشنبیران هەیە جیهانمان بۆ لێکبدەنەوە، نەك وەعزو نەسیحەت‌و وەهمی ئایدۆلۆژی‌و رێزی کۆمەلآیەتی بەخەلك بفرۆشن، پێویستمان بە نەوەیەکە کە فیکر بەرهەمبهێنێت نەك خەریکی رێکخستنی فیستیڤاڵ‌و بۆنەی کۆمەلآیەتی‌و سیاسی بێت، ئێمە لەقۆناغێکدا ناژین رۆشنبیرێك بێت‌و بەردەوام یادەوەرییەکانی خۆیمان لەگەڵ فلآنە نوسەری مردوو و فلآن شاعیری کۆچکردودا بۆ بگێڕێتەوە، ئێمە لەجیهانێکدا دەژین بۆئەوەی بتوانین تیایدا بمێنینەوە دەبێت بیناسین‌و بیخوێنینەوەو بیگۆڕین."[33] لێرەدا پێویستە رۆشنبیری حیکایەتخوان لەرۆشنبیری جیهانبین جیابکەینەوە، دیوەخان لەپرۆژەی رۆشنبیری جیابکەینەوە، واعیزو خوتبەبێژ لەرەخنەگرو ئەکادیمستی چالاك جیابکینەوە، نەخوێندەواری ئایدۆلۆژیست لەخوێندەواری سەربەخۆ جیابکەینەوە، کەرنەڤاڵی ساختەو فیستیڤاڵی تەنەکوری لەهەوڵی رۆشنبیریی جدی‌و بەرپرسیارێتی فەرهەنگی لەنابەرپرسیارێتی‌و تەمەڵخانە گەورەکانی ئەو دیوەخانە رۆشنبیری‌و حیزبیانە جیابکەینەوە. لەبەرئەوە پێویستە پرۆسەی ناسینی خۆمان‌و جیهان بە پرۆسەیەکی دورودرێژی میتۆدی دابنێین‌و هەر لەرێی ئەو دنیابینییە جیاوازانەوە کلێشەسازییەکی دیکەی مۆدێرن سازبدەین بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتنمان لەدنیای گۆڕانکارییە گەورەکان‌و

---

[33] (بەختەوەری‌و بێدەنگی،ل93-94)

هەڵوەشاندنەوەی ئەو دنیا داخراوەی ترادسیۆن و کۆمەڵگەو ئایدۆلۆژیاو یۆتۆبیا بچوکەکان، هاوکات پێویستە لەوە تێبگەین کە ئێمە وەك بونەرێکی بەشدار لەم جیهانەدا پێویستمان بە هێزی گۆڕان هەیە لەناوەوە بۆ دەرەوە، لەهەمووی گرنگتر پاككردنەوەی روانینمانە بۆ دنیا لەهەر حیکایەتێکی کوشندەو لەهەر جەهلێکی کوشندەو دروستکردنی هەزاران پرسیار لەرابردوو و ئێستاو سازدانی دنیابینی جیاوازو بەشدار لەهەر گۆڕانکارییەکی دەرەوەی ئەو حیکایەتە داخراوانەی کە زەمەن تیایدا کۆپیکراوێکی دوبارەی دنیای نەوەکانی پێشووەو خەیاڵگەیەکی کۆنکرێتییە بۆ بچوككردنەوەی دنیا.

کۆنپارێز بۆئەوەی خۆی بەکوڕی هەموو سەردەمەکان بزانێت، بۆئەوەی لەهەموو بارودۆخەکاندا خۆی دوبارەبکاتەوە، بۆئەوەی خۆی بکات بە ماڵی هەموو زاراوەکانداو جارێکی دیکە بە هەژاری تەفسیریانبکاتەوە؛ هەڵئەسێت بە بەکارهێنانی شێوازی خاوەندارێتیو خۆی بەخاوەنی سەرلەبەری هەبووەکان، سەرلەبەری روانینەکان دەزانێت. هاوکات خۆی بە خاوەنی رۆشنبیریو کولتورو فەرهەنگی گشتیو تایبەت دەزانێت، خۆی بە دایکی هەموو گروپەکانو هەموو روانینەکان دەزانێت، خۆی دەکات بە مەرجەعی شارستانیو روناکبیریو ئاستە جیاجیاکانی دنیابینی.

ئێمە لەکتێبی کۆمەڵگای داخراودا باس لەسەلەفیەتو کەلاوە مەعریفییەکانی دەکەینو ئەوە رووندەکەینەوە کە ..گەورەترین بێئاگایی لەوێوە دەستپێدەکات، کاتێك دەگەینە باوەڕێکی دیاریکراوی رەها بۆ دنیاو دروستکردنی وێنەیەك لەوێنەکانی ژیانو

فەزایەکی داخراو بۆ خۆمان و بینینمان و کلێشەیەکی تایبەت بۆ مۆدێلەکانی روانینمان دروستدەکەین، لەوە خراپتر ئەوەیە بگەینە باوەڕێکی تەواو سەبارەت بەوەی شتێك لەشتەکان، فەزایەك لەفەزاکان، دنیایەك لەدنیاکان کۆتاییان هاتووە، بەو نیازو مەبەستە داخراوەی خۆمان کە دەبێت هەموو شتێك پەیام و پێغەمبەرێکی هەبێت، دەبێت سەرلەبەری هزرەکان و بیرکردنەوەکان و لێکۆڵینەوەکان و داهێنانەکان ئاراستەیەکی دۆگمایی سنورداریان هەبێت و گوزارشت لەفەزایەکی دیاریکراو و دنیاییەکی داڕێژراو بکات لەبناغەوە تا کلێشە واقیعی و فەنتازی یان رەمزییەکانی، هاوکات دەربڕی تاکەیەك گوزارشت و تاکەیەك قسەبێت، گەر قسەی دیکەشی هەبێت دەبێت دوبارەو درێژکراوەکانی خۆی بن. مەعشەرەکانی ئەم بیرۆکەیە بەتوندی داکۆکی لەدوبارەبونەوەی خودو کلتورو کەلەپورو رەگەزەکانی یادەوەریی و تێڕوانین و چەمکەکان دەکەن. لەپاڵ ئەو داکۆکییەدا ستراتیژێکی خەتەرناك خۆی مەڵاس داوە، ئەو ستراتیژە پەرجویەك نیەو رێکەوتێکی نەشازی دابڕاویش نیە لەناوەندی بیرکردنەوەی کۆی بنەما پەیڕەوەکانی پێوانەیەکی هەمیشەیی بۆ بینینی دنیاو گوزارشتەکان، بۆئەوەی خۆمان لەدوبارەبونەوەی ئەو پەیامانە رزگاربکەین دەبێت بەرلەهەر شتێك، بەرلەهەر خەیاڵێکی جیاواز مەوداکانی دوبارەبونەوە، روانینەکانی، پەیامەکانی، پێوانەکانی، پێبەندەکانی و خەیاڵدانەکانی دوبارەبونەوە بناسین و شوناسەکانی دیاریبکەین. گەمژەییە لەو باوەڕەدابین دنیای پڕ دوبارەبونەوە بەدوای جیاوازی و

ئەفڕاندندا ناگەڕێ، لەبەرئەوەی بونەوەرەکانی ئەو دنیایە سەرقاڵی کردنەوەی قفڵە داخراوەکانن، بەڵام کەرەستەگەلێکی کۆن‌و سواو بەکاردەبەن. دوبارەبونەوە کەرەستەگەلێکی جۆراوجۆرو هەمەڕەنگ بەکاردەبات بۆ خزمەتکردنی دنیا داخراوەکەی ئەو فەرهەنگە هەژارە، کە مەوداکانی خۆی بەسەر تەواوی پانتاییەکاندا رایەڵ دەکات‌و نەفەسی هیچ جیاوازییەك ناهێڵێتەوە، لەو فەزایەدا مەوداکان سەرەتاو کۆتاییان هەیە، رەهەندەکان لەقۆناغی وێکچوو، لەسەرزەمینی وێکچوودا دووبارە دەبنەوە، تەنها ئاوێنەیەك هەیە بۆ روانین‌و پێچەوانەکردنەوەی تاکە مۆدێلێکی روانین، بونەوەرەکانی ئەو مەودا بەرفراوانەی کە دوبارەبونەوە حوکمی تیادا دەکات، جیاوازی‌و هەمەڕەنگییەکان قبوڵناکەن، هیچ بونێکی دیکەو روانین‌و کایەیەکی دیکە وەرناگرن، بێزارن لەزۆری ئاوێنەکان، لەبەرئەوەی روبەرەکانی ئەو مۆدێلە کەشف دەکات‌و دوورونزیك لەچەند لایەکەوە دەریاندەخات، دوبارەبونەوە تاکەیەك پەیام‌و تاکەیەك مەبەست ئاڕاستەی دەکات، کەرەستەکانی کەرەستەگەلێکی سەرەتایین بۆ جوڵاندنی ژیان‌و مامەڵەکردن بەرەگەزەکانەوە، کەس نیە رەگەزو کەرەستەکان‌و وێنەکانیان نەناسێتەوەو ئاشنایان نەبێت. دەرئەنجام دوبارەبونەوە کاردەکات بۆ بەرجەستەکردنی دنیایەکی داخراو و نەریتی، کە تیایدا سەرلەبەری هەبوەکان لەبەرجەستەکراوێکی نەریتیدا دەپارێزرێن‌و هەموو جیاوازیەك‌و هەموو روانینێك دەکەن بەقوربانی حیکایەتێك لەحیکایەتەکان، بەڵام لەپاڵ ئەو دنیایەدا، لەپاڵ‌و ئەو مەوداو روانین‌و ئاوێنە

داخراوانەدا دنیایەکی دیکەو مەودایەکی دیکەی روانین مەزراکانی ئەو واقیعە داگیردەکاتو خەیاڵدانێکی بەرفراوان بۆ بوونو دنیابینی دەخولقێنێ، کەرەستەکانی ئەم دنیا جیاوازە کەرەستەگەلێکی جیاوازن لەقەبارەو کارو ئەرکو فەنتازیاو رەمزو مانادا، کە ستراکتۆرێکی گەورەتریان لەپشتەوەیە، ئەو ستراکتۆرە کلێشەی پەیامێك یان ئامانجێك یان ستراتیژێك نیە، دنیایەکی دیکەیە بەڵام پڕاوپڕە لەجیاوازیو نوێخوازە بەمانا فەرهەنگیو فەلسەفیو روحییەکان.

بەختیار عەلی لەم کتێبەدا لەبەرامبەر ئەو سوکایەتیکردنە گەورەیە بە دەقو تێکستی زیندوو کە لەئارادایە، باس لەرۆشنبیرێك یان خوێنەرێك دەکات، کە ئەو پرۆسەی سوکایەتیکردنە پیایدا تێنەپەڕیوەو کاری تێنەکردووەو گەرای حیکایەتە بچوکەکانی خۆی تیادا بەجێنەهێشتوەو خوێنەرێکە دەورو کاریگەری دیاری هەبووە لەسەر بەرزراگرتنی دنیابینییە جیاوازەکانو رێزگرتن لەئەدەبو روانینی نوێو جیاوازو دنیابینی رۆشنبیرانێکی رەخنەگر. هەر بۆیە دەڵێت:"خوێنەری تێکستناس تاکە هێزێکە دەتوانێت حورمەت بۆ دەقو نوسەر پەیدابکاتەوە، خوێنەر ئەو هێزەیە کە دەتوانێت ئەڵتەرنەتیفی حیزبو دەزگا روکەشبازەکان بێت کە ناوەندی رۆشنبیری بۆ کتێبو داهێنەر دیارینکردووە." هاوکات باس لەو نوخبە گەورەیە دەکات کە لەدەرەوەی ئەو حیکایەتو ئەو دیوەخانسازییەی رۆشنبیرییەوە بە جۆرێکی سەرسورهێنەر لەهەموو گەمارۆو ئابلۆقەکان دەرچوونو حوکمی خۆیان بەسەر

حوكمی بكەرەكانی حیزبو رۆشنبیرە ساختەكاندا بەرزترو كاراتر ڕاگرتووە، ئەم نوخبە گرنگەی خوێنەر لەدەسالی رابردوودا پشتگیرییەكی بێوێنەی پرۆژەی رەهەندو چەندین پرۆژەی ئەدەبیو هونەری دییان كرد كە شایستەی پشتگیریكردنن... بەختیار بەردەوام دەبێتو باس لەو هێزە شاراوەیەی خوێنەر دەكات كە رەهەندیان كرد بەو هێزەی كاریگەری لەسەر ژیانی سیاسیو كۆمەلایەتیو فیكریمان بە كەس نەشاردرێتەوە، لەكاتێكدا عەقلە سەلەفییە مردووەكانو رۆشنبیرە تەقلیدییەكان شەرانگێزانە دژایەتیان دەكرد.. هەلبەت دواتر دێتە سەر ئەوەی كە خوێنەران لەلای ئەو تەنیا ئەو ژمارە خەڵكە نیین كە كتێبێك دەخوێننەوە، بەلكو ئەو هێزەن كە دەتوانن سەرمایە رەمزییەكان بەجۆرێكی نوێ دابەشبكەنەوە."، لەڕاستیدا ئەم پرۆسە دووردرێژەی كە رۆشنبیرو خوێنەرو تێكست لەئاستێكی ژیاری كراوەدا كۆدەكاتەوە، بازنەیەكی داخراوی خۆدووبارەكردنەوەو كۆپیكردن نیە، بەلكە مەیدانێكی گەورەی كاریگەرەكانو پێكدادانی هێزەكانە لەكۆنەوە بۆ نوێ، لە سونەتگەراییەوە بۆ نوێخوازی، لەپیرۆزخوازییەوە بۆ رەخنە، هەموو ئەم هێزانە لەململانێدان بۆ دروستكردنی كاریزماو گۆڕان، بەلام لەپاڵ هێزێكی رەخنەییدا دەیان هێزی داخراوو ئایدۆلۆژیو كۆنخوازیی هەیە كە كاریان راوەستاندنی زەمەنە لەمەودایەكی دیاریكراوی كەرنەڤالیداو كۆپیكردنەوەی حیكایەتەكانو باوەڕیان بە بچوكترین گۆڕان نیەو بەردەوام لەپاراستنی دنیای شتە پیرۆزەكاندا لەهەولی بێبایەخكردنی تێكستی زیندوو و

دروستکردنی خوێنەری کوشندەو مۆنۆپۆلکردنی سەرلەبەری ئەو ناوەندە رۆشنبیریو فەرهەنگییانەدان.

ئاراس فەتاحیش بە دیدێکی رەخنەگرانەوە، زیاتر وەزیفەی ئەو رۆشنبیرە رەخنەگرەمان بۆ دیارییدەکات کە کاری پاراستنی حیکایەتەکان نیە، وەك چۆن لای مەریوان وریا دەبێت رۆشنبیر خۆی دەربازبکات لەو هەژارییە مەعریفیو میتۆدییەو بتوانێت وەك رۆشنبیر بەمانای وشەکە کاری فیکریو مەنهەجی راستەقینە بکات،..هاوکات دەبێت سەرقاڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بێت بۆ کایەی رۆشنبیری. ئاراس فەتاح پێمان دەڵێت: "رۆشنبیری رەخنەیی کەسێکە کە دەشێ ئەو چرکەساتانە باشتر بناسێت کە دەسەلأت تیایاندا ترسناكو روخێنەرە یان بەرهەمهێنەرە بنیاتکارە. ئەو بۆ ئایدۆلۆژیستەکانو ئەندازیارانی دەسەلأت ئەو گێرەشێوێنەیە کە شەرعیەتی پاوانکردنی حەقیقەتیان لێدەستێنێتەوە، چونکە بەرگری لەفرە کولتوریو فرەدەنگی سیاسیو فیکریو ئیستێتیکی ناو کولتوری کۆمەلگە دەکات."[34] هاوکات لەلای بەختیار عەلی رۆشنبیر ئەو کەسەیە هەڵدەستێت بە سەختترینو ئاڵوزترینو وردەکارترین پرۆسە کە ئەویش بەشداریکردنە لەدیاریکردنی مانای وشەی (کۆن)و (نویێ)دا لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، تەنها رۆشنبیرە دەتوانێت ئەو جورئەتو بوێرییە بداتە کۆمەلگا کە سیستمە کۆنەکانی خۆی، بیرکردنەوە کۆنەکانی خۆی، هەستە پیرەکانی خۆیو موقەدەسە زیانبەخشو لەکارکەوتوەکانی خۆی جێبهێڵێتو بیانشکێنێت، نە رۆشنبیر لەم

---

[34] رۆشنبیر، کۆمەلگە، دیموکراسیەت/ل67)

وەزیفەیــــە جیادەبێتـــەوە نـــە ئـــەم وەزیفەیـــەش لەرۆشـــنبیر جیادەبێتەوە."[35] بەمپێیە رۆشنبیر ئەو کلێشەسازییە کارتۆنییـە نیـە، کە دنیا کورتدەکاتەوە بۆ تاکەیەك حیکایەتو تاکەیەك روانـین، بەڵکە ئەو کەسەیە کە پرسیار دروستکارو گومانکەرە لەهەر خەیاڵێکی بچوکی داخراوو هەر ئیرادەیەکی گشتی پاوانکراو بە ئیرادەیـەکی گشتی پیرۆز، چۆن رۆشنبیر کار لەسەر دۆزینەوەی مەوداکانی کۆنخوازیو نوێخوازی دەکات، بەهەمان شێوە خوێنەرانێکی جدی بەرهەمـدەهێنن کـە کاریـان ناسـینو لێسـەندنەوەی حەقیقەتـە لـەو رۆشـنبییرو خوێنـەرو دەزگـا کوشـندانەی کـە کاریـان شـێواندنی حەقیقـەتو ئـاوەژووکردنی ئـەرکی رۆشـنبیریو فەرهەنگییـەو گۆڕینـەوەیـەتی بـە خـەیاڵێکی ئایـدۆلۆژیو هـــەزاران حیکایـــەتی بـــچوکی پـــاوانکردنی حەقیقـــەتو بوونەتـــە خولقێنەری دیوەخانو پارێزەری کۆمەڵێك موقەدەساتی ساختە.

ئیدوار سەعید پێمان دەڵێت: "رۆشنبیر نە رەگەزێکە بارودۆخەکان هێوربکاتـــەوە، نەخولقێنـــەری دۆخێکـــی گشتیـــشە، بـــەڵکو رۆشـــنبیر بونەوەرێکە هـەموو بـوونی خـۆی بـە هەسـتێکی رەخنەگرانـە بارمەتـە دەکـات، ئامـادە نیـە فۆرمەلـە ئاسـانەکانو بیروبـاوەڕە پەککـەوتووەکان قبوڵبکات، سازش بۆ کـاروکردەوەی هێـزە تەقلیدییـەکان ناکـات، دەبێـت ئـەم قبوڵنەکردنـەش کـزو شـاردراوە نـەبێت، بەڵکـە دەبێـت بەئاشـکراو چالاکانە ئەو شـتانە بـدرکێنیو بیانخاتـە روو."[36] زۆرێـك لەبیرمەنـدو

---

[35] (هـ.س.پ/ل7)

[36] (ئیدوارد سەعید، وێنەکانی رۆشنبیر، و. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، لەکتێبی؛ بیری رەخنەیی هاوچەرخ، کۆمەڵە وتار، 2001، ل 109)

رۆشنبیرانی جیهان بەتەواوی جیاوازی فیکری و میتۆدیانەوە کۆکن لەسەر ئەوەی کە رۆشنبیری رەخنەگر لەدەرەوەی ئەو ترادسیۆن و موقەدەساتە داخراوانە کاری داماڵین و روتکردنەوەی حەقیقەتەکانە بۆ پێکهاتەکانی و لەلایەك پێویستە هەڵگری ئەو میتودو فیکرە جیاوازو سەربەخۆیە بێت، لەلایەکی دیکەوە دەبێت توانای ناسین و جیاکردنەوەی کۆن و نوێی هەبێت بە ئەندازەیەك شەفافتر(ئاوێنتر) بڕوانێتە ترادسیۆن و رەخنەگرانەتر بڕوانێتە دنیای داخراوی ئەو مەودا کورتانەی روانین کە دنیا بەسەر پیرۆزو ناپیرۆزدا دابەشدەکەن، دنیا جیادەکەنەوە بۆ دوو بەرەی ناهەوسەنگ لەسەنگ و بەهادا، وەك جیاکردنەوەی حەقیەقەت و ناحەقیقەت، چاکەو خراپە، حیزبی و ناحیزبی، خاوەن حیکایەت و بەتاڵ لەحیکایەت. هاوکات دەرەنجامی ئەم جۆرە لەرۆشنبیری نادنیابین هەژارترین خوێنەرو هەژارترین دەزگاو هەژارترین دۆخی فەرهەنگی دروستدەکات و خولقێنەری هەزاران خەیاڵی کوشندەیە بۆ کوشتنی تێکست و بێبایەخکردنی روانین و دنیابینییە جیاوازەکان.

هەڵبەت لەم وتارە کورتەدا هێندە دەتوانین کۆمەڵێك رووی ئەو هەژارییە گەورە رۆشنبیرییە بخەینە بەرباس و ئەو مەودا جیاوازانەش بخەینە روو کە بە دنیابینییەکی جیاوازو رەخنەگرانەوە کار لەسەر ناسین و هەڵوەشاندنەوەی ئەو ترادسیۆنە داخراوانە دەکەن و لەدەرەوەی ئەو دەسەڵاتی حیکایاتانە کراوەترو جیاوازتر کار لەسەر خوێندنەوەی کۆمەڵگاو دەسەڵات و موقەدەس و فەرهەنگ دەکەن.

# کۆمەڵگەی خامۆش

- کۆمەڵگەی حیکایەتە بچوکەکان (کۆمەڵگە، یادەوەری، سێکس)
- کولتوری گوێڕایەڵی
- جەستە و کۆمەڵگە
- سێکس و وێنەکانی
- مرۆڤی یادەوەری

# کۆمەڵگەی حکایەتە بچوکەکان

**کۆمەڵگە، یادەوەری، سێکس**

کۆمەڵگەی حیکایەتە بچوکەکان، کۆمەڵگەیەکە کە غەرقی یادەوەریو مێژوو بووە، گرفتاری پەیوەندییە لۆکاڵییەکانی خۆیەتی بەکولتورو سیستمێکی کۆمەڵایەتی داخراوەوە، کۆمەڵگەیەکە تائەوپەری داخران دەروازەکانی ڕوانینو ئەو دنیابینیە داخراوەی کە لەشێوەی قەفەزێکدا هزرێکی لۆکاڵی سنوربۆکێشراو بەرهەمدەهێنێتەوە، بەڵام گرفتاری ئەو جیاوازییانە نیە کە خولقاوی فەرهەنگێکە خوازیاری کرانەوەو پەیوەندیو ئاڵوگۆڕکێی فەرهەنگیو ژیاریییە لەتەك ئەوانیدیدا، تێگەیشتنی ئەو کولتورە لەدنیاکانی دەرەوەی خۆی تێگەیشتنێکی ئیفلیجە کە لەتوانایدا نیە سنورەکانی روانینی مێگەلو خەیالگە نەریتییەکانی ئەو فەرهەنگە تێپەڕێنێتو ئەو بونیادە داخراوە هەڵوەشێنێتەوە کە سەرزەمینێکە بۆ فرێدانی مانای نوێو بەهای نوێ، کە ڕوبەرێکە بۆ داگیرکردنی زۆرترین پانتایی بۆ حیکایەتێکی بچوکی ترادسیۆنی.

ئێمە لەکتێبی کۆمەڵگەی داخراودا زۆرێك لەو مۆدیل پەیوەندیو کولتورو روانینو دنیابینیانەمان راڤەکرد کە دەبنە خەسڵەتە هەرە جیاکەرەوەکانی کۆمەڵگەیەکی نەریتیو داخراو، بەڵام لەم باسەدا دەگەڕێینەوە سەر ئەو وردەکارییانەی کە دەبنە پێکهێنەری ئەو دنیا داخراوەی فەرهەنگی کۆمەڵگە داخراوەکانو ئەو حیکایەتانەی کەدەبنە کلێشەسازییەکی کۆنکرێتی بۆ بەستنەوەی مرۆڤ لەیەکەیەکی داخراوی پەیوەندیو هزرو رەمزو بەهاو یادەوەرییەکی سەرتاسەری خامۆش لەئەکتیڤو گۆڕانو وەرچەرخانی گەورە.

حیکایەت لەئاستێکی ژیاریدا دابەشدەبێت بەسەر چەند ناوەندێکی یەکانگیردا کە دەبنە سەرچاوەگەلێکی کاریگەرو پەیوەندیامێز بۆ بەرهەمهێنانو وەبەرهێنانی خەیاڵگەو پانتاییەکی ترادسیۆنی:

یادەوەری: هەرچەندە هێزێکی ترادسیۆنییە لەپشت هەر حیکایەتێکەوە، هاوکات خەیاڵگەیەکی گەورەشە بۆ تاوتوێکردنی رابردوو، بۆ بەخشینی هەستێکی گەورەی نۆستالژیو بچوککردنەوەی پانتاییەکانی روانین لەسەرزەمینێکی داخراوی رابردوامێزدا، ئەو ئاستەش دابەشدەبێت بەسەر دوو مەودای جیاوازدا کە یادەوری دورو یادەوەری نزیکە، بەمپێیە یادەوەرییە دوورەکان هەرچی ئەو مێژوە دورودرێژە خەیاڵپێکراوو هەستپێکراوە دەگەێنێت کە دەبنە کەرەستەی بەرهەمهێنانو هزری پشت هەر بیرکەرەوەیەك، یادەوەری نزیکیش پێکهاتەی ئەو خەیاڵدانە ئێستاییە پێکدەهێنێت کە دەبێتە خولقێنەری

داڕشتەیەکی پەیوەندیامێز بۆ گرێدان و جۆینکردنی ئاستە جیاجیاکانی زەمەن لەرابردووەوە بۆ ئێستاو داهاتوو.

یادەوەری یەکێکە لەپێکهێنەرە هەرە بنچینەیی و سەرەکییەکانی حیکایەت و هاوکات دامەزرێنەری کلێشەیەکی فەرهەنگی و سایکۆلۆژی و نۆستالژی و زەمەنییە کە دەبنە پێکهێنەرێکی گشتگیر بۆ خولقاندنی حیکایەت و بەردەوامبون و پارێزگاریکردن لەمانەوەو نوێبوونەوە.

رووداو: یەکێکە لەپێکهێنەرە سەرەکییەکانی حیکایەت و مەودایەکی دیاریکراوە بۆ بەرجەستەکردنی بابەت و بەسەرهاتەکان لەپانتاییەکی چنراوی ساتەوەختەکان و گرێدانەوەی یەکلەدوایەکی گێڕانەوەو بەردەوامبوون. هاوکات رووداوو بەسەرهاتەکان چەند وێناکراوێکی واقعی بن، هێندەش بەرهەمهێنەری خەیاڵ و وەهمی گەورەن، هەرچەندە گوزارشت بن لەشوێن و کاتی دیاریکراو، بەلام گوزارشتێکی نادیاریکراویشن لەشوێن و کاتی ئەفسانەیی و فەنتازی.

بابەت: بەبێ دیاریکردنی بابەتی گێڕانەوە قسەکردن لەسەر حیکایەت مەحاڵەو بونی نیە، حیکایەت بەرهەمهاتوی چەندین بابەتی دیاریکراوە کەدەبێتە هەلگری خەسلەتە تایبەتمەندەکانی حیکایەت، گێڕانەوە بەبێ بابەتی دیاریکراو دەبێتە بابەتێکی میتافیزیکی، هاوکات یادەوەری و رووداوەکانیش بەبێ بابەتی دیاریکراو نابنە ئەو داڕێژەرە کلێشەسازەی کە بینای حیکایەت دەکات.

چێژ: پۆلێنکردنی چێژەکان دەرخەری تایبەتمەندی و ئاستی کاریگەری و بەردەوامبوون و مانەوەی حیکایەتەکانە، واتە هەر حیکایەتەو چێژی تایبەتی خۆی هەیە، یان چەند چێژێك

دەبەخشێت، چێژەكانیش بریتین لە: چێژی سەروەری، چێژی پیرۆزی، چێژی تابۆ، چێژی قەدەغەكراوەكان، چێژی پاڵەوانێتی، چێژی ژیانێكی باشتر، چێژی مردن، چێژی سێكس، عیشق، سەفەر، چاوەڕوانی، چێژی نائاسایی وەك چێژی كوشتن بەشێوازە جیاجیا، چێژی سێكسی بەشێوازو جۆری جیاواز(وەك لیسبیان، هۆمۆسیكسواڵ، فیتشی، ئەفسانەیی‌و ئاینی‌و مێژوویی)...تاد، رەنگە هەر حیكایەتەو بەپێی بابەتی دیاریكراو هەڵگرو پەخشكەری كۆمەڵێك چێژی دیاریكراو بێت بۆ سەرسامكردن‌و بەردەوامبون‌و خرۆشان‌و دروستكردنی حەماس‌و خرۆششان‌و خولقاندنی سوپەرمان‌و پاڵەوانی ئەفسانەیی. هاوكات رێژەی گەیاندنی ئەو چێژانە وەستاوە لەسەر شێوازو جۆرەكانی گێڕانەوە.

گێڕانەوە: ئەم پێكهاتە گرینگەی حیكایەت دابەشدەبێت بەسەر دوو مەودای جیاوازدا، یەكەم گێڕانەوەی كلاسیكییە؛ كە بریتییە لەگێڕانەوەی زارەكی یان وتاربێژی یان دەماودەم، دووەم: گێڕانەوەی مۆدێرن كە گرتنەبەری كۆمەڵێك شێوازی جۆراوجۆری گێڕانەوەو پێشكەشكردن‌و پەخشكردنە.

دنیای مۆدێرن سەرباری ئەوەی دنیای پەیوەندییەكان‌و دنیای گۆڕانكارییە گەورەكان‌و جیهانبینی‌و جیهانگەرییە، دنیای حیكایەتی نوێ‌و سەدای نوێ‌و دەنگدانەوە گەورەكانە، دنیای تێگەیشتن‌و شیكردنەوە جیاوازەكانە، هاوكات دنیای شێوازە مۆدێرنەكانی حیكایەتەكانە، دنیای بەكاربردن‌و بەكارهێنانی تەكنۆلۆژیای مۆدێرنە بۆ گێڕانەوەو پەخشكردنی حیكایەتی كۆن‌و نوێ.

سەرەتا حیکایەتەکان سەرباری ئەوەی دەماودەم‌و زارەکی نەوە دوای نەوە دەگوێزرانەوە، دواتر بونبە نوسراوو تابلۆی کێشراوی دەستی ئەو وێنەکێشە ئەفسانەییانەی کە تائەورۆکە ناویان ونە، هەڵبەت ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی دورودرێژی فەرهەنگی‌و مێژوویی‌و کۆمەلایەتی بووە، دواتر ئەم پرۆسەیە بەچەند شێوازێکی دیکەو بەخەیاڵدانێکی دیکەو بە کۆمەڵێك مۆدێلی دیکەوە بەردەوام دەبێت‌و حیکایەت بەرهەمدەهێنێتەوە، بەلام لەئاستێکی دیکەی ژیاری‌و فەرهەنگدا.

ئەورۆکە وێنەی فۆتۆگراف‌و ڤیدیۆو تەلەفیزیۆن‌و شانۆو دراماو سینەما، کەرنەڤاڵەکان‌و فیستیڤاڵەکان‌و ئینتەرنێت، کەرەستەگەلێکی مۆدێرن بۆ گێڕانەوەو ئەرشیفکردن‌و پەخشکردن‌و هێشتنەوەو دوبارەکردنەوەی حیکایەتەکان یان بەرهەمهێنان‌و خولقاندنی حیکایەتی نوێ، ئەم ساتەوەختە دارێژەری مۆدێلێکی دیکەی روانین‌و دنیابینییە لەئاستێکی نادیاریکراوی وێناکردن‌و بەرجەستەکردندا.

## دنیای مۆدێرن‌و حیکایەت

ئەوەی دەمانباتەوە سەرحیکایەتەکان، تەنها حیکایەت‌و وێنەو ویناکراوەکان نین، بەڵکە ئەو ڕوبەرە گەورە ژیارییە کە سەرلەبەری ژیان‌و جوڵەو گۆڕانەکان دەکات بەیەکپارچە سەرگوزشتەو یادەوەری‌و درێژکراوەیەکی مێژوویی‌و شارستانی‌و بەرجەستەکردنی مەودایەکی نادیاریکراوی روانین‌و خەیاڵدانێکی گەورەی حیکایەتامێزو پەیوەندیامێز.

میکانیزمە مۆدێرنەکانی حیکایەت یان ئەو ماشێنە گەورەیەی کە بەرهەمهێنەری حیکایەتە لەدونیای مۆدێرندا لەپێکهاتەیەکی بەرفراوانی وێناکردنو گێڕانەوەو ئەرشیفکردنو پەخشکردن، خاڵی نیە لەو ئاستە ژیارییەی ڕوانینو بچوککردنەوەی دنیابینی، بەڵکە پێکهاتەیەکی زۆر لەو ئاڵۆزترە کە ئێمە لێیتێگەیشتوین، زۆر لەوە گەورەترە کە ئێمە لەخەیاڵماندا وێنەی بۆ دەکێشین، زۆر لەوە گونجاوترە کە ئێمە وەك ناهاوتاو ناتەبایەك سەیریبکەین.

یەکێك لەو ناوندە گەورانەی کە بەکۆمەڵێك کەرەستەو میکانیزمی بێشومارەوە کار لەسەر بەرهەمهێنانی حیکایەتەکان دەکات.. ڕاگەیاندنە، یەکەمینو سەرەتاییترین کەرەستەکانی ڕاگەیاندن فۆتۆگرافە کە ڕاگەیەندراوێکی وێنەییە بۆ وێنەکردنی ئێستا لەیادەوەریو حیکایەتەکانیدا بەرجەستەکردنەوەی لەپانتاییەکی گەورەی تەماشاکردنو بینیندا، بۆ ئێستایەکی خوازراوو نەخوازراو. وردکردنەوەی ئەم کەرەستەیە تێگەیشتنی ئێمە فراونتر دەکات لەڕووبەرەکانی ئەو کاریگەرییەی کە وێنەی فۆتۆگرافییەکان دروستیدەکەن.

وێنە بەرلەوەی وێناکراوێکی بەرجەستەی ڕووداوو سەرگوزشتەو ساتەوەختە دیاریکراو و خوازراوەکان بێت کلێشەیەکە بۆ ڕاگرتنی ئێستا بە هەموو یادەوەریو خەیاڵپێکراوەکانیەوە، ساتەوەختێکە بۆ نەخشەکێشانی هەر یادەوەرییەك بەر لەبوونی یادەوەری، واتە ئەوەی وێنە دەیکات تەنها گەڵاڵەکردنی یادەوەری نیە لەنەخشەیەکی دیاریکراودا، ئەو حیکایەتانە لەتاکەیەك وێنەدا

بەرجەستە دەبێتو دووبارە دەبێتەوە لەتوانایدایە گەردونگەرای هەموو ئەو ساتەوەختانە بکات کە لەلای ئێمە دەبنبە یادەوەریو تێدەپەڕن.

وێنەکان دەبنە کۆمەڵێك ئاماژەی کاریگەر بۆ وروژاندنو پەیوەندیو مانەوەی حیکایەتکان لەبەرجەستەکراوێکی وێنەییو مەودایەکی دیاریکراوی مێژوویی، ئەو وێنانە هەر لەسەرەتای وێنەگرتنیانەوە حیکایەتو یادەوەرییەکانی ئێمە ئەرشیف دەکەن، ئەرشیفکردنی هەر ساتەوەختێکی ژیاری مرۆڤ خواستو خەونێکی مەزنو گەورەی بونگەرایانەی تەواوی مۆرڤایەتیو دڵەڕاوکێیەکی وجودیانەی مرۆڤەکانە بۆ وێناندنو دیمەنسازی بەهاو نرخو سەرمایە ڕەمزییەکانی ژیانو شەڕێکی گەورەشە لەگەڵ مەرگدا، ترس لەمەرگ یەکێکە لەدیاردە هەرە ژیاریو فەلسەفییەکانی مرۆڤ بەدرێژای مێژوو تا قوڵایی شارستانیو تا ئەوڕۆکە هەر ئەو پانتاییە ئەبستراکتە نەزانراوەیە کە هاندەرێکی سایکۆلۆژیو کولتورییەو پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆئەوەی بەردەوام بگەڕێت بەدوای ئەو شتانەی کە ژیان خۆشترو باشتر دەکەن. هەڵبەت هاوواتاو هاوماناکانی مەرگ کە دەبنە پاڵنەری گەورە بۆ ململانێو گەڕان بەدوای کەرەستەگەلی جیاجیا بۆ خۆشترکردنی ژیان، وەك برسێتی، نەخۆشی، درم، تۆفانو زریان، مردنی ئاژەڵو پەلەوەرکان، مردنی مرۆڤ، کۆچکردنو شەڕ، ...تاد، هەموو ئەو هاومانایانەی مەرگ ناوەندێکی ترس پێکەوە دەیان بەستێتەوە کە مەرگە، لەڕاستیدا بە ئەرشیفکردنی وێنەیی لەڕێی کامێرای فۆتۆگرافەوە هەرچی وێنەی شەڕو کوشتارو

نەخۆشیو برسێتییە لەیەك وێنەی مەرگو پانتاییەکی گەورەی وێناکردندا بەرجەستەیان دەکاتەوە، بەهەمان شێوە، بەلام بەشێوازێکی جیاوازتر بەتەکنیکێکی دیکەوە وێنەکان لەبەرجەستەکراوێکی جولاودا ئەو مێژووە دەپارێزن کە دەبێتە حیکایەتو گێڕانەوە، ئەو تەکنیکە نوێیەش کامێرای ڤیدیۆییە.

ئەوڕۆکە مرۆڤی مۆدێرن کە فیلمە دوکومێنتییەکانی هەردوو جەنگی جیهانی تەماشا دەکات، تەنها سەیرکەرێکی ئاسایی نیە، بەڵکە خودی ئەو بابەتە دوکومێنتیانە داملڕاوی مێژووییەکە کە سەروەختێك لێوانلێو بووە لەگێڕانەوەو سەروەریو ململانێو ترسو دلڕاوکێی مەرگ، بەلام ئەوڕۆکە منو تۆی بینەر بێجگەلەوەی کە کەوتوینەتە فەزایەکی دیکەی تەماشاکردنەوە، وەرگرو گوێگرێکی باشی ئەو حیکایەتانەیەن کە زارێك بۆمان ناگێڕێتەوە کە نوسراوێك نیە تەنها بیخوێنینەوە، بەڵکە پانتاییەکی گەورەی بینینو حیکایەتو وێنەو جولانەوەی مرۆڤو شتەکانە، شکاندنی ئەو تەلیسمە نادیارەیە کە بەهۆیەوە لەبەردەم حیکایەتە کۆنەکاندا سەرسام دەبوین. هەرچەندە حیکایەت مۆدێرنەکان پێکهاتەیەکی یەکانگیری یادەوەریو بابەتو چێژو روداو و گێڕانەوەن، بەلام تایبەتمەندییەکی دیکەشیان هەیە کە کۆکەرەوەو کلێشەسازی سەرجەم ئەو پێکهاتە ئاساییانەی حیکایەتن، ئەویش ئەوەیە کە حیکایەتی مۆدێرن خاوەنی هێزو فشارێکی دیکەیە کە سیحری گێڕانەوە نیە، بەڵکە سیحرێکی دیکەیە بۆ سەرسامکردنی مرۆڤ لەئێستاداو داگیرکردنی مرۆڤ بە وێنەی جولاوی یادەوەرییەك

پڕاوپڕ لەحیکایەتی شاراوە، لێوانلێو لە حەقیقەتی وەهمی لەبەرجەستەکراوی وەهمی و واقعی.

هاوکات دنیای مۆدێرن دنیای پەخشکردنێکی کۆمەڵە چێژێکی هەستپێکراوو وێناکراوە، هەروەها ویچنەکێشێکی بە سەلیقەی رووداوو حیکایەتو بابەتەکانی گێڕانەوەیە، وەك چۆن نەقاشێکی کارامەی تابلۆ چێژبەخشەکانە، بەهەمانشێوە ئەندازیارێکی مەعریفییە بۆ سازکردنی سیناریۆگەلێکی چێژبەخش و خرۆشێنەر یان وروژێنەرو سۆزامێزو عاشقانە یان شەڕانگێزانە، شۆرشگێڕانە یان بەزەیی و سزابەخشانە.

# کولتوری گوێڕایەڵی

خێزان وەك یەکەیەکی کۆمەڵایەتی نەریتیی ئاڵۆزو یەکانگیر، کە کۆکەرەوەیەکی بەهێزی سەرلەبەری پەیوەندییەکانی مرۆڤە بە کولتورو کۆمەڵگەو ئاینو پەروەردەو روانینی باو و ئیرادەیگشتی کۆگەلێك لەپەیوەندیو هاوخوێنی، بەواتایەك بچوکترین یەکەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە نەریتیو داخراوەکان خێزانە، خێزانیش بونیادێکی کۆنکرێتییە کە تەواوی فەرهەنگو ترادسیۆن تانوپۆدەکاتو رایەڵ رایەڵ مرۆڤ وەك بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی هەڵئەلوشێو سەرلەبەری تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکانی لێدەسێنێتەوەو غەرقی ئەو مەڵبەندە بچوککراوەی کۆمەڵگەی دەکات، بە واتایەك خێزان کۆمەڵگەیەکی چڕکراوەو بچوککراوەیە لەچوارچێوەی دیواری ماڵو پەیوەندیو پێبەندیو پەیوەستبون. ماڵ کە خانەی کۆکردنەوەو بەخێوکردنو پەیوەندییە بچوکەکانی مرۆڤە، بەهەمانشێوە خانەی بەرهەمهێنانو وەبەرهێنانی ئەخلاقیاتو فەرهەنگی کۆمەڵایەتیو دارێژەری سایکۆلۆژیای تاکەکەسەکانە.

ئەوەی لێرەدا باسی لێوەدەکەینو کار لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەو ستراکچەرە کۆنکرێتییەی دەکەین خێزانە لەکۆمەڵگە داخراو و نەریتییەکاندا، واتە ئێمە باس لەخێزانی مۆدێرن یان مۆدێلی

گۆڕاوی خێزان ناکەین کە لەماڵە ترادسیۆنەکانەوە بووەبە خانەی تاکەکەسی، واتە لەخانەی بە کۆمەڵەوە گۆڕاوە بۆ خانەی خودی تاکەکەس‌و کۆکردنەوەی ئەو زاتە پەیوەندیدارەی کە کۆی پەیوەندییەکانی دەرەوەی خۆی شوناسی ئەو پێکدەهێنێت‌و فەرهەنگی ئەو فەرهەنگێکی کراوەترە لەئاست ئەو روانینە نەریتی‌و فەرهەنگییەی کە خێزانە داخراوەکان بەرهەمی دەهێنن، واتە یەکەی بچوکی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگە کراوەو مۆدێرنەکاندا تەنها خێزان نیە، بەڵکە خێزان یەکێکە لەو یەکە بچوکانەی کۆمەڵگە، هاوکات ئەو یەکە بچوکەی کە خێزانە لەکۆمەڵگەیەکی کراوەو مۆدێرندا کە بەرهەمهێنەری فەرهەنگ‌و ئەخلاق‌و سایکۆلۆژیای تاکەکەس نیە بەگشتی، بەڵکە خودی خێزان نابێتە بەرهەمهێنەری فەرهەنگ، بەڵکە ئەوە ناوەندو دەزگا مۆدێرنەکانن کار لەسەر بەرهەمهێنان‌و گۆڕینی فەرهەنگ دەکەن، لەکۆمەڵگەی کراوەدا کە قوتابخانە یەکێکە لەو یەکە فەرهەنگییە هەژمونگەرو بەرپرسیارەی دەبێتە بەرهەمهێنەری فەرهەنگ‌و دەستکاریکاری ترادسیۆن‌و ئەخلاقیاتی نەوەکان‌و پێشخستنی ئاستی هەڵسوکەوتی شارستانی‌و ئاکاری مۆدێرن‌و دابونەریت‌و روانین‌و دروستکردنی دنیابینی‌و روانینی دەرەوەی فەرهەنگی باو و ئەخلاقیاتی داخراو، میتۆدی کارکردنی ئەم دامەزراوە فەرهەنگییە مۆدێرنە جیاوازترەو تاڕادەی غیابی ترادسیۆن لەڕێی کۆمەڵێك میکانیزمی هەستیارەوە کاردەکات بۆ نزیکبوونەوە لەخودی تاکەکەس‌و دەستکاریکردنی سایکۆلۆژیاو ئاستی روانین‌و پێشخستنی تایبەتمەندییە

تاكەسییەكانی مرۆڤ. واتە ئەوەی قوتابخانەی مۆدێرن كاری تیادا دەكات دروستكردنی سوپایەك نیە لەمرۆڤی تاكرەهەندو بێ جیاوازی، كە وەك یەك بیردەكەنەوەو خەیاڵیان وەك یەكەو روانینیان نزیكە لەیەكترییەوە، هاوكات دروستكردنی كۆمەڵگەیەك نیە لەیەك ئیرادەو لەیەك خەونو لەیەك روانیندا، بەڵكە كاركردنە بۆ فەرهەنگێكی جیاوازی روانینو كۆكردنەوەی سەرلەبەری دنیابینییە جیاوازەكان لەرووبەرێكی گەورەی پڕ گفتوگۆو پڕ گۆڕانكاریو تێگەیشتن لەیەكتری، هاوكات قوتابخانەو میتۆدی مۆدێرنی خوێندن بەرهەمهێنەری مرۆڤگەلێكە كە وەك یەك بیرناكەنەوە بەڵكە چانسەكانی بیركردنەوەو گەلاڵەبونی دنیابینی گەورەترن لەهەر پرۆگرامێكی سەرتاسەری پەروەردەو فێركردن، هاوكات پرۆگرامە مۆدێرنەكان هێندەی بەرهەمهێنەری مرۆڤێكی ئیرادەگەرە هێندە بەرهەمهێنەری مرۆڤێكی رامكراو نیە.

كاری قوتابخانە لەسەربازگەوە گۆڕاوە بۆ بەرهەمهێنانی روانینو بەشداریو كاریگەری جیاجیاو جیاوازی دنیابینی، هەروەها لەسەر ئاستی مۆدێلێش لەگرتوخانەوە گۆڕاوە بۆ فەزایەكی كراوەتری پڕ لەگفتوگۆو ئەكتیڤیتی، بەلام هەرچی قوتابخانەو فێرگەیە لەكۆمەڵگە داخراوەكاندا هێندەی نزیكە لەسەربازگەو گرتوخانەیەكی گەورەوە هێندە ناتوانێت وەك دامەزراوەیەكی مۆدێرن سەیربكەیت، هۆكارەكانی پشت ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم چەند خاڵە:

1/لەڕووی ستراكچەرو نەخشەو كلێشەسازییەوە.

2/پێکهاتەی ناوەکی قوتابخانە.

3/فەرهەنگ.

4/لەڕووی سایکۆلۆژییەوە.

5/لەڕووی دامەزراوەییەوە.

هەرچی خاڵی یەکەمی ئەو هۆکارانەیە کە بوونەتە بەربەست لەبەردەم دروستبونی قوتابخانە وەك دامەزراوەیەکی مۆدێرن، بریتییە لەکێشەی بونیادی کە دابەشدەبێت بەسەر چەند پێکهاتەیەکی بنەڕەتیدا: هەڵبەت یەکێك لەو گرفتە گەورانەی کە دامەزراوەی قوتابخانە پیایدا تێدەپەڕێتو وەکوخۆی بەداخراوی هێشتویەتییەوە، لەڕووی کڵێشەو دیکۆرو بیناسازییەوە ئەوەیە کە قوتابخانەیەك نابینێت وەك سەربازگە یان وەك گرتوخانەی جیاجیا لەیەکتری دروستنەکرابێت، لەڕووی بیناسازیشەوە هێندەی گرنگیدراوە بە داخرانو بچوککردنەوەی روبەرەکانی بینین، وەك پەنجەرەی بچوك، یان پەنجەرەی باریکی درێژی تەلبەندکراو، هاوکات جیاکردنەوەی بێشوماری پۆلەکان لەیەکتری، دیواری بەرزو دەرگای ئاسنو مەحکەم. شورای قوتابخانەکان هیچی کەمتر نیە لەشورای سەربازگەکانو هاوشێوەیەکی دیکەی ئەو مەودا داخراوەیە.

هاوکات لەڕووی کڵێشەدانانی پۆلەکانەوە، وەك دانانی کورسییەکان بەدوای یەکتریداو دواتر بوونی مامۆستایەکی چاودێر لەسەرو هەموویانەوە، نەبونی وانەو خوێندنی کرداری، بونی بلاکبۆردێك(تەختەرەش)ی مردوو لەبەردەم سەرجەم قوتابییەکاندا، کە رەمزێکی شاراوەیە بۆ راهێنانی مرۆڤ لەسەر ئەو

دەسەڵاتە نادیارەی فێرکردن، کە ئەمانە هەمووی هۆکارگەلێکی بەهێزن بۆ کوشتنی ئارەزوو و خەیاڵو کەمکردنەوەی چێژی بیرکردنەوەو خوێندنو خولیایەکی دیکەو جیاواز.

بونی کۆمەڵە هۆکارێکی دیکە کە پێکهاتە ناوەکییەکانی قوتابخانە رەنگرێژ دەکات، بریتین لەشێوازەکانی وانەوتنەوە، میتۆدی وانەکان، چۆنێتی مامەڵەکردن. هەرچی شێوازی وانەوتنەوەیە لەکۆمەڵگە داخراوەکاندا شێوازێکی کۆنو پڕ زەبروزەنگە، هاوکات هێندەی هاوشێوەی حوجرەی ئاینییو تەلقینەو بەرنامەیەکە بۆ لەبەرگرتنەوەی دەقاودەقی بابەتەکان بەبێ دروستکردنی روانینو رەخنە لەسەر هەر بابەتێکی فێرکردن، هێندە بەرنامەیەك نیە بۆ خوێندنو دروستکردنی دیالۆگو گفتوگۆی جیاوازو وروژاندنی خەونو خولیاکان، لەبەرئەوەی تۆی قوتابی بەردەوام لەبەردەم مامۆستایەکی وانەبێژو قسەکەرو بەدەسەلات دایت، ئەو کە قسەکەرێکی رەوانبێژە لەچاو تۆی قوتابیدا، خاوەن دەسەلاتو بڕیارو بیرکردنەوەشە، تۆش فێرخوازێکی بێدەنگو بێ دەسەلاتو قسەنەکەریت، دەرەنجام هاوکێشەیەك بەرهەمدێت کە بێجگە لەبچووککردنەوەی تۆ هیچی دیکەی لەبەرنامەدا نیە، ئەم شێوازە کاردەکات بۆ دانانی شوناسێکی بەکۆمەڵ بۆ هەموو فێرخوازێكو سەپاندنی تاکەیەك میتۆدی خوێندنو بیرکردنەوەو روانینو گرفتارکردنی تۆی خوێنەوار بەتاکەیەك پرۆگرامی کۆنو سواو و بێدەنگکارەوە، سەرجەم ئەم میتۆدە دەرەنجام بەرهەمهێنەری ئەو سەربازە گوێڕایەڵەیە کە

هەمیشە ئامادەی گوێگرتن‌و ئاماژەو زانیاریەکانە، بەڵام بێئیرادە، بێ خەون، دامالراو لەهەر فەنتازیایەکی تاکەکەسی، بەتاڵ لەهەر ئارەزوییەکی نادیاریکراوی خودئاگایی، بەتاڵ لەگۆڕان، بەڵام پڕ لەدووبارەبونەوەو نائامادەگی.

هاوکات نائامادەو بێتوانایە لەبەردەم چوارچێوەی زانیاری‌و میتۆدی سەربازی کە خولقێنەری فۆبیایەکی گەورەو ستەمێکی گەورەی رۆحی‌و دەرەونی‌و فەنتازییە. بۆنمونە چۆن ناتوانێت‌و بۆی نیە لەدەرەوەی ئەو میتۆدی مامەڵکردن‌و روانینەدا ئارەزوویەکی دیکەی هەبێت، بەهەمانشێوە سەربازێکیش نەخاوەنی ئیرادەی خۆیەتی نەخاوەنی تاکەیەك خەونی خۆیەتی، نەخاوەنی روانێنێکی وجودیانەی خودی خۆیەتی، لەکاتێکدا چۆن سەربازگە دەزگایەکە بۆ بەرهەمهێنانی ستەمکاری‌و داتاشینی مرۆڤ بۆ بووەیەکی شەڕانگێز، بەهەمانشێوە قوتابخانەش لەکۆمەڵگە داخراوەکاندا بە کۆمەڵێك میکانیزمی دیکەوە تاکەکەس دادەماڵێ لەخەون‌و خولیاو بیرکردنەوەی تاکەسیانەی خۆی‌و دەیبەستێتەوە بە سیستامێکی موراڵی دۆگماییەوەو وەك هەر ئاژەڵێکی ماڵی رامیدەکات‌و رایدەهێنێت لەسەر تاکەیەك حیکایەت‌و تاکەیەك ئیرادەو خەونێکی بچوکی شارستانی.

هەموو ئەمانەش دەرەنجام خولقێنەری مرۆڤێکن پڕ لەزەبروزەنگی خەفەکراو پڕ لەشەڕانگێزیی داپۆشراو و نادیار. لەبەرئەوە چۆن سەربازگەو خزمەتی سەربازی دەزگاگەلێکن بۆ کوشتنی خەون‌و ئارەزوەکانی تاکەکەس‌و رەخنەکوژ‌و ئیرادەکوژن،

هاوکـــات قوتابخانـــەش لەکۆمەڵگـــە داخـــراو و تۆتالیتـــاریی‌و دیکتاتۆرییەکانـــدا بـــۆ قوتابیـــان‌و مامۆســـتاکانیش ناوەندگـــەلێکی خامۆشکارن بۆ کوژاندنەوەی ئارەزو و خـەون‌و ئـیرادەی تاکەکـەس‌و خولیاو روانین‌و دنیابینییە تاکەکەسییەکان‌و هەموو ئـەو داهێنـان‌و بیرۆکانەی کە لەعەقڵی هەریەکێکدا گەڵاڵە دەبێت..

فەرهـەنگی داخـراوی قوتابخانـەکان هـەمان فەرهـەنگی داخـراو و ژەنگگرتـووی کۆمەڵگـە نـەریتی‌و داخراوەکانـە، بەواتایـەکی دی ئـەو فەرهەنگـە لـەناوەوەڕا هـەڵگری دنیایـەك نـەریتی کـۆن‌و کۆنپـارێزی‌و حیکایەتامێزە، ئەو فەرهەنگە بە ئەندازەیەك لۆکاڵییە کە رووەو نـاوەوە لەبـچوکبوونەوەو چـڕبونەوەدایە بەسـەر خۆیـدا، هاوکـات بێئەنـدازە هەڵگرو وەرگرو پەخشکاری ئەو فەرهەنگە هەژارەی کۆمەڵگەیە. ئەو کە هەڵگری نەریتی بێئاگایی‌و ئیرادەیـەکی داخـراوی مێگەلە، بـەردەوامیش کـار لەسـەر ئـەو وێرانەیـە دەکـات کـە هەرچـی جیـاوازی روانـین‌و دنیابینییەکانی دەرەوەی خۆیەتی جێی قبوڵ‌و رێزگرتن‌و گفتوگۆ نـیین، هاوکـات تاکەیـەك خەیالگـە سەرچـاوە هـزری‌و ئەخلاقییـەکانی ئـەو پێکدەهێنن.

خـــاوەنی شوناســـێکی دیـــاریکراو نیـــە، بەڵکـــە لـــەقوناغێکی هەلاهـەلای بــەر لەشـوناس‌و کۆکردنــەوەی فەرهەنگیدایــە، بــەلام ستراکـــچەری داخرانەکـــەی هێنـــدە کاریگـــەرە قبـــوڵی هـــیچ گۆڕانکارییەك‌و وەرچەرخانێکی ریشەیی‌و چارەسەرسازی ناکات، ئەو فەرهەنگـــە لـــەدەرەوەڕا فەرهـــەنگێکی بـــچوکە کـــە لـــەدوتوێی پێکهاتەیـــەکی دیـــاریکراوو ســـنورداردا هەڵئەســـوڕێ، بەواتایـــەك

بازنەیەکی بەرفراوانی ئەخلاقیو نەریتیو پارێزەری ئەو هەژارییە فەرهەنگیو رۆشنبیریو کۆمەلایەتییەیە کە مرۆڤەکان لەرێی دابەشکراوێکی ئەخلاقییەوە دابەشدەکاتەوە بەسەر کۆمەلگەو پێکهاتەو یەکە کۆمەلایەتیو فەرهەنگییەکاندا، رووبەرێکی ئەخلاقی گەورەیە بۆ غەرفکردنی هەر روانینێك لەخۆیداو بچوککردنەوەی هەر حیکایەتێك لەخۆیدا، ئەم فەرهەنگە لەرێی میکانیزمی رامکردنی ئەخلاقیو نەریتپارێزییەوە کاردەکات بۆ بەردەوامبونی خۆی، ئەو لەململانێی گەورەدایە بۆ مانەوەی خۆیو بەرفراوانکردنی پانتاییەکانی خۆی لەرێی زیادکردنی رووبەرە داخراوە فەرهەنگییەکانی خۆی، واتە ئەوەی لەقوتابخانەو فێرگەو زانکۆو دامەزراوە کۆمەلایەتیو فەرهەنگییەکانی کۆمەلگەدا دەگوزەرێ بچوککراوەیەکی کولتوری کۆمەلگەیەکی نەریتییە، واتە ئەو مرۆڤەی لەکۆمەلگە داخراوەکاندا بەرهەمدێت تارادەیەکی زۆر مرۆڤگەلێکی رامکراو و بێدەنگو گوێرایەلو خۆشباوەرن، بەهەمانشێوە ئەوەی قوتابخانەکان تا زانکۆکان بەرهەمیدەهێنن نەوەیەکی بێدەنگو گوێرایەلو یائسو بێ خەونو جیاوازییە، ئەوەی روانینو دنیابینییەکی جیاوازی هەبێت بەردەوام دژایەتی دەکرێت یان دەکەوێتە دەرەوەی ئەو ستراکچەرە کۆنکرێتییەی کە ناوی قوتابخانەو زانکۆیە.

لەرِستیدا ئەو ماشێنە فەرهەنگییە تەنها کار لەسەر رامکردنی مرۆڤەکان ناکات لەچوارچێوەیەکی فەرهەنگی بچوکدا، بەلکە رووبەرەکانی کارکردنی خۆی فراوانتر دەکاتو سەرلەبەری ناوەندو

دامـەزراوە حکـومی‌و فەرهـەنگی‌و کۆمەڵایەتییـەکان داگیردەکـات‌و مۆنۆپـۆلی دەکـات، هاوکـات ئـەو داگیرکارییـە فەرهەنگییـە تـەنها رامکــردن‌و گوێڕایــەڵکردن‌و کوشــتنی خــەون‌و جیاوازییــەکان ناگرێتەوە، بەڵکە کاردەکات بۆ دروستکردنی متمانەیەکی ئـەخلاقی خێڵـەکی درێژخایـەن بـۆ تۆخکردنـەوەی پەیوەنـدی‌و پێبەنـدی نەریتی‌و ئـەخلاقی، هاوکات بەرهەمهێنـەری دڵنیاییـەکی گەوەرەیـە بۆ مرۆڤگەلێکی گوێڕایەڵ، ئەوەی کار لەسەر بێدەنگی دەکات تـەنها هێزی ئەو فەرهەنگە تـرادسیۆنی‌و لۆکاڵیەیە نیە، بەڵکە رووبـەرکانی ئــەو حیکایــەت‌و یادەوەرییــە وردودرشــتانەن کــە مرۆڤگــەلێك دڵنیادەکاتەوە لەپاراستنی نـەریت‌و ئـەخلاقیاتی بـاوی کۆمەڵایـەتی، ئەو فەرهەنگە سنورەکانی جیاوازی ئەسـتوردەکات‌و میکانیزمـەکانی رامکــردن‌و مــاڵیکردن لــەڕێی پــەروەردەو فێرکــردن‌و تەلقینــەوە بەگەڕدەخات‌و شوراکانی نێوان خۆی‌و کرانەوە بەرزتر دەکاتەوە.

دواجار ئـەم فەرهەنگـە دڵنیاکەرەوەیـەکی ئـەخلاقی بـەهێزە بـۆ رامکردنــی مرۆڤــەکان لەتاکەیــەك دنیــای راڤــەکراودا، لەتاکەیـەك حیکایــــەتی دیــــاریکراودا، بەئەندازەیــــەك دڵنیاکەرەوەیــــەکی فەرهەنگییە بۆ سڕینەوەی هەر روانـین‌و دنیابینییـەکی جیـاواز، بـۆ سـڕینەوەی پرسـیارە گـەورەکان‌و بەدگومانییـەکان، بـۆ بـەرپاکردنی ناوەنـدێکی خـەیاڵی‌و پانتاییـەکی وەهمـی بێـسنور لەخۆشـباوەڕی. هاوکــات دڵنیاکەرەوەیــەکی شارســتانییە بــۆ رامکردنــی مــرۆڤ لەکۆمەڵێك موقەدەسات‌و سەروەری‌دا، بۆ دەستەمۆکردنی تاکەکەس

بە ئیرادەیەکی گشتی کوشندەو پڕ لەحیکایەتی بچوککردنەوەی مرۆڤ لەبەردەم سەروەرییە وەهمییەکاندا.

فەرهەنگی فێرگەو قوتابخانەکان زادەی ئەم فەرهەنگەیەو سنورەکانی ژیانو بیرکردنەوەو گفتوگۆو جیاوازی لێکنەچوون بەرتەسکدەکاتەوەو ئاستەکانی روانین بچوکدەکاتەوە، میتۆدی خوێندن لەکۆمەلگە داخراوەکاندا سەرباری ئەوەی میتۆدێکی هەزیلو کۆنو ژەنگگرتووە، هاوکات میتۆدێکی ئەخلاقیو ترادسیۆنیشە، نەگۆڕینی میتۆد بە چەند سالێكو قبولنەکردنی هەر گۆڕانکارییەکی دیار لەدەرەوەی خۆیو نائەکتیڤی خودی خوێندنو بەکارهێنانی شێوازە دیکتاتۆرییەکانی دەسەلاتی رەهای مامۆستاو بەرێوبەرایەتیو وانەوتنەوە لەکلێشەیەکی ستەمکاریی نەگۆڕو نائەکتیڤدا بەرهەمهێنەری مرۆڤگەلێکی تەلقینکراوی گوێڕایەلی رامکراووە لەچوارچێوەی ئەو حیکایەتە بچوکانەی کە سەروەختێك دەبن بە وانەکانی زمانو جوگرافیاو مێژوو زانیاری بچوك، نابنە بەرهەمێنەری هیچ خەونێكو ئیرادەیەکی جیاوازی روانین، هەموو ئەو فەنتازیانەش دەکوژێت کە خەون بە کرانەوەو جیاوازیو دەرچون لەو حیکایاتانەوە دەبینێت.

ئەو فەرهەنگە هێندە داخراوە کە لەبازنەیەکی داخراو و کارەساتبارو وێراندا دەخولێتەوە. ئەم فەرهەنگە بەرهەمهێنەری دۆگماییو دروستکردنی کۆمەلگەیەکی گوێڕایەلە.

هاوکـــات لـــەڕووی سایکۆلۆژیـــشەوە، قوتابخانـــە لـــەم جـــۆرە کۆمەڵگانەدا داڕێژەری ئەو شێوازە دەســەڵاتگەراو ســەرکوتکارەیە کــە کار لەسەر وێرانکردنی دەروون‌و خولیاو چالاکییەکانی مرۆڤ دەکات.

# جەستە و کۆمەڵگە

خەفەکردنی ئارەزووە شاراوەکانی تەواوی کۆمەڵگەو تاکەکەس دیاردەیەکی نادیاریکراوو شاردنەوەی روانین‌و دنیابینی مرۆڤەکانە لەحەشارگەیەکی فەرهەنگی‌و ئەخلاقی‌و کۆمەڵایەتی‌دا، بێئەندازە هەڵقوڵاوی خەفەکردنی جیاوازیی‌و خەون‌و ویست‌و داواکارییە مرویی‌و شارستانی‌و فەرهەنگییەکانە، هاوکات ئەوەی دەکەوێتە ئەو واقیعەوە بێئەندازە قەوارەکەی گەوەرترە لەقوڵایی ئەو خەیاڵدانە کە رووبەرەکانی روانینی سەدان ئەوەندەی ئەو دەرکەوتانەیە کە ساتبەسات پڕدەبن لەحیکایەت‌و سەرگوزشتەی بێ سەرچاوەو ئاڵگۆڕپێکراوی سەپاندنی یاساگەلێکی ستەمکارانەی بێ قسە بەسەر مرۆڤەکاندا.

یەکێك لەشتە کاریگەرەکانی کە تا ئەم سەروەختە بەکراوەیی‌و سەربەخۆ دەمێنێتەوە ئەو خەیاڵدانەیە کە دەبێتە بەرهەمهێنەری رەمزو بەهای جیاوازو جیاکەرەوە لەهەر فەرهەنگ‌و ئایدیایەکی دیاریکراو. هەڵبەت ئەو کلێشەسازییە کۆمەڵایەتی‌و کولتورییەی حیکایەتە شاراوەکانی ناو خودی کۆمەڵگە لەلایەك دەرەنجامی هەموو ئەو چەپاندن‌و پەراوێزخستنە کۆنترۆڵی ئەخلاقی‌و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیەکە بۆ دیاریکردنی سنورەکانی ژیان‌و ئارەزووەکان‌و جڵەوکردنی تاکەکەس لەیەکەیەکی دیاریکراوی

فەرهـەنگی و سـایکۆلۆژیدا، ئـەم راڤەکارییـە سـەرەتاییە چـەند پەیوەستە بە زانستی دەرونشیکارییەوە، هێنـدەش پەیوەندیـدارە بـە ئەنترۆپۆلۆژیاو کولتورناسییەوە.

بۆئەوەی کەمێك دەرچین لەشتە گشتییەکان، پێویـستە بـچینە نێـو ئەو قولاییە گەورەیەوە کە پانتاییەکی بـەرفراوانی ئـارەزوو خەیاڵە شـاراوەکانی تاکەکـەس و بەشـێکی مـردووی ئـەو رووە زینـدوەی کۆمەلگەیـە کـە نابینرێـت و هاوکـات پێکهاتەیـەکی گـەورەی ئـەو سەرزەمینە خەفەکراوەیە کـە لەفەرامۆشـبونێکی کۆنزێرڤاتیڤانـەوە سەرچاوە دەگرێت و کەنارکەوتویەکی زیندوی کۆمەلگەیە.

سەرەتا باس لەدیاردەیەك دەکەین کـە ئەورۆکـە لـەدنیای مۆدێرنـدا بەرەو کاڵبوونەوە دەڕوات(بەلام بە وێنایەکی دیکەوە لەڕێی کۆمەڵە هێماو ئاماژەگەلێکی ئەفسانەییەوە بەرجەستە دەکرێتەوە)و هاوکات لـەنێو کۆمەلگـە نەریتییەکانیـشدا کـە ڤاکـسینە بـە مۆدێرنـە ئـەو رەمزو بەها سـادانە کـەمتر بۆتـەوە بـەلام یادەوەرییـەکی جەستەیی لەپـشتیەوە ئامادەیـە، ئـەویش دیـاردەی خـاڵکوتین و کـوتینی نـاو و سـکالاو نیـازو خـەون کـوتین و رەمـزو پیـت کـوتین لەسـەر دەسـت و قۆڵ و شوێنە دیارەکانی جەستە.

جەستە لەدەرەوەی هەر راڤەکاری و شیکارییەکی بایلۆژی و فیزیکی و ئاناتۆمی پانتاییەکی رووبەر کراوەیە بۆ وەرگرتن و پەخشکردنەوەو ئاڕاسـتەکردنی ویـست و داواو چـێژو تامـەزرۆیی و دروسـتکردنی پەیوەندی و کۆنتاکت و گۆڕینەوەی گفتوگۆو قسەکردن و وێنـاکردنی بەخشش و روانین لـەڕێی جەستـەوە. یـان بـە مێـژووکردنی جەسـتە

لــــەڕووی فەرهـــەنگیو کۆمەلاّیـــەتیو ئـــاینیو فەلـــسەفیەوە دیاردەگـــەلێکی نـــوێ نیـــە، بەلّکـــە خەیالگەیـــەکی گـــەورەوگرانی لەپشتەوەیە.

هاوکـات بۆئـەوەی بـاس لەجەسـتە بکـەین ناکرێـت نەگەڕێینـەوە سـەر پیرۆزیو ناپاکی جەسـتە لـەڕووی ئـاینیو کۆمەلاّیـەتیو فەرهەنگییـەوە، سەرچاوەکانی ئەم گەڕانەوەیشمان هەر چوار ئاینە جیهانییەکەیە، کە بـە ئەندازەیەکی گەورە کاریگەریان هەیە لەسەر بەشـە جیاجیاکانی جیهـان، ئاینی یەهودیو مەسیحیو ئیسلامو بـودی، بـەپێی تێـڕوانینو دنیـابینی هەریـەك لـەم ئاینانـە کـە لـەڕێی دەقو پێکهاتـە هـەرە بنـچینەییەکانی بـاوەڕو جیاکردنـەوەی خێـڕو شـەڕەوە، یـان چـاکەو خراپـەوە/ پـیرۆزو ناپیرۆزەوە/ پیرۆزو قێزەونـەوە، کـار لەسـەر دابەشـکردنی دنیـا دەکـەنو هاوکات ئەم دابەشکردنە قوڵ دەبێتەوە بۆ دابەشکردنی رەفتارو روانـینو دنیابینییەکان، دواتر ئەم جیاکارییە ریشەییە دەگاتـە قۆنـاغێکی دیکـەی دابەشــکردنێکی کاریگـەرتر لەســەر ئاسـتی دنیـابینیو هـزرو خـەونو خەیالگە، بەواتایەك ئەوەی دنیابینییـەکان لەیەکدی جیادەکاتـەوە تـەنها هەڵـسوکەوتو پەیوەنـدیو لێپرسـینەوە نیـە، بەلّکـە دابەشـبوونێکی ریــشەییە لەســەر ئاســتی قولاّییــەکانی بیرکردنـــەوەو خەیاڵـدان، ئـەم قولاّییـەش کـە لـەڕووی دەروونییـەوە دابـەش دەبێـت بەسـەر ویـستو غەریزەو خواردنو سێکسو باوەڕو بێ باوەڕیو..تاد.

دۆرکهایم پێیوایە: خەسڵەتێکی هـەرە جیاکـەرەوەی ئـاین بریتیـە لەدابەشـــکردنی جیهـــان بەســـەر دوو مەملەکەتـــدا کـــە نـــاکۆکن لەگەوهەردا، یەکەمیان پێکهاتووە لەسـەرجەم ئەوانـەی کـە پـیرۆزنو

ئەوی دیکەش پێکهاتووە لەسەرجەم ئەوانەی کە ناپیرۆزن "ناپاك یان قێزەون")[37]

تـــەواوی دنیـــای شـــتە پیرۆزەکـــان وەك بـــەهاو نـــرخو پـــیرۆزی لەسروشتو سەروسروشتدا، بەرامبەر بەدنیای ناپیرۆزی لەناپاکیو بەهای نزمو نائاینیدا خولقێنەری پۆلینکردنو دروستکردنی سەرجەم ئەو پەیوەندییە پەنهانەی نێو خودی مرۆڤن بەشتەکانو کایەو ناوەندو ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. یەکێك لەو پەیوەندییە ترادسیۆنانەی کە نائاگایی مرۆڤ گرێدەدات بەئاگایی کۆمەڵایەتییەوە لەڕێی ئاینەوە دروستدەبێتو کامڵ دەبێتو دواجار گەشەدەکات بۆ توانایەکی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی بۆ دابەشکردنو پۆلینکردنی چاکەو خراپە، پیرۆزیو ناپیرۆزی، ئاسایيو نائاسایی، هاوکات ئەوەش بۆخۆی خولقاندنی پێوەرێکی کۆمەڵایەتیو ئاینیو کولتورییە کە ژینالۆژیای مۆراڵ دەکاتە ئەو ڕەچەڵەکانە بدۆزێتەوە کە ئەو سەرمداوە مەعریفیانە پێکەوە دەبەستێتەوە. جیابوونەوەی ئەو دوو مەملەکەتە، جیابونەوەی ئاگاییەکانی مرۆڤە لەدیاریکردنو هەڵبژاردندا کە دارشتەیەکە لەنێوان بێئیرادەییو ناهەڵبژاردندا. هەروەها تەواوی ئەو جیابونەوانەش لەخۆدەگرێ کە نائاگاییەکانی مرۆڤ لەشارستانییەتەکاندا کایە فەرهەنگیو وێناکارییەکانی خودی خۆیانی تیادا بەرهەمدێنن. لەڕووی فەرهەنگییەوە ئاین Religion سیستمێکی کۆمەڵایەتییە، وەستاوە لەسەر پەیوەندی مرۆڤ بەبوونو سروشت یان بوونەوەرەکانەوە،

---

37 Emil Durkhiem, Elementary form of Religious life – study of Religious sociology. trans .Joseph ward swain . new York .free press 1965 –21-33.

یان پەیوەندی بە هێزەکانی سەروسروشتەوە Supernatural force، یان خوداوە، یا پەروەردگارەوە کە باوەڕی پێیەتیو دەیپەرستێ، لەڕێی ئەو نێوەندانەوە کە لەو باوەڕەدایە ئەوانە نوێنەرایەتی دەکەن یان نوێنەرایەتیان دەکات. هاوکات ئاین لەسیستمێکی هەڵسوکەوتئامێزو یاساورێسای ئەخلاقیدا بەرجەستەدەبێت، وەك چۆن پەیوەندی نێوان پەرستارو پەرستراو شێوەیەك لە سیستمی کۆمەڵایەتی social system بڕیاردراو وەردەگرێت، دواجار شێوازێکی جێگیریشی هەیە. لەبەرئەوەی کۆمەڵگا هەست بەبوونی هێزو دەسەڵاتی ئاینەکەی دەکات، هەڵسوکەوتێکی نمونەییە. گرنگترین خەسڵەتەکانی ئاین: باوەڕو وەرگرتنی هەڵوێستی سۆزئامێزە بەرامبەر پەرستراوو هەڵسوکەوتێکی دیاریکراو بۆ نزیکبوونەوە لێی، بەجێگەیاندنی ئاهەنگو سروت Rites & Ritual.[38]

گەلاڵەکردنی پەیوەندییەکانی خودی ئاین لەنێو خۆیدا وەك کولتوری ئاینی لەڕێی باوەڕو وێناکردنەکانەوە، وەك ڕێکخەرێکی ئاگایی مرۆڤایەتییە بۆ تێگەیشتن لەدەرەوەی پانتایی خودو ژیانو جەستەوە. لێرەدا ئەگەر ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەی کە ئاینە مەبەستمان جەستەیەکی تەواو ئەندامی بێت، ئەوا جەستەیەکی زیندووە بە بەلگەی ئەوەی ئەو جەستەیە: بیروباوەڕ، وێناکردن، بیرکردنەوە، ترادسیۆن، پەرستن، پیرۆزی، ناپیرۆزی، پاکبوونەوە، سروتو بەجێهێنانی ئەرکی ئاینیو زیاریو کارلێکردنی لەتەك خودی خۆیو هەرێمەکانی دیکەی جەستەو بەشە نزیكو دوورەکانی باوەڕو

---

[38] -قاموس الانثروبولوجیا –تالیف: د. شاکر مصطفى سلیم –1981–ص 813

وێناندنو ژیاری، کەواتە جەستەیەکی پەیوەندیدارە بەدەرەوەی خۆیەوە کە ئاستە پێوانەییەکەی تەنها ئەو مێژووە دووردرێژە نیە کە مرۆڤ دەبەستێتەوە بە حیکایەتەکانییەوە، بەڵکە پێکهاتووە لەو مەودا زەمەنییە گشتگیرییەی دنیابینییەك لەئاستە جیاجیاکانی ژیاریدا، ئەم پێکهاتەیەی دوایی فەرهەنگو کولتورو بیرکردنەوەو شارستانییەتو دیاردە کۆمەڵایەتیو ژیانییەکانو خەیاڵو سەرجەم ئاگاییو نائاگاییەکانی خودی مرۆڤو مرۆڤایەتی دەگەیەنێ لەجوگرافیایەکی دیاریکراودا، بەڵام بە ڕەنگێکی دیکەو شێوازو خەسڵەتێکی دیکەوە. لێرەدا ژیاری دەبێتە جەستەیەکی مەزنی کۆمەڵایەتی پەرشوبڵاو و یەکانگیر، کارلێکارو کارتێکار، وەرگرو پەخشکەر، بەخششو بەخشندە، پانتاییو ناپانتایی، ناوەندو کەنار...تاد. بێگومان ئەم جەستەیە، جەستەیەکی تەواو زیندووە، لەبەرئەوەی کارلێکردنو پەیوەندیو بەرزبونەوەو دابەزینو جیاکردنەوەو پۆلینکردن تیایدا لەبزاوتدایە، ئەندامەکانی ئەم جەستەیە بریتیین لە : فەرهەنگ، ترادسیۆن، سیاسەت، کولتور، میرات، نەریت، ڕەچەڵەك، زمان، پاشماوە دێرینەکان، بەها روحیو کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا، بیرکردنەوەو خوونەریتو نائاگایی کۆمەڵایەتی، نەتەوەو بیری نەتەوایەتیو ململانێو ناکۆکییە نەتەوەییو نەژادییەکان، مێژوو، فەلسەفە، بیروباوەڕە دێرینەکان...تاد. هاوکات ئەم جەستەیە لەڕێی ئاگاییو نائاگاییە ژیارییەکەی خۆیەوە دەبێتە هەڵگرو وەرگری سەرجەم ئەو پەیوەندییانەی دەرەوەی خۆی کە ئاڕاستەی دەکرێ، لەوێشدا، واتا

لەخاڵی بەیەکگەیشتنی پێکهاتەکانی دەرەوەی خۆی و جەستەی مەزنی بێکۆتایی خۆی، جومگەیەکی کارلێکردن دروستدەبێت، کە بۆخۆی خولقاندنی قۆناغێکە لەقۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ژیاری و بەرجەستەکردنی ئایندەی ئەو قۆناغەش کەوتۆتە سەر وەرگرتن و ئاستی هێزی برینی ئاگایی ئەو پێکهاتەیەی کە لەناوەوەو دەرەوەی ژیاریدا ئامادەگی هەیە."هەموو پێکهاتەیەك پێکهاتووە لە: مەعریفەو بیروباوەڕ، هەروەها هونەرو ئەخلاق، یاساو نەریت، بێجگە لەمانە ئەو توانست و خوونەریتانەش لەخۆدەگرێ کە مرۆڤ بەهۆی ئەوەوەی کە ئەندامێکی کۆمەڵە وەریگرتووە."[39] ئاشکرایە هیچ دیاردەو پێکهاتەیەك نییە لەدنیادا کۆمەڵێ بیروباوەڕی تەباو ناکۆکی لەخۆنەگرتبێ، سەرەڕای بیرکردنەوەو ڕوانین و وێناکردن و دروستکردنی چیرۆك بۆ خودی ژیان و ململانێکانی، بۆ گۆڕانکاری و بەسەرهاتەکانی، بۆ دیاردەو ڕووداوەکانی. لێرەوە گەلاڵەکردنی ڕوانین و وێناکان جومگەی پێکەوە گرێدانی قۆناغەکانی دروستبونی پێکهاتەو بونیادە ئاینی و سیاسیەکانە. هەروەها هیچ پێکهاتەیەکیش نیە لەدنیادا یاساو نەریت و جوڵەی خۆی نەبێ. لە مێژەوە پێکهاتە دێرینەکانی بیروباوەڕ ئامۆژەیەك بون، یان پاڵپێوەنەرێك بون بۆ گەشەکردنی شارستانی و ژیاری و ئاین، بەهەمان شێوە سیاسەت و پەیوەندییە نێو دەوڵەتیی و شارستانی و مللانێ فەرهەنگییەکان، کە ئەوڕۆکە فەرهەنگێکن لەو فەرهەنگە تەبایانەی لەنێو خودی خۆیاندا چەندین ناکۆکی و هەمەچەشنیان هەڵگرتووەو نائاگایی و ئاگایی و

39 E. Taylor .primitive culture Lon.: Johan Marray 1871.

پەیوەندیو بیرکردنەوەکانی مرۆڤیان سەرتاسەری کردۆتەوەو هاوشێوەبوونێکی تەواو تەبایان خولقاندووە بۆ مرۆڤو مرۆڤایەتیو پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو شارستانی. لەمێژەوە ئاین ئەو ڕۆڵە دەبینێ، خەیاڵپێکراوەکانی ئاین دەرەنجامی ڕوانینو بەرجەستەکردنی زەینی شتەکانە لەبیری مرۆڤایەتیدا. هەڵبەت بۆ وێناکردنو خەیاڵ بۆ دروستکردنی شتە پیرۆزەکان یان دنیای پیرۆز بەشوێنو ساتەوەختەکانیەوە گەردونگەرایی ئەو خەیاڵە دەکەن کە پێکهاتەی بیرۆکەیەکی ژیارین بۆ چەسپاندنو ڕێسابۆدانانی لەپانتاییەکی ژیانی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیدا، واتا داگرتنو دابەزاندنی لەهەرێمەکانی سەروسروشتەوە بۆ هەرێمەکانی سروشتو ناونانو وێناکردنی دیاردەو قۆناغە وەرچەرخاوە مێژوویەکەی ئاین وەك بەسەرهاتو گێڕانەوەو حیکایەت.

پیرۆزی شێوازێکە لەشێوازەکانی پەیوەندی بەبنەڕەتەوە کە تیایدا نەوە خەیاڵییەکان جێی خودی مرۆڤە حەقیقییەکان دەگرنەوە، بەواتایەکی دی، پیرۆزی شێوازێکە لەشێوازەکانی پەیوەندی مرۆڤ بەبنەڕەتی شتەکانەوە کە مرۆڤ تیایدا غەیب دەبێو لەجێیاندا نەوەکانی خودی خۆیان، واتە پیاوە خەیاڵییەکانی نێو خودی خۆیان دەردەکەون)[40]. لێرەدا ئەو دونیا پیرۆزەی ڕوانینو وێناکردنەکانی مرۆڤ خولقاندویانەو لە دێرزەمانەوە وێنەی جۆراوجۆرو ڕوانینی تەباو ناکۆكو پڕ بایەخو بێبایەخی دروستکردووە بۆ دیاردەو ژیانو پێکهاتەو

---

[40] موریس گودولیه –لغز الهبه –المقدس–سنه 1998ل213.

ژیـانی کۆمەلأیـەتی. ئـاین لـەرێی دنیـای پـیرۆزەوە بەمێـژوو و سەرگوزشـتەو پاڵەوانییەکانیەوە،بەفـەرمودەو خەونـەکانی مرۆڤـەوە لەزەمەنـە جیاوازەکانـدا دەگەرێتەوە،بەمانایـەکی دیکـە تارماییـەکانی ئـاین لەهـەموو زەمەنێکـدا ئامادەییـان هەیـەو شـەر بـۆ ئێـستایەکی پـر یـادەوەری و نادیـاری خۆیـان دەکـەن، هاوکـات لەهـەوڵی دەسـتەبەرکردنی زۆرتـرین پانتـایی گێرانـەوەدان بـۆ دروسـتکردنی گرێـچنەیەکی ژیـاری کـە بتـوانێ ئێـستا گرێبـدات بـەرابردووەو رابـردووش داوەت بکـات بـۆ سـەر خـوانی ئێـستاو لەئایندەیـەکی نادیاریـشدا روانینێکـی تـەباو هاوسـۆزو هـاوبیر دروسـتبکات لەتـەك فەرهـەنگ و ژیـاری و گۆرانکـاری و پێـشکەوتن و ترادسـیۆن و بیروبـاوەرە هاوتەریبـەکانی نـەوەکانی پێـشوو. دیـارە ئەمـەش لـەرێی فـەزلی شـتە پیرۆزەکانـەوە دەبێـت بەسـەر شـتە ناپیرۆزەکانداـئـەوەشمان لەبیرنەچـێت؛ ( کۆمەلگـە هەڵئەسـتێ بـە پـەروەردەکردنی ئەندامـەکانی لەسـەرئەوەی چـی لەتوانادایـە پرسـیاری لێبکرێ،بپـشکنرێ،ئەزموونبکرێ،هاوکات چـی پێویـستە بـەبێ هەڵبـژاردن... دیاریکردن،بمێنێتـەوە.)[41] دیـارە سەرچـاوەی دیـاریکردن و شـوناس بـۆ دانـانی پـیرۆزو نـاپیرۆز

---

[41] نقریـه الیقافـه –تـالیف: Michael Thompson-Richard Ellis-Auron Wildavasky Oxford UN 1990
ترجمه:د.علی سعید الصاوی (لەم باسەدا ئاماژەدراوە بە مـاری دۆگـلاس بـە تایبـەتی ئەو تویژیانەی کـە تایبەتـە بـە جیاکـردنـەوەو پـۆلێنکـردنی دنیـای شـتە پیرۆزەکـان و پۆلێنکـردن و وێنـاکـردنی مـرۆڤ بەسـەر دنیـای دابـراو لـەپیرۆزی و دنیـای تـەبا لەتـەك پیرۆزی)

لەکۆتایــدا دەگەڕێتــەوە بــۆ مــرۆڤو حــوکمی وێناکردنــەکانی مــرۆڤو ئەندێــشەو خەیاڵــە ژیــاریو ئایینییــەکانی مــرۆڤ. وەك لەپێــشدا باسمــان لــەوەکرد کــە ئــاین وەك جەســتەیەکی کاریگــەرو کارتێکــەر کــارلێکراو دەبــێ بــە ژیــانی کۆمەڵایــەتیو فەرهــەنگیو جەســتەی هــەلگرو وەرگــری ژیــاری. ســەرەنجام ئــاین وەك کۆمــەڵبوونێکی جــەماوەری مرۆڤــەکان بــۆ بــەجێهێنانی کــارو ئــەرکی کۆمەڵایــەتیو ئــاینیو سیاســیو ئــابوریو ئەفــسانەیی هەڵئەستێت بـە سازکردنی یاساو بیرو حوکمی ئەزموونی خۆی، ئەمــەش لــەخۆرا دروســت نابێــت، وەك هەنــدێك لەکۆمــەڵناسو مرۆڤنــاسو ئایناســەکانی ســەدەی نــۆزدە جــەختیان لەســەر دەکــردەوە. ئــەزمونی حــوکمی ئــاینی لەتوانایدایــە مــرۆڤ دابــەش بکــات بەســەر دوو پانتــایی نــاکۆكو دوو خەیالگــەی ناتــەبادا؛ پانتــایی یەکــەم ئەندێــشەی ئــەو مرۆڤــە واقعییــە کــە ژیــانی کۆمەڵایــەتیو فەرهەنگیــەکانی خــودی خــۆیو کۆمەڵگەکــەی بەســەردەبات،واتا مرۆڤــی ڕۆژانــە. پانتــایی دووەم، ئەندێــشەی ئــەو مرۆڤــە خەیاڵییەیــە کــە ڕوانــینو بۆچــونو بیروباوەڕەکــانی وێنــادەبیو دەبێتــە بونــەوەرێکی ئەفــسانەیی کــە تیایــدا پــیرۆزی وەك بەهایــەکی گــەردونی بــاڵای سەروسروشــت جیادەبێتــەوە لەســادەییو نــاپیرۆزی ڕاســتی شــتەکانو بیروبــاوەڕو ڕوانینــەکان. دوو خەیالگــەی ناتەباش،لەخەیالگــەی یەکەمــدا وێنــەی سروشــتو ڕوانــینو تــاوتوێکردنی دنیــاو ئــەو دنیــاو ئــەوانی دیو وێنــاکردنی خــوداو فــەرمودەکانی دەبــن بــەهێزێکی خــەیالی بــۆ بزوانــدنی

بیری ئەفسانەیی لەنائاگایی هزری خودو كۆمەڵدا. خەیاڵگەی دوەمیش بەسەرجەم وێناكانی خۆیەوە وەك بونەوەرێكی كارتێكراو بەژیانو حەقیقەت گرفتاری پرسیارو گومانەكانی خۆی دەبیٚو بەناچاری وەك ناتەبایەكی خەیاڵی لەنێو خودی خەیاڵگە تاریكەكەی خۆیدا بمێنێتەوە؛ بەڵام ئەم بونەوەرە نامریٚو هەمیشە گرفتاری نارەزاییو وێناكراوەكانی خۆی دەبیٚو گومانەكانی ناگاتە ئەو سنورەی كە حەقیقەتە ڕەهاكانی پیٚ ڕاڤەبكاتو لەو سونەتە داخراوەی روانین دەرچێت. دواجار لەكانگا شاراوەو نادیارەكەی خۆیدا بەسەرسامی دەمێنێتەوەو تێكەڵ بە تارماییەكانی ئاین دەبیٚو دەكەوێتە ژێر كاریگەری بیروباوەڕی نەوەكانی پێشووەوە.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە جیاكردنەوەوی مانا جیاوازەكانی چەمكەكانە كە هەر چەمكەو بۆخۆی بەسەر چەند دابەشبوونێكدا دابەشدەبێت، بۆنمونە چەمكێكی سادەی وەك چەمكی ئارەزوو چۆن دابەشدەبێت بەسەر مانای چاكەو خێرو خۆشیدا، بەهەمانشێوە دابەشدەبێت بەسەر كۆمەڵێك مانای خراپو ناشەرعیو ناچیزو ناپاكو بیٚ باوەڕیدا، واتە كۆمەڵێك ئارەزوو هەیە لەروانینو باوەڕی ئاینی ئیسلامدا ئارەزوگەلێكی ناپاكو خراپن، وەك ئارەزووی سێكسی، خەیاڵو ختورەی ناشەرعی وەك راموسانو رۆمانسییەتو هەر هەستێكی دیاریكراوی رۆمانسی نێوان دوو مرۆڤ، زۆر كات كار دەگاتە ئەوەی یەكێك لەو ئاینانە تەواوی خەیاڵو ئەو فەنتازیانەش دەداتە بەر رەخنەو پۆلێنكردنی بە ناپاكی كە هەڵگری كۆمەڵێك ئارەزووی

ئاشقانەو سێکسیانەیە، یان جیاوازن لەهەر روانینێکی نەریتی ئاینی، هەروەها ئارەزووی خواردنو خواردنەوە، ئەو خواردنانەی لەبیروباوەڕی باوەڕپێکراوێکی ئاینیدا حەرامن وەك خواردنی گۆشتی بەرازو ئاژەڵو باڵندە گۆشتخۆرەکانو خواردنەوەی مەیو شەراب...تاد، ئەم دابەشکردنە دابەشکردنێکی سادەوساکار نیە، بەڵکە بە ئەندازەیەکی قوڵ ئەو دابەشکردنەی دنیا دەکات بە دوو بەشی نایەکسان کە دنیای حەرامو حەلاڵە، دابەشکردنێکە لەسەر ئاستی روانینو دنیابینیو چێژو پۆلێنکاری، هەموو جیاوازییەك لەم سیستمی حەرامو حەلاڵەدا جیاوازییە لەباوەڕو ترادسیۆنو پیرۆزیدا.

سەرجەم ئەو دیاردانەی کە دەکەونە دەرەوەی دەرکەوتە رەواکانی ئەو رووبەرە پیرۆزەی ئاین کەنارگیر دەکرێو بچوکدەکرێتەوە بۆ شاراوەیەکی ناشەرعی، هاوکات خودی ئەو تاکەکەسە ناپاکانەی کە دەکەونە دەرەوەی نەریتو ترادسیۆنی هەڵسوکەوتو ئیرادەو ئارەزووە گشتییەکانەوە، هەرچەندە جەستە بەتەنها تاکەیەك پێکهاتەی دیاریکراوی ئەو ستراکچەرە داڕێژراوە نیە، بەڵکە کۆکەرەوەی تەواوی پێکهاتەو خەیالگەو روانینو ئارەزووەکانە لەیەکەیەکی نادیاریکراوی شاراوەو نادیاردا، هاوکات رووبەرێکی بەرفراوانی چاکەو خراپەو قولاییەکی پڕ لەماناو ئاماژەو مەرجو چێژو ویستو پەیوەندیە بە کایەیەکی بەرفراوانی ژیارییەوە کە لەیەککاتدا پەیوەستە بە فەرهەنگو پەیوەندیداریشە بە قولاییەکانی هەردوو چەمکی حەرامو حەلاڵەوە.

حەرامکردنی هەر پارچەیەك لەجەستەو حەلاڵکردنی پارچەیەکی دیکە، یان حەرامکردنی فرمانێکی دیاریکراو و ڕێپێدانی یەکێکی دیکە، دەگەڕێتەوە بۆ ڕوانینو باوەڕو دنیابینی کولتوری‌و مۆراڵی ئاینی‌و کۆمەڵایەتی، زۆر بەسادەیی کاتێك دەرکەوتنی ئەندامی زاوزێی نێرو مێ بۆخۆی حەرامکراوێکی شاراوەیە، بەڵام لەپاڵ ئەم حەرامخوازییەدا ڕەوایەتییەکی حەلاڵکراویش هەیە لەسەروەختێکی شەرعیدا (واتە لەکاتی هاوسەرگیریدا)، ئەم جیاکارییە لەسەرەتاوە دەگەڕێتەوە بۆ دیاردەی تەماشاکردن، بە واتایەك هەموو تەماشاکردنێکی دیار بۆ پارچەیەك لەجەستە کە حەرامەو جێی وروژاندنی ئارەزووە سێکسییەکانو حەرامکراوەکانە، بەهەمانشێوە وروژێنەری خەیاڵە شاراوەکانو نادیارەکانی ئەو سەرزەمینە شاراوانەی نێو ڕوانینی هەر یەکێکە لەئێمە، هەڵبەت هەردوو چەمکی تەماشاو شاراوە پێکەوە لەبەرجەستەکراوێکی بینراودا پەیوەندییەکی قوڵیان هەیە بە نادیارێکی گەورەوە کە کلێشەیەکی جیاکەرەوەیە لەنێوان حەرامو حەلاڵدا.

ئەو تەماشاکردنە دەبێتە چەقی بەیەکەوە بەستنەوەی هەر ڕوانینێك کە کاریان دانانو داڕشتنی مانایە بۆ هەر بینراوێك، بێگومان نابێت ئەوە لەیادبکەین کە سەرەتای هەموو باوەڕو ئاینێك دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی گەورەو سەرەتایی کە بریتییە لەتەماشاکردنی دنیا بەهەموو پێکهاتە دیارەکانییەوە، هاوکات تەماشاکردنێکی غەیبانیش لەئارادایە کە ڕوانینێكو دنیابینییەکی ناوکۆییە بۆ ڕاڤەکردنو بەرجەستەکردنی باوەڕ، واتە بینینو

سەرنجدان و تێڕوانین و رامان و رامکردنی هەر بینراوێك لەدەرەوەی سەرزەمینە سروشتییەکەی، واتە رووتکردنەوەو داماڵینی ماناو شیکردنەوەو راڤەکاری و وێناکردنی تاکەیەك مانای واتادارو پەیوەندیدار بەهەموو ماناکانی دیکەوە، کاتێك مرۆڤ دەڕوانێتە سروشت، ئەوا ئەوی ئامادەیە تەنها لەسەرەتادا تەماشاکەرێکی دیاریکراوە بۆ هەموو ئەو شتە شاراوانەیە کە ناکەونە چوارچێوەی بینین و روانینە کلێشەییەکانی ئەوی مرۆڤەوە، بەلاّم خۆیبۆخۆی داماڵراوێکی ناپەیوەندو ناپەیوەست نیە بەسەرلەبەری ئەو رووبەرە ژیارییەوە کە پێکهاتەیەکی بەرفراوانی ژیان و بیرکردنەوەو تەماشاکردن و چێژوەرگرتنە.

بەڵکە مرۆڤ بەدەرلەوە بوونەوەرێکی کۆمەلاّیەتییە، بوونەرێکی کولتوری و ژیاری و ئابوری و سیاسی و ئاینیشە، لەدنیای مۆدێرنیشدا بەدەرلەوەی مرۆڤ داتایەکی داماڵراوە، بەلاّم داتایەکی پەیوەندارو تێکەڵە بە ماناو چەمکەکانی دیکەو تەماشاکەرێکی بینراوە بەپێچەوانەی مرۆڤی سەرەتاییەوە کە تەنها تەماشاکەرێکی گەورەو سەرسامێکی راماون لەبەردەم دیاردەو گۆڕانکارییەکاندا، هاوکات تێکەڵەیەکن لەسروشت و بیروباوەڕی ترادسیۆنی.

مرۆڤی مۆدێرن کە داغڵی سیستامێکی گەورەی زانیاریی بووە لەیەکاتدا پەیوەستە بە کۆی ئەو ئاستە ژیارییە پێشکەوتووەوە، پەیوەستیشە بە ناوەندگەلێکی جەستەیی تاکەکەسیانەو کۆی بەشە زیندووەکانی کۆمەڵگەو فەرهەنگی بالاّی تەماشاکردنی دنیا لەدنیابینیەکی جیاوازەوە بۆ روانینێکی بەشدار لەئاستی هۆشیاری و

زانستو یەکە داتاییەکانی راڤاکاریو ئەو هاوکێشەسازییەی دنیای مۆدێرن.

ئەوە تەماشاکردنو سەرنجە سەرەتاییەکانی مرۆڤە لەسەرەتای بوونەوە تائەوڕۆکە کۆمەڵێك وێناکراوی باوەڕپێکراوی فەرهەنگیو ئاینیو کۆمەڵایەتییە کە تا ئەم سەروەختە بۆ ئەفسانەو حیکایەتو ئاینو فەرهەنگی میللی دروستیکردووە، ئەوە مرۆڤە لەڕێی تەماشاکردنی دیاردەکانەوە وێناکراوێك لەلای خۆی بۆخۆیو کۆمەڵگەکەی دروستدەکات، ئەوە تەنها ترس نیە لەهەورە گرمەو بروسکەو رەهێڵەو باوبارانو تۆفانو بوومەلەرزە کە باوەڕی سەیروسەمەرەو راڤەکاری نالۆژیکیو ئەفسانەییو ئاینی دروستدەکات، بەڵکە ئەوە وێناکراوەکانی ساتەوەختی دامالڕاوی دیاردەو رووداوەکانو چرکەساتە نادیاریکراوەکانە کە ماشێنێکی گەورەی تێکەڵکردنی خەیاڵو فەنتازیاکانە، سەرزەمینێکی بەرفراوانی وەهمو سەرسامییەکانە، رووبەرێکی نادیاریکراوی خەونو واقعو میتافیزیکایە، دەرەنجامی پاش دیاردەکانو بەردەوامبونەکانە کە وێناکردنو خەیالگەو باوەڕەکان گەلاڵەدەکاتو لەسیستامێکی مەعریفی سەرەتاییدا بەرجەستەیان دەکاتەوەو لەکلێشەیەکی پەیوەندیامێزدا روانینو دنیابینیو خەیالگەیان بۆ دروستدەکات.

بەهەمان کلێشەی بونیادی بونو کەرەستەو دیاردەو بەرجەستەکراوێکی بینراو خودی مرۆڤەکان بەشدارن لەبەخشینی مانادا، هاوکات سەرجەم روانینە دیاریکراوەکانیش لەسەرەتاوە بە

تەماشاکردنو سەرنجدانو بیرکردنەوەو بەردەوامبون گەلاڵەدەبنو دەبنبە خەیاڵدانێکی گەورە بۆ دەرخستنو شاردنەوەی هەرشتێك کە خوازیاریو ئارەزوو و چێژ لەبەرجەستەکراوێکی فەرهەنگی یان ئاینی یان کۆمەلایەتیدا دەریاندەخات یان دەیانشارێتەوە.

لێرەوە دەگەڕێینەوە سەر ئەو پانتاییە رەمزییەو ئەو رووبەرە کۆکەرەوەیەی کە ماناکانی جەستە لەخۆیدا بەرجەستە دەکات، جەستە بەدەرلەوەی مێژوویەکی دوورودرێژو پاشخانێکی گەورەی مەعریفیو ئەنترۆپۆلۆژیو سایکۆلۆژی سەرەتایی روانینی مرۆڤی لەپشتەوە ئامادەیە، هاوکات جەستە لە ئاینو بیروباوەڕەکاندا دەبێتە بەرجەستەکراوێکی دیار بۆ سزادانو کۆنترۆڵکردنو چاودێرکردنو سەرنجدان کە لەخۆڕا نیەو تەنها رێکەوتێکی نالۆژیکی نیەو تاکەیەك واتاش لەخۆ ناگرێت، بەڵکە جەستە دەبێتە هەڵگری زۆرێك لەو خەیاڵو فەنتازیاو رەمزو بەهاو بیروباوەڕانەی کە دنیاو ژیان دابەشدەکەن بەسەر خێرو شەڕدا، بەسەر چاکەو خراپەدا، بەسەر حەرامو حەلاڵدا. بۆئەوەی زیاتر بچینە نێو قولایی ئەو ماناو مەدلولانەی کە جەستە دەیبەخشێتو هەر خۆدی جەستە هەلگرو وێناکراو و خەیاڵپێکراوێتی.

پێویستە کەمێك ئاوڕ لەمێژووی سزادان بدەینەوە، فۆکۆ لە کتێبەکەیدا بە نێوی(چاودێریو سزا) ئەو مێژووە مەعریفییەمان بۆ پۆلێندەکات کە قوناغ بە قۆناغ مەعریفەی سزادان تیایدا گەشەدەکاتو قوڵتر دەبێتەوە لەڕووی سایکۆلۆژیو تێگەیشتن لەجەستەو زانینی پنتە شاراوەکانی.

مێـژووی سـزادانی جەسـتە کـە لەلێدانـەوە دەسـتپێدەکات بـۆ داخکـردنو سـوتاندنو بـڕینو شـێواندنی جەسـتەو(بەتایبـەتی دەموچاو)، ئەتککردنو سزادانی ئەندامەکانی جەستە بە جیا: وەك سزادانی مێشك لەڕیی سزای دەروونییەوە، سزادانی دەموچاو، نینۆك دەرهێنـان، بـەردبارانکردن، سـزادانی ئـەخلاقی جەسـتە: وەك خەساندنی پیاو، رابواردنو دەستدرێژیکردنە سەر ئافرەت لەڕووی سێکسیو لێـدانو سـزادانی سێکسی، سـزادانی ئەنـدامی زاوزێـی نێرینـەی پیـاو یـان ئـافرەت، سـزادانی قولاییـەکانی جەسـتە: وەك برسـیکردنو تینـوکردنو شـکاندنی ئێـسك، سـوتاندنی شـوێنە هەستیارەکان،..تـاد، سـەرجەم ئـەم شـێوازی سـزادانانە خەیاڵدانو فەنتازیاو وێناکراوی گەورەی لەپشتەوەیە، هاوکات هـەر لـەناو ئـەو مێـژووی سـزاو ئەشـکەنجەیەدا، مێژوویـەکی تـاریکتر هەیـە کـە پێکهاتەیەکە لەهەماهەنگی هەریەك لەئاینو دەسەلاتو کۆمەلگە بۆ بەڕێوەبردنی سزای کاریگەرو ئازاربـەخشو ترساندنی جەستەکانی دەرەوەی جەسـتەی ئـازاردراو کـە بـریتین لـە: بـەردبارانکردنی جەسـتەیەك تـا مـردن لەلایـەن قەشـەو پیـاوانی ئـاینیو خـەڵکو پیاوانی دەسەلاتەوە، سازدانی کۆبونـەوەی جـەماوەری بـۆ سـوتاندنی جەسـتەی جادوگـەرو لادەرەکـانی کۆمەلگـەو ئـاین لەمێـژووی دەسەلاتی مەسیحیدا، شێوازی جیاجیای لەسێدارەدان وەك سەربڕین لـەڕێی شمـشێرەوە(بڕوانـە مێـژووی ئەشـکەنجەدان لـە ئیـسلامدا)، کـەوڵکردن تـا مـردن، پارچەپارچـەکردنی مـرۆڤ، لـە قـەنارەدان، بەسـتنی قورسـایی بـە قاچـی کەسـی سـزادراوەوەو غـەرقکردنی

لەدەریادا، مەقسەڵە، گولەبارانکردن، لەکارەبادان تامردن، ژەهردەرخواردکردن...تاد.

ئێمە لەڕێی دیاردەیەکی زۆر سادەوە لاپەڕەکانی ئەو مێژووە گەورەیەی ئەشکەنجەدانمان جارێکی دیکە هەڵدایەوە بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی لەنێوان جەستەو سزاو فەرهەنگدا، هاوکات پەیوەندی هەموو ئەم دنیابینییە بە ئەشکەنجەدانی خودگەرایی، یان بەیانکردنی یادەوەرییەکی شارەوە لەسەر جەستە لەرێی کوتین و نەخشاندنی جەستەوە.

# سێکس و وێنەکانی

## "کولتوری ئاوەدەستخانە"

ئەوەی لێرەدا باسی لێوەدەکرێت ئەو ناوەندە دیاریکراوە نیە کە سەرزەمینێکی رامکراو یان باسکراوێك بێت بە ئەندازەیەك لەتاکەیەك خەیالگەدا یان لەتاکەیەك راڤەکاریدا کۆبکرێتەوەو رووبەرەکانی دیاریبکرێتو هەموو ئەو سنورانە بدۆزینەوە کە دەچنەوە سەر تاکەیەك مەودای روانین، ئەوەی ئەو پانتاییو سنورانە بەرفراوانترو ئاوەلاتر دەکات خودی دیاردەیەك لەکۆی هەموو ئەو دیاردە شاراوانە نیە کە دەکەونە دەرەوەی روانینی ئاساییەوە، نەخێر بەڵکە مەوداکانی تێگەیشتن لەهەر دیاردەیەك لەپێکهاتە هەرە سەرەکییەکانی دیاردە شاراوەکانەوە ئاشکرا دەبێت کە زیاد لەراڤەکارییەكو زیاد لەخەیاڵو شیکردنەوەیەك هەڵدەگرێت.

لێرەدا پێویستە بەر لەهەرشتێك بگەرێینەوە سەر ناوەندێکی هەرە بەرفراوانو نادیاریکراو کە یەکێکە لەدیاردە شاراوەکانی کۆمەڵگە، ئەویش فەنتازیا پێشوەختەکانی سێکسە، رونتر لەم دەستەواژەیە پێویستە کار لەسەر ئەو خەیالگەیە بکەین کە لەکۆمەڵگە نەریتییەکاندا بووەتە کارخانەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی وێنەو خەیالگەی سێکسی، کەواتە ئەو فەنتازیایانە چین کە لەپشت ئەو دیاردەیەوە کاردەکەن بۆ بەرهەمهێنانی فەنتازیای سێکسی شاراوە، یان بە غەیبانیکردنی

غەریزەیەك لەغەریزەكان كە دۆخێكی ئاسایی‌و بایلۆژی‌و دەروونی بوونەوەرەكانە.

لەكۆمەڵگە نەریتییەكاندا زۆرێك لەو دیاردە شاراوانەی كە لەپانتاییەكی قوڵی كۆمەڵایەتیدا دەگوزەرێ هەڵگری كۆمەڵێك بێدەنگی‌و شاردنەوەو بێبایەخكردنن، ئەو بێدەنگیانەش تەنها بێدەنگییەكی دیارو ئاشكرا نیین، بەڵكە بێدەنگییەكە لێوانلێو لەهەر كاریگەرییەكی شاراوەی كولتووری‌و ئەخلاقی‌و كۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌و سیاسی، بۆئەوەی بگەڕێینەوە سەر قوڵاییەكانی ئەو دیاردانە، بۆئەوەی لەرەهەندێكی نزیكەوە دەستكاری ئەو ناوەندە داخراوە بكەین كە سێكس دەورو كاریگەری كۆمەڵایەتیی نادیاریكراوی هەیە لەسەری‌و راستەوخۆ كار لەسەر ئەو ناوەندە دەكات، لێرەدا دوو شێواز لەئارادایە بۆ نزیكبوونەوەو كەشفكردنی، یەكێك لەو شێوازانە: رۆمان یان چیرۆك، شێوازی دووەمیش كۆمەڵە كەرەستەیەكی فۆلكلۆرین بۆ كەشفكردنی دیوە شاراوەكانی ئەو روانین‌و دنیابینییە غەیبانییە، بەلاَم دیاردەی فەنتازیای سێكسی ئاوەدەسخانەكان لەكۆمەڵگە داخراو و نەریتی‌و ئاینییەكاندا زۆر لەوە گەورەترە ببێتە حیكایەت‌و راگوزەر بەسەرماندا تێپەڕێت، لەبەرئەوە لێرەدا كۆمەڵێك چەمك بەكاردەهێنین بۆ زیاتر ئاشنابوون بە قەوارەی جەوهەری دیاردەكە.

## مرۆڤی شاراوە

مرۆڤی شاراوە ئەو بونەوەرە نائاشكراو نادیارەیە كە ناتوانێت جیایكەیتەوە لەكۆمەڵ‌و دایماڵێت لەو ستراكچەرە گەورەیەی

کولتـــورو روانینـــی گـــشتی کۆمەلگـــەو دایبڕیـــت لەفەرهـــەنگو لەپارچەیەکی بچوکی ئەو ماشێنە گەورەیەی کە ناوی کۆمەلگەیە، مرۆڤێکـــە تواوەتـــەوە لەفەرهـــەنگو ئـــەخلاقیاتو نـــەریتی کۆمەلایـــەتیو روانینـــی ئـــاینیو فەرهـــەنگی هـــەژاری کۆمەلگـــەو پـــەروەردەو خێـــزانو حـــەرامو حـــەلالو قەدەغـــەکراو. لەکاتێکـدا ئیرادەیەکی کۆمەلایـەتیو دەسـتەجەمعی بـەڕێوەی دەبـاتو ئیرادەو خواستو ئارەزووەکانی بەئەندازەیەك کالبونەتـەوە کە لـەتوانادا نیە تایبەتمەنـدی سـایکۆلۆژی تاکەکەسـەکان لەیـەکتری جیابکەینـەوە، لەتوانادا نیە بەدوای روانینی جیاوازو خـەیالی جیاوازدا بگەڕێین، لەراســتیدا کۆمەلگــەی بــێ جیــاوازی کۆمەلگەیــەکی نەخۆشــە، فەرهەنگی بێ جیاوازی فەرهەنگێکی سەرەتاییو هەژارە، مرۆڤی بێ جیاوازیش مرۆڤگەلێکی شاراوەن لەناو کۆمەلگەو کولتـورو روانینـدا، مرۆڤگـەلێکی بـێ ئـیرادەو خـامۆشو فەرامۆشـن بێجگەلـەوەی کـە خاوەنی کۆمەلێك غـەریزەی سـەرەتایین وەك غـەریزەی نـانخواردنو ئیسراحەتو سێکسی حەلالو غـەریزەی کۆمەلایـەتیو پێکەوەبوون، شـتێکی جیاوازتریـان نیـەو دەتـوانین ئـەو جـۆرە کۆمەلگەیانـە نـاو بنێین کۆمەلگەی غەریزەیی یان کۆمەلگەی شاراوە.

لەمجۆرە کۆمەلگەیەدا هەموو مرۆڤەکان مرۆڤی شاراوەن هـەموو رەگـەزەکان لـەنێرەو تـا مـێ لەکـچەوە بـۆ کـوڕ لەدایکـەوە بـۆ بـاوك، مرۆڤگـەلێکی شـاراوەنو هـەژارن لەهـەر پەیوەندیـەکی جیـاوازدا لـەدەرەوەی ئـەو ترادسـیۆنی پەیوەندییـە سـادەیە کـە رۆژانـە دابەشـدەبێت بەسـەر تاکەکەسـێكو سـەرلەبەری کۆمەلگـەدا،

روانینێکی دیکەو خەیاڵگەیەکی دیکەیان نیە، بێجگە لەشاردنەوی ئارەزووەکانی خۆیان‌و خەفەکردنی هەر دنیابینیەکی جیاوازی خۆیان ئەزمونێکی دیکەو پەیوەندیەکی مۆدێرنی ئاشکرایان نیە.

لەکۆمەڵگە داخراوەکانی دنیادا لەفەرهەنگە خەفەبوەکانی دنیادا تەواوی ئارەزووە جیاوازەکانی تاکەکەس وەك سەرجەم ئەو خەیاڵ‌و فەنتازیانەی کە پەیوەندییەکی قوڵیان هەیە بە تاکەکەسەوە، وەك عیشق‌و رۆمانسیەت‌و پەیوەندی ئاسایی نێوان دوو مرۆڤ، نائاشکراو شاراوەن، بەئەندازەیەك هەموشتێکی جیاواز هەموو خەیاڵ‌و خولیایەکی جیاوازو لادەر خەفەکراو شاراوەیە، هاوکات خودی غەریزەی سێکسی نێوان نێرو مێ شاراوەو نادیارو خەفەکراو فەرامۆشکراون، هاوکات هەموو خەونێکی جیاواز بە دنیاوە لەدەرەوەی خەیاڵی کۆمەڵگە شاراوەو نائاشکرایە، هەموو جیاوازیەك لەکۆمەڵگەو هەموو رەخنەیەکی تاکەکەسی لەفەرهەنگ‌و کۆمەڵگەو نەریت‌و ئاین شاراوەن‌و دەکەونە پەراوێزەوە، کەواتە دەرەنجام ئێمە لەبەردەم کۆمەڵگەیەکی شاراوەو پەنهان داین، چۆن مرۆڤێکی ئاشکراو دیارمان نیە لەجیاوازییەکانی خۆیدا، بەهەمانشێوە کۆمەڵگەیەکی شاراوەو نادیارمان هەیە بەرامبەر دنیاو هەر گۆرانکاریەك کە دەکەوێتە دەرەوەی هەرە ئاستە ژیارییەکانی ئەم جۆرە کۆمەڵگەیانەوە.

لەراستیدا بۆ زیاتر ئاشنابوون بە مرۆڤی شاراوە پێویستە لەرێی کۆمەڵێك نمونەوە ئەو شورا داخراوەی دەوری کۆمەڵگە کاڵبکەینەوەو شەفاف بێتەوە بۆ ئاشکرابون لەروانینی جیاوازدا،

پێویسته لەرێی ئەم نمونانەوە ئەو دەرگا داخراوانەی فەرهەنگ‌و ئەخلاق‌و قەدەغەکراوەکان بکەینەوەو ئەو دنیا پەنهانە ئاشکرابکەین کە لەپشت ئەم کۆمەڵگەیەوە ئامادەگییەکی بەردەوامی هەیەو بونبە کۆمەڵە پێگەیەکی شاراوە بۆ بەتاڵکردنەوەی ئارەزوو خەون‌و خولیاو رەخنەو زەبروزەنگ‌و چەپاندن‌و رووتبونەوەی روانین لەسەرەتایترین دۆخی نائاسایی خۆیدا.

لەناو کۆمەڵگە داخراوەکان‌و شاراوەکاندا کۆمەڵگەیەکی کاریگەرترو چالاکتر هەیە، ئەویش کۆمەڵگەی ئاودەستخانەکانە، رەنگە ئەم دەستەواژەیە هێندە قورس نەبێت، بەڵام دەستەواژەیەکی تارادەیەك حەرام‌و قەدەغەکراوە، بەڵام بۆئەوەی کۆمەڵگە داخراوەکان‌و مرۆڤە شاراوەکان‌و خولیا شاراوەکانیان زیاترو زیاتر راڤە بکەین‌و لەبەریەك هەڵیانبوەشێنینەوە، پێویستە لەپەنهانترین‌و شاراوەترین شوێنەوە دەستپێبکەین، پێویستە دەست ببەین بۆ ئەو ناوچە حەرامکراوانەو والآیان بکەین، کە لەراستیدا شوناسی ئەو شوێنانە رێگرە لەبەردەم هەر ئاشکراکردنێکدا، دنیای ئەودیو دەرگا داخراوەکانە، حەشارگەیەکی دەرونی‌و فەرهەنگییە بۆ پەنهانکردنی تەماشاکردن‌و بینینی دنیا.

ئاودەستخانە سەرباری ئەوەی شوێنێکی بچوکەو پێکهاتوە لەسێ دیوارو دەرگایەکی بچوك، شوێنێکی نهێنیشە، هەرچەند شوێنگەیەکە بۆ بەتاڵبونەوەی مرۆڤ لەپاشەڕۆو شوێنگەیەکی شاراوەشە بۆ بەتاڵکردنەوەی ئارەزوو خولیای جیاوازو خەیاڵ‌و خەونی جیاوازو نارِزایی‌و دەرخستنی غەریزەی جیاوازو

بەتاڵکردنـــەوەی چـــەپاندن و ئـــەو زەبروزەنگـــە فەرهـــەنگی و کۆمەڵایـەتی و ئاینیانـەی کـە کاریگـەری ستەمئاساى هەیـە لەسـەر مـــرۆڤ، ئێمـــە لێـــرەدا بـــاس لەئاودەســـتخانە گـــشتییەکانی وەك ئاودەستخانەی مزگەوتەکان و یانەی مەیخواردنەوەو یانەی جیاجیاو ئاودەسـتخانەی قوتابخانـەکانی کـچان و کـوڕان دەکـەین. کۆمەڵگـەی ئاودەستخانە کۆمەڵگەیەکە لەهەناوی هـەموو کۆمەڵگـەکانی دیکـەدا، بەڵام هێندەی کۆمەڵگەیەکە لەفەنتازیاوە بۆ پـەنهان، کۆمەڵگەیـەکی هەسـتپێکراو نیـە، هێنـدەی کۆمەڵگەیـەکی یۆتۆپییـە، هێنـدەش کۆمەڵگەیـەکی شـاراوەیە. بۆئـەوەی ئێمـە ئـەم کۆمەڵگەیـە بناسـین پێویـستە بەرلـەوەی ستراکـچەری ئـەو کۆمەڵگەیـە دیاریبکـەین، پێویستە جوگرافیاکانی ئـەو کۆمەڵگەیـەو سـایکۆلۆژیاو سۆسـۆلۆژیاو کولتورناســی ئــەو کۆمەڵگەیــە بخەینــە بــەرباس و راڤــەکاری و گفتوگۆیەکی جیاوازەوە.

جوگرافیـــای کۆمەڵگـــەی ئاودەســـتخانە چـــەند جوگرافیایـــەکی بچوکە وەك شوێن، هێندەش جوگرافیایەکی گەورەیە وەك فـەنتازیا. فـــەنتازیاکانی شـــوێن لـــەو نێوەنـــدە داخـــراوەدا کـــە تـــەنها ئاودەسـتخانەیەکی تاکەکەسـییە وەك ئاودەسـتخانەیماڵـەوە، بـەڵام جیاوازییـەکی گـەورە هەیـە لـەنێوان ئاودەستخانەی ماڵـەوە لەگـەڵ ئاودەســتخانەی مزگـەوت و نـادی و قوتابخانـەو شوێنەگـشتییەکان، لەبەرئەوەی ئەو خەیاڵ و فەنتازیایـە گەورەیـەی کـە لەئاودەستخانە گشتییەکاندا هەیە، لەئاودەستخانەکانی ماڵـەوەدا نیـە، ئاشـکراکردنی وەزیفـە فەنتازییـەکانی ئاودەسـتخانەی ماڵـەوە هێنـدە قـورس نیـە،

وەك هەموو ئاودەستخانەكانی دنیا بۆ میزكردنو بەتاڵكردنەوەی پاشەڕۆ بەكاردەهێنرێت، لەپاڵ ئەوەدا ڕەنگە لەكۆمەڵگە سونەتییەكاندا كوڕانی هەرزەكارو گەنج جگەرەی تێدا بكێشن، لەوەش بترازێت ڕەنگە گۆشەیەكی پەنهان بێت بۆ (عادەسڕی) كوڕانو كچان، دنیایەك خەیاڵی سێكسیو كرانەوەی چەپاندن لەچوار دیوارێكی بچوكی هاوشێوەی بەندیخانەی تاكەكەسیدا، بەڵام هیچ كام لەو چەپاندنو خەیاڵاتە سێكسیانە نابنبە نوسینو گوزارشتی ئاشكراو سێكسی، هاوكات ئەوەی لەئاودەستخانەكانی ماڵدا دەگوزەرێ چڕبوونەوەی دنیایەك قەدەغەكراوو خەیاڵاتی حەرامكراوە لەچوارچێوەیەكی بچوكی خەیاڵاتدا، دنیایەكی بچوكە بەڵام لەسەرزەمینێكی بەرفراوانی قەدەغەكراو و حەرامكراوی نادیارداو حەشارگەیەكە بۆ گفتوگۆكردن لەگەڵ خودئاگاییو خەیاڵاتو ڕوانینە دوورمەودا سێكسیو تاكەكەسییەكان، خەیاڵدانێكی دیاریكراوو بەرجەستەیە لەدەرەوەی ئەو ماڵە داخراوەی كە بەرهەمهێنەری چەپاندنو خەساندنی هەر ڕوانینێكی سێكسییە، خەیاڵدانێكە بۆ بەرهەمهێنانی بستێك خاكی ڕامنەكراو بەنەریتو ترادسیۆنی بچوك، هەوڵێكە بۆ سازكردنی سەرزەمینێكی بچوك بۆ خەیاڵو فەنتازیا حەرامەكان.

دواجار ئاودەستخانە دەبێتە جوگرافیایەكی ئەفسانەیی لەدەرەوەی قەدەغەو موقەدەساتو حەرامو حەڵاڵ.

بەڵام هەرچی ئاودەستخانە گشتییەكانە بەتایبەتی ئاودەستخانەكانی مزگەوتەكان. لەڕاستیدا كەم نین ئەو

مزگەوتانەی هەموو ساڵێك تەنها بۆیاخی ئاودەستخانەکانیان تازە دەکەنەوەو بەردەوام سپیکاری دەکەنەوە، لەبەرئەوەی سالآنە دیواری ئەو ئاودەستخانانە پڕدەبنەوە لەنووسینو خەیالآتو گوزارشتی سێکسیو حیکایەتی بچوكو بەتاڵبوونەوەی شەڕانگێزی.

زوربەی شەڕی ناوخۆو مللانێی ئایدۆلۆژیو مەزهەبیو شەڕی کوشتنو ناشرینکردنی یەکتری لەئاودەستخانە گشتییەکانەوە دەستپێکردوەو سەرچاوەی گرتووە، ئاودەستخانەکان بوونەتە زەمانحالێکی توندوتیژو ئابروبەرو روتکەرەوەیەکی پەنهان بۆ داماڵینی ئەخلاقو کەسایەتیو روحیەتو خەونە شەڕانگێزەکان.

# مرۆڤی یادەوەری[7]

مەریوان وریا قانیع دەڵێت: "ئائامادەیی رەخنەیەکی رادیکال‌و ناساندنێکی راستەقینەی کێشەکان‌و دارشتنی بەرنامەیەکی رادیکال بۆ گۆرینیان. هەموو ئەمانەش مانای کوشتن‌و زەلیلکردنی زەمەنە لەرێگای بەرهەمهێنانەوەی دوێنێ لەناو ئێستادا، مانای دۆراندنی ئێستاییبوون‌و هەموو هەستێکی راستەقینەیە بە مێژوو و دنیای ئەو مێژووە."

ئێمە بۆئەوەی لەئێستادا نەژین، یان بۆئەوەی خۆ لەئێستاو لەهەر هەنوکەیەك بدزینەوە کە ماناکانی ئێستاییبوون‌و ئەو ئاستە ژیارییە بەرجەستەدەکات، دەگەرێین بەدوای دنیایەك بەهانەو خەروارێك حیکایەت‌و سەرزەمینێکی بەتاڵ لەئێستا بەلام پر لەیادەوەری‌و لەرابردوو، لەناو ئەم دامەزراوە گەوەریەی رابردوودا بێشومار حیکایەتی هەلاهەلاو بێ ئەندازە بیرەوەری‌و سەرگوزشتەی لابەلاو رووبەرێکی گەورە لەخەیاڵی شکاو ئامادەگیان هەیە، ئالێرەوە زەلیلکردنی زەمەن‌و کوشتنی هەر بەهایەکی ئێستایی کە مەریوان وریا قانع باسی لێوەدەکات بەرجەستە دەبن‌و دەبنە هەڵکەوتەیەکی ژیاری‌و نالۆژیکی، بەلام سەرلەبەری ئەو فەرهەنگە کاردەکات بۆ بەخێوکردنی ئەو سەرمایە رەمزی‌و حیکایەتیانەی کە بەردەوام ئەو پاڵەوانی حیکایەتانە بەرهەمدەهێننەوە کە مەودایەکی پرشنگداری

سەروەری و جوامێری و مرۆیی پێ دەبەخشرێتەوە، واتە ئەو پاڵەوانەی کە کاری بۆ ژیاندۆستی کردووە، بەمانا ئاینییەکەی، بەڵام بە دیوێکی دیکەدا پیرۆزکردنی پاڵەوان لە حیکایەتدا ناکاتە دروستکردنی پاڵەوان لەئێستادا، رەنگە حیکایەتێك لەحیکایەتەکان مرۆڤگەلێکی بێشومار دەسخەرۆی رەمزو یادەوەرییەکی درێژخایەن و دوورمەودا بکات، بەڵام ناتوانێت تەواوی کۆمەڵگە لەتاکەیەك حیکایەتدا کۆبکاتەوە، رەنگە لەرێی کۆمەڵێك حیکایەتی یەکلەدوایەکەوە دەستکاری یادەوەری لایەکی کۆمەڵگە بکات، بەڵام لەتوانایدا نیە خۆی داماڵێت لەو سەرمایە رەمزی و خورافیەی کە حیکایەتەکانی پێ دەرازێنێتەوە.

مەترسی هەرە گەورەی زیندوکردنەوەی حیکایەتەکان لەئێستاداو بە دوێنێکردنی ئێستا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە کەمنین ئەو حیکایەتانەی سەروەرییەکی لەرادەبەدەرو پیرۆزێکی میتافیزیکی و سەرتاپا لەپاڵەوانی ئەفسانەیی و بێشومار پڕ لەرەمزی پیرۆزو پڕ لەوێنەی خودایی پێشکەشدەکەن و خۆیان بەرهەمدەهێننەوە، کێشەکە ئالێرەوە دەستپێدەکات کە رەخنەگرتن لەهەر ناوەندێکی پیرۆز، لەهەر خەیاڵدانێکی پڕ لەرەمزو بەهای ئایدۆلۆژی و فەرهەنگی دوێنێ، بەبێ قسەکردن لەسەر ئەو کایەیە گەورەیەی کە زۆرێك لەو حیکایەتانەی تیایدا دەژی ئەستەمە بەر ئەو ئاستە ژیارییە ساختەیە نەکەویت کە رووبەرێکی نادیاریکراوی وەهمییە، هاوکات کەمترین دوورکەوتنەوەشە لەو مەودا ونەی کە سیحری حیکایەتەکان دروستیدەکەن.

جـــوانكردنی حیكايەتـــەكان يـــان موقەدەســـكردنی هـــەر يادەوەرییـــەكی حیكايـــەتامێز، لـــەو بـــەهاو رەمـــزە نوێیانـــەوە سەرچاوەدەگرێت كـە لەئێـستادا پێیـان دەبەخـشرێت، هاوشوناسـێكی گـەورەتر بـۆ ئـەو وەهمـە نادیـاریكراوە دروسـتدەكات كـە دەیـان ئەوەنـدەی هـەر رووداوەێكـە لـەرابردوودا، كـە زەمـەن لەسـەر ئـەو رووبەرانـە دابەشـدەكەن بەسـەر پـۆلێنێكی ئاسـاییدا، واتـە وەك بەخـشینی ئـەم بەهايانـە: سـەروەری بـەمانا هـەرە ئەفسانەییەكەی، موقەدەسـكردن، جـوامێری، چـەمكی پاڵـەوان، چـەمكی شـەهید، شـۆڕشو داسـتانەكان، فریـادڕەس..تـاد. سـەرلەبەری ئـەم چـەمكانە لـەدنیای مـۆدێرنی حیكايەتەكانـدا شـتگەلێكی دیكـەن‌و تـەواو جیاوازترن لەهەر رووداوێك لە رابردوويـەكی یۆتۆبیـدا، لەكاتێكدا تـۆی مرۆڤـی هاوچـەرخ كـە دەكەویتـە دەرەوەی ئـەو حیكايـەت‌و یۆتۆبیاو موقەدەساتەوە لەوە تێدەگەیت كە ئـەم حیكاتانـە داماڵراو نـیین لەهـەر سـاتەوەختێكی زیـادەڕۆ لـەناو زەمـەن‌و شـوێندا، بـەلاّم ئەرشیفەكەت بەقەدەر ئـەو حیكايەتانـە نـیین، قـەوارەی تـۆش وەك بووەیـەكی بەشـدار دابـەش بـووە بەسـەر ئـەو ئاسـتە ژیارییـەدا كـە تـــەواوی دیـــاردەو گۆڕانكـــاری‌و فەرهـــەنگی بـــالآی دەرەوەی حیكايەتـەكان‌و دەرەوەی موقەدەسـات‌و دەرەوەی ئـەو ترادسـیۆنە بەتـەواوەتی داگیریـان كردوويـت‌و تـەواو مرۆڤێكـی هەلاهـەلاو فۆتـۆنێكی دەوری ئەلكترۆنـەكانی ئـەو مـەودا داخـراوەی لەئاستێكی ژیاری نابەرجەستەی بێ ئەندازەدا، تۆ كە دەبیتە مرۆڤێكی داماڵراو لەهەر ساتەوەختێكی مێژوویی‌و ترادسیۆنی، بەلاّم پڕدەبیت لەهـەر

پارچەیەکی ئەو کەرەستانەی ئەو یادەوەرییە گەورەیەی کە لەپشتییەوە فەرهەنگێکی لۆکاڵی زمانحاڵێتیو حیکایەتەکانت بەبێ ئەرشیفێکی دیاریکراو بۆ دەگێڕێتەوە.

هەڵبەت راستکردنەوەی هەر حیکایەتێك بۆ دۆخێکی ئێستاییو بردنەوەی بۆ ئەو ساتەوەختە مێژووییو حیکایەتیەی کە تیایدا بەرجەستە بووە، نەك هەر کارێکی ئەستەمە، بەڵکە کارێکی مەحاڵەو دوورکەوتنەوەیە لەو خەیاڵدانە پڕ لەیادەوەرییەی کە دنیای شتە پیرۆزەکان دەپارێزێو مەوداکان کورترو کورتر دەکاتەوە.

بەمانایەکی دیکە مەترسی گێڕانەوەی حیکایەتەکان لە ئێستاداو کوشتنی زەمەن لەتاکەیەك ساتەوەختی رابردوامێزدا دنیایەك بەدگومانی بۆ تۆی هاوچەرخ دروستدەکات، بەلام تەواوی ئەو بەدگومانیانە ناکاتە ئەوەی تۆ لەدەرەوەی حیکایەتەکاندا بژێنێتو لەمەودایەکی دیکەدا بوونەوەری بیرکەرەوە بیت، بەڵکە ئەو مەودایە کار لەسەر بە مێژووکردنی ئێستا دەکات بۆ رووتکردنەوەی هەر روانینو خەیاڵدانێکی تاکەکەسی بۆ بینو تەماشاکردنو بەرجەستەکردنی کلێشەیەکی دیکەی دنیابینیو سەرزەمینێکی دیکە لەدەرەوەی حیکایەتو یادەوەرییە سەرسەختەکانی ئەو داخرانە فەرهەنگییەی کە ئەو کولتورە دەیخوازێت.

بەکارهێنانی کۆمەڵێك کەرەستەی مۆدێرن بۆ گێڕانەوەی حیکایەتەکانو پاراستنی هەر رابردوویەكو رەنگڕێژکردنی هەر ئێستایەك بە دەمیان حیکایەتی هاوشوناسو پڕکردنەوەی بەهەرچی موقەدەساتی رابردوویەکی بێ ئەرشیفە کە هێندە کارێکی قورس نیە، بەڵکە ئەو کەرەستە مۆدێرنانەی ئەوڕۆکە دەبنە هەڵگرو کۆکەرەوەی

حیکایەتەکان‌و ئەو سەرمایە رەمزییەی رابردوو هێندە کارئاسانی دەکات بۆ گەورەکردنی قەوارەی حیکایەتەکان‌و فراوانکردنی مەوداکانی پیرۆزپاریزی‌و رەمزپاریزی. هەر لەسەرەتاوە سادەترین کەرەستە وێنە فۆتۆییەکانی ئەو کامێرانەیە کە لەقۆناغی وێنەی رەشوسپییەوە دەگۆڕێت بۆ قۆناغی وێنەی دەقاودەقی مرۆڤەکان بە رەنگ‌و روخساری تەواوەوە، گرێدراو بە سەرجەم حیکایەت‌و رووداوەکانییەوە، ئامادە لەبەردەم هەر روداوێکی تێپەرداو خۆئامادەکردن بۆ هەر ساتەوەختێکی وەستاو و بەرجەستە لەئێستاداو کردنی بە رابردوو، هاوکات بە زیندوهێشتنەوەی لەهەر زەمەنێکی خوازراودا.

وێنەی فۆتۆ کە لەهەندێك نوسیندا ئاماژەمان پێداوە کەرەستەیەکی بیرخەرەوەیە، هاوکات یەکێکە لەهەرە مەودا چالاکەکانی یادەوەری بۆ پێوانەکردنی رابردوو بەپێی دیمەنە جیاجیاکان‌و پۆلێنکردنی زەمەن بۆ هەر قوناغێکی فۆتۆیی دیاریکراو و راستەوخۆ، بە ئەندازەیەك هیچ پۆلێنێکی قۆناغەکانی زەمەن لەوانی دیکە ناچێ‌و چەند کار لەسەر هێشتنەوەی زەمەنە جیاوازەکان دەکەن کاریش لەسەر گرێدانەوەی هەموو ئەو سەروەختانە دەکەن بۆ بەرجەستەکردنەوەیان لەوێنەیەکی دیاریکراودا، واتە ئەوەی من‌و تۆ لەوێنەیەکی فۆتۆیی‌و دیمەنێکی دیاریکراودا کۆدەکاتەوە تەنها راوەستانی من‌و تۆ نییە لەتاکەیەك زەمەنی هاوبەشدا، بەڵکە راوەستانی هەریەك لەئێمەیە لەدوو زەمەنی تەواو جیاوازدا، هاوکات ئەو وێنە فۆتۆییانەی لەلای من بوونەتە ئەرشیف تەواو جیاوازترە لەئەرشیفەکەی تۆ، واتە من‌و تۆ

لەزەمـــەن‌و ســـاتەوەخت‌و جوگرافیـــاو رابـــردوودا جیـــاوازین‌و یادەوەرییـەکانی مـن لەبیرەوەرییـەکانی تـۆ ناچـن‌و هـەموو یـەکێك لەئێمـە وێنـەکانی جیـاوازەو یادەوەرییەکانیـشمان ناچـنەوە سـەر مەودایەکی دیاریکراوی ژیان، بەڵام من‌و تۆی تاکەکەس لەئەرشیفی وێنەیی کۆمەڵگەیـەکی نەریتی‌دا هاوبەشـین لەبەرئـەوەی هـیچ کام لەئێمە بە کردارو وێنەو دیمەن بەشدار نـیین لـەو وێنانـەدا، بەڵکـە تەماشاکەرین‌و لەو مەودایەدا یەکدەگرینەوە کە ئەو وێنەیـە بۆمـان دەگێڕێتەوەو داخڵی حیکایەتەکانی خۆیمان دەکات، گێڕانەوەی هـەر حیکایـــەتێکی مـــن‌و تـــۆی تاکەکـــەس لـــەو مـــەودا ئەرشـــیفییەدا بێهودەییـــەکی گەورەیـــە، لەبەرئـــەوەی تـــەنها ئـــەو وێنانـــەو ئـــەو حیکایەتخوانانە دەتوانن رابردوو بۆ من‌و تۆ و هـەزارانی وەك ئێمـە بگێڕنەوە کە ئاگایان لەکۆمەڵێك ساتەوەختی ئەو سەروەختانەیە کە ئەو وێنانـە تیایانـدا گیراون‌و بـە فۆتـۆکراون، بـەڵام هـەموو ئەمانـە لەکۆمەڵگەیەکی مۆدێرندا ناکاتە ئەوەی هەر کەسەو بەپێی مـەزاج‌و ترادسیۆنی روانینەکانی خۆی‌و بەرژەوەندی‌و خەیاڵ‌و ستراتیژەکانی خۆی حیکایەتی وێنەکان بگێڕێتەوە.

لەکاتێکدا ئەو کۆمەڵگایانەی مێژوویەکی نوسراوی دیاریکراویـان نیـــە پـــشت بـــە حیکایەتخوانـــەکان دەبەســـتن‌و چـاوەڕوانی هـــەر حیکایەتێکن لەسەر خۆیان‌و مێژووەکەیان. چۆن روانینـی هەریـەك لەئێمـە جیـاوازە، بەهەمانـشێوە روانینـی هەریـەك لەئێمـە بـۆ هـەر وێنەیەکی ئەرشیفی جیاوازە. بەڵام دواجـار سـەرلەبەری کەرەسـتەو دەزگـا مۆدێرنـەکان لەکۆمەڵگـە نـەریتی‌و داخراوەکانـدا لەخزمـەتی

گێڕانەوەی حیکایەتەکان و پاراستنی ئەو وەهمە مێژووییەیەدان کە رابردوو دەخاتەوە بەردەم ئێستاو سەرلەبەری مرۆڤەکان دەکاتەوە بە بوویەکی یادەوەرامێزو هەلگری حیکایەتەکان.

## فەرامۆشکردنی نەوەیەك لە کچان

یەکێك لەو رەگەز هەرە فەرامۆشکراو و خەفەکراوەی ناو کۆمەلگاو ناوەندو دەزگا کۆمەلایەتیو فەرهەنگیو سیاسیو پەروەردەییەکانی، کە تائەوڕۆکە قسەی جدی لەسەر نەکراوەو کەمترین گفتوگۆی دروستکردووەو کەمترین رەخنەی لەسەر گیراوە، ئەویش رەگەزی کچە، یان ئەو نەوەیەی کە کەوتۆتە نێو قولایی کۆمەلگەو نەریتو کلتورو ئەخلاقیاتی رەگەزسالاریو هێزسالاری کۆمەلگەوە، هاوکات ئەم نەوە نامۆیە لەبەردەم دونیای مۆدێرنو دیاردەو گۆڕانکارییەکاندا فەنتازیایەکی دیکەو خەیالدانێکی دیکەی بۆ دروست بووە کە پێکهاتەیەکی ئالۆزە لەفەرهەنگو دنیابینییەکی کراوەتر لەبەردەم ئەو فەرهەنگە هەژارەی کۆمەلگەو بەرابەر ئەو سەرزەمینە کە خالییە لەمەعریفەی پەیوەندیو پڕە لەپەراوێزکردنو فەرامۆشبوون.

ئێمە بۆ بەم رەگەزە، واتە رەگەزی کچ لەم کۆمەلگەیەدا دەلێین نەوەیەکی دیکەی مێ، هەلبەت هەمووی لەکۆمەلگە داخراوەکانەوە دەگوزەرێ زۆر جیاوازترە لەو ژیانو گۆڕانکارییانەی کە لەکۆمەلگا مۆدێرنەکاندا دەگوزەرێو هاوکات ئەو ئاستە ژیارییە داخراوەی کە کولتورو رۆشنبیریو نەریتو سیستمی کۆمەلایەتیو پەروەردەیی

کۆمەڵگا داخراوەکان پیایدا تێدەپەڕن و بەردەوام لەدووبارەکردنەوەی نەریت و بەرهەمهێنانی ئەو دەسەڵاتە لۆکاڵی و گشگیرەدا کار لەسەر بچووککردنەوەی خەون و خولیاکانی مرۆڤ دەکەن، کە مەودایەکی شارستانی جیاوازترە لەکۆمەڵگە مۆدێرنەکان کە فەرهەنگێکی کراوەو خولیایەکی کراوە لەئازادایەو بۆ هەموو مرۆڤێک و ڕەگەزو نەوەیەک فەراهەمکراوە تا لەڕێیەوە لەژیان و گۆڕانکارییەکاندا بەشدارییەکی کاراو فەرهەنگییان هەبێت، ئێمە بۆئەوەی زیاتر بڕۆینە نێو ئەو ناوەندە داخراوەو لەڕێیەوە کۆمەڵێک ڕەخنەی دیکەو دەروازەی دیکە والابکەین بۆ زیاتر ئاشنابوون بەپێکهاتە سەرەکییەکانی ئەو سەرزەمینە داخراوەی کە ڕەگەزی کچ تیایدا دەگوزەرێ لەڕێی ئەم خاڵانەوە دەروازەیەکی ڕاڤەکاری و شیکاری دەخەینە بەرباس و گفتوگۆ.

## کیژۆڵەکان وەك خزمەتکاری کۆمەڵگە

لەڕاستیدا سەددەر سەدی کیژۆڵەو کچانی ئەم کۆمەڵگەیە لەخێزانەوە تاعەشیرەت و تاخێڵ و تا حیزبیش بونەتە خزمەتکاری ئەم کۆمەڵگەیە، یەکەم شوێن خێزانە کە کیژۆڵەکان تیایدا فێری خزمەتکاری و شەرمکردن و قۆنەرە پاککردنەوەو گۆرەوی شتن و شۆردنی جلی ژێرەوەی باوك و براکان دەکرێن، فێری ئەوە دەکرێن چۆن خزمەتکارو کارەکەرێکی باش بن، بۆئەوەی باوك و براو دایك و خێزان و خزم و کەسوکار لێیان ڕازیبێت، تائێرە ئەوەی من باسی لێوە دەکەم پتر کۆمەڵێك سەرنج و کاری ئاسایی کچ و کیژۆڵەکانی ئەم کۆمەڵگایەیە، بەڵام

ئەوەمان لەبیرنەچێت ئەم خزمەتكارییە پرۆسەیەكی دوورو درێژە، بۆ بچووكردنەوەی رەگەزی مێ لەناو كۆمەڵگەدا، بنیاتكردنی ئەو مرۆڤەی كەناوی كچ و كیژۆڵەیە، پرۆسەیەكە بۆ بچووكردنەوەی خەون و خولیاكان، لەئاستێكی بچووكی ماڵ و بەخێوكردن و خزمەتكردندا، بچووكردنەوەی ژیان بۆ ئاستێكی وا نزم، بچووكردنەوەی ئەو بوونەوەرمیە بۆ ئاستێكی زۆر بچوكی فەرهەنگی و كۆمەڵایەتی كە لەرێیەوە خولیاكانی ئەم نەوە پەراوێزە زیاترو زیاتر بەرەو كونجە تاریك و لەبیركراوەكان بچوك دەبنەوە بۆ بوونەوەرێكی ماڵی و رامكراو لەمەودایەكی داخراوی ئەخلاقی و كۆمەڵایەتیداو نزمكردنەوەی بۆ ئاستێكی دابڕاوی نائەكتیڤ و پەنهان، رەخنەی ئێمە لێرەوە دەست پێدەكات و لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، رامكردنی مرۆڤ لەكۆمەڵگەیەكدا لەرێی كۆمەڵێك میكانیزم و هێزی جیاجیاوە ئەنجام دەدرێت، هەڵبەت لەمجۆرە كۆمەڵگایانەدا رامكردن و ماڵیكردنی كچ و كیژۆڵەكان لەرێی فەرهەنگ و دابونەریت و خێزان و دەسەڵاتی پیاوسالارییەوە كە كۆمەڵێك هێزن بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیە.

پرۆسەیەكە كەخەون و خولیاو ئارەزووەكانیش بێئەندازە بچوكدەبنەوە، هەڵبەت ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەكی دورودرێژی ئەخلاقی و كولتوری و كۆمەڵایەتییە، لەراستی تەنها گەمەیەكی فەرهەنگی نییە بۆ فەراموشكردنی لایەكی كۆمەڵگە.

فەراموشكردنی خولیاو ئارەزووەكانی كچان فەراموشكردنی خەون و خولیاو داواكاری و ئەكتیڤبون و بیركردنەوەو روانینەكانیانە، هەڵبەت خێزان یەكێكە لەو ناوەندە داخراوانەی كە بەو كارانە هەڵدەستێت و

ئەنجامدەری پرۆسەیەکی دوورو درێژی ستەمکارییە، بەڵام بەبێدەنگی، بەڵام لەبیرمان نەچێت ئەم پرۆسەیە چەند کاردەکات بۆ بچوکردنەوەی نەوەیەك لەماڵدا وەك خزمەتکار، بەهەمانشێوە لەڕێی میکانیزمێکی سایکۆلۆژییەوە کاردەکات بۆ گۆڕینەوەی چێژو خەفەکردنی هەر نارەزاییو خولیایەك لەدەرەوەی خولیاو خەونی ماڵ، هاوکات هەر کاروکردەیەك رۆژانە دوبارەبونەوەو هیچ دەروازەیەکیش لەئارادا نەبوو بۆ دەرچوونو خولقاندنی جیاوازییەکی فەرهەنگی، سەرەنجام هەممو ئەمانە بوون بە رۆتینێکی ئاسایی رۆژانەو لەپاڵیدا پاداشتێکی کۆمەڵایەتیو دەروونی بچووك هەبێ بۆ بەردەوامبوون، ئەوا ئەو مرۆڤە بەناچاری چێژی لێوەردەگرێت، چێژوەرگرتن لەماڵ هاوشێوەی چێژ وەرگرتنێکی غەریزەی بوونەوەرەکانی دیکەیە لەماڵیبوون لەگەڵ مرۆڤدا، وەکچۆن کەنارییەك چیتر ناتوانێت لەدەرەوەی قەفەزەکەی خۆی بژی کە پێشتر تێیدا بووە، وەکچۆن ئەو کۆترەی کە ماڵی دەبێ دەگەڕێتەوە بۆلای خاوەنەکەی خۆیو لەکولانەیەکی تاریکدا دەمێنێتەوەو ناتوانێت تائەبەد ئەو غەریزەیە لەخۆیدا بکوژێت، وەکچۆن بەرخێك ماڵی دەکەیتو نانی دەدەیتیو گەورە دەبێو خزمەتت دەکات، چیتر ئەو مەڕە ناتوانێت لەماڵ دوربکەوێتەوەو گورگەکان دەیخۆنو هەمیشە دوای شوانەکەی دەکەوێتو بە شمشاڵی شوانەکەی هۆگر دەبێت، هاوکات کچانو کیژۆڵەکانی ئەم کۆمەڵگایە سەرباری ئەوەی بوون بەخزمەتکاری کۆمەڵگا، چێژیش لەماڵو ژیانو دووبارەبوونەوەو فەرامۆشبوون دەبینن.

# کچان وەك هێزێکی خەفەکراو

با لەرێی ئەم پرسیارەوە دەروازەیەك والآکەین بۆ دروستکردنی گفتوگۆ، ئایا کچان کەوتوونەتە کام بەشی کۆمەلگاوە؟ لەڕاستیدا کچان لەهەموو شوێنێکی کۆمەلگادا هەن‌و لەتەواوی ستراکچەری کۆمەلگەدا بەشدارن‌و کایەو پێکهاتەو یەکەیەکی کۆمەلایەتی‌و فەرهەنگی‌و پەروەردەیی نادۆزیتەوە کچان‌و کیژۆلەکانی ئەم کۆمەلگەیەی تێدانەبێت، بەلام کێشەکە لەوەدایە ئایا رۆڵ‌و کاریگەری ئەم نەوەیە چییە لەسەر کۆمەلگەو فەرهەنگ، لەراستیدا ئەم پێکهاتە کۆمەلایەتییەی کۆمەلگا کە کچانن هێزێکی خەفەکراون، ئارەزووگەلێکی خەفەکراو و فەرامۆشکراون، بەگشتی دونیایەك خەون‌و خولیای فەرامۆشن‌و خامۆشکراون‌و لە پانتاییەکی گەورەی کۆمەلایەتیدا رامکراون‌و دوورخراونەتەوە لەهەر جولەیەکی کاریگەرو بەشدارو هاوبەش‌و پەیوەندیدار، هێندەی وەك گروپێکی هەلپەرکێ سەیریان دەکرێت هێندە وەك بەشدارو نەوەیەکی ئەکتیف سەیرناکرێن، هێندەی وەك خزمەتکارێکی خێزان‌و حیزب‌و خێل‌و عەشیرەت‌و مالدارێك مامەلەی لەگەل دەکرێ، هێندە وەك هێزێکی بەشدارو هاوبەش‌و ئەکتیف لەبوارە جیاجیاکانی ژیانی شارستانی دنیای مۆدێرندا کاری لەگەل ناکرێت، هێندەی دەبێت‌و پێویستە گوێگرێکی گوێڕایەل بێت بۆ کۆمەلگا لەخێزانەوە تاتەواوی دەسەلاتەکانی دیکە، لەدایکەوە تا باوك‌و براو مامۆستاو خزم‌و...هتد، وەك قسەکەرێك‌و بەشدار لەگفتوگۆیەکدا

مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت، ئالێرەوە نەفامی کۆمەڵگە دەستپێدەکات، لێرەوە کۆمەڵگە غەرقی جەهلێکی دیکە دەبێتو دونیایەك خەون و خولیاو ئارەزووی گۆڕانو چالاکی بەشێکی گەورەی کۆمەڵگە کە کچانن خەفەدەکاتو فەرامۆشی دەکات.

## کچان وەك گوێگر

لێسەندنەوەو زەوتکردنی غەریزەی قسەکردنو ئارەزووی گفتوگۆو چێژی مامەڵەکردنو بەشداریکردنی لەهەر کایەیەکی کاریگەری ژیاندا بەئازادی لەجەهلێکی گەورەو سەرتاسەرییەوە سەرچاوە دەگرێتو هەر لەو جەهلەوە مرۆڤەکان غەرقی بێئاگاییو نابەرپرسیاریەتیو نابەشداریو بێباکی دەبن، کچانی ئەم وڵاتە کە راستەوخۆو ناراستەوخۆ لەرووی کرداریو خولیاو بیرکردنەوەو سایکۆلۆژیاوە بەشدارن لەتەواوی کایەو یەکە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەدا، بەڵام بونەوەرێکی قسەکەر نین، هێندەی بونەوەرێکی گوێرایەڵکراو و رامکراو وماڵیکراون هێندە بونەوەرێکی ئەکتیڤکراو و چالاكو قسەکەر نین، خێزان بەردەوام لەرێی دەسەڵاتە جیاجیاکانی وەك دەسەڵاتی ئاینیو پیاوساڵاریو دەسەڵاتی چوارچێوەی ماڵ یان حەرەمی ماڵ لەقەدەغەکراو و رێپێدراوەکانو دەسەڵاتی جەهلو بێئاگایی کۆمەڵگە لەناو یەکەیەکی بچووکی وەك خێزاندا کار لەسەر بێدەنگکردنو گوێڕایەڵکردنی کچانو کیژۆڵەکانی خۆی دەکات، دواتر ئەم نەوە فەرامۆشکراوەی ناو کۆمەڵگەش لەرێی ئەو رامکردنو پەراوێزکردنەوە دەبنە کائینێکی

نائـــەکتیڤو بێئاگـــا بـــە هـــەر گۆرانکارییـــەکی کۆمەڵایـــەتیو پـەروەردەییو سیاسـی لـەدنیای دەرەوەی خـۆیو لـەدنیای دەرەوەی خێزانو چواردیواری فەرامۆشکردن.

گـۆرینی کـچان لەبونـــەوەرێکی قـسەکەرەوە بـۆ بونـــەوەرێکی بێدەنگو قسەنەکەر کە لەسەرەتای بوونەوە حەقیقەتێکی مرۆیـیو شارستانی هەموو مرۆڤەکانە، کە یەکێکە لەغەریزە سەرەتاییەکانی، گـۆڕینێتی لەبونـــەوەرێکی زینـــدووەوە بـۆ بونـــەوەرێکی مـــردوو، گۆڕینێتی بۆ شتومەكو کاڵایـەك کـە بەئاسـانیو بـێ قـسە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

## کاتێك کچان خۆیان دەکوژن

مـەرگ تاکـە شـوێنێکە کـە حیکایـەتی نیـە، تاکـە مەنزلگەیـەکی بێـدەنگو بـێ قـرەی بونەوەرەکانـە کـە دەکەونـە دەرەوەی ژیـانو دووردەکەونەوە لەقەرەباڵغی ژیانو چێژوو ئارەزوو خەونو خولیـاو ویستو ئیرادە.

پڕبـوونی مـاڵ لەحیکایـەتو فـەنازیای قـسەکردن، بـەڵام بـەبێ دەنگـی لـەدەرونی خۆیانـدا، پـڕ بـوونی مـاڵ لەفـەنتازیای چـێژو ئارەزوەکـان، بـەڵام ئـارەزووی خەفـەکراوو لەچوارچـێوەی مـاڵو کۆمەلگەیـــەکی ئـــەخلاقیو داخـــراو و سیـــستمێکی پـــەروەردەیی جاهیلانەدا، پڕبوونی خەیاڵ لەعیشقو ڕۆمانـسیەت، بـەڵام دەرەوەی ئـەو خەیاڵـــە واقعێکـــی بەرجەســـتەکراوی ئەخلاقییـــە کـــە پـــڕە لەحەرامو قەدغەکراو، وێرانەیەکی نەریتیو مەنزلگەیەکی گـەورەی

کوشتنی روانین‌و دنیابینییەکانە، سەرەنجام هەموو ئەم فەنتازیاو خولیاو خەونانە لەقەفەزی بیرکردنەوەو خەیاڵ دەرناچن‌و نابنبە هەست‌و خولیایەك لەواقیعداو نابن بەشتێکی ئاسایی کە ئەو مرۆڤەی ناوی کچە چێژی لێوەربگرێت.

## کوشتنی ئینسان و کولتوری مەرگ

کولتوری مرۆڤ کوشتن سەرباری ئەوەی یەکێکە لەکولتورە دێرینەکان، بەڵام تاکە میراتێکی قێزەوەنە کە لەئاژەڵە گۆشتخۆرو درندەکانەوە بۆ مرۆڤە شەڕانگێزو هێزە جاهیلەکان ماوەتەوە، ئەو مرۆڤەی یان ئەو هێزەی باوەڕی بەم کولتورە هەبێت‌و بەجیدی کاری بۆبکات دەبێتەوە بە ئاژەڵێکی درندە.

ئەو هێزانەی لەدنیادا کار لەسەر ئەم کولتورە دەکەن هێزگەلێکی شەڕانگێزن‌و روانین‌و دنیابینییەکی مەرگدۆستیان هەیە بۆ وێرانکردنی ژیان‌و کوشتنی خەون‌و روانینەکانی ئەوانی دی. بەدرێژایی مێژوو لەپاڵ کولتوری لێکبوردن‌و یەکتری قبوڵکردن‌و پەیوەندی‌و هاوژینی‌و خۆشەویستی‌و تێگەیشتن لەیەکتری، هێزی ناشرینی مرۆڤکوژ ئامادەگی هەبووە، بەداخەوە تا ئەوڕۆکە ئەم کولتورە بەو هەموو قێزەوەنییەوە ئامادەگی هەیەو رۆژانە رووی قێزەوەنی خۆیمان پیشان دەدات‌و دەیەوێت ببێتەوە بە کولتوری زاڵ.

کۆمەڵگەی نەریتی کۆمەڵگەیەکی داخراوە، هاوکات تێکەڵەیەکی ئاڵۆزە لەکۆمەڵگەیەکی تیرەگەری‌و تایەفەگەری‌و مەزهەبی‌و پەیوەندیگەلێکی سنورداری عەشایری‌و پەیوەندی خوێن.

هاوکات کۆمەڵگەی کوردیش بێبەش نییە لەمستراکچەرە داخراوە، بەڵام بەکۆمەڵێك جیاوازییەوە، سیستمی عەشایری لەکوردستاندا لەشارەکاندا کاڵبۆتەوە، بەڵام لەدەرەوەی شارە گەورەکان سیستمێکی کۆمەڵایەتی دیارو بەدەسەڵاتە، بەڵام لەشارەکاندا لەبری سیستمێکی عەشایری سیستمی حیزبگەرایی‌و خێزانسالاری‌و نەریتسالاری‌و ئەخلاقسالاری‌و ترادسیۆنی خێڵئاسا (واتە خێڵی مۆدێرن، بەڵام بەهەمان ترادسیۆن‌و پەیوەندی‌و عەقڵیەتەوە.) هاوکات کۆمەڵگەی کوردی لەڕووی کولتوری‌و فەرهەنگی‌و کۆمەڵایەتییەوە کۆمەڵگەیەکی ترادسیۆنیی داخراوە لەئاستی پەیوەندی‌و تێکەڵاوبوون‌و پەیوەندی بە کۆمەڵگەکانی دەرەوەی خۆی.

تائەوڕۆکە لەناوچە کوردنشینەکاندا وەك باقی ناوچەکانی دیکەی عێراق دیاردەی (غسل العار)و کوشتن لەسەر شەرەف دیاردەیەکی باوەو هاوکات لەسەرو یاساشەوەیە، هەروەها کوشتنی ژن‌و خۆکوشتن‌و خۆسوتاندنی ژنان دیاردەیەکی ناشرینی نێو ئەم کۆمەڵگەیەیە، توندوتیژی بەرامبەر ئافرەت بەگشتی‌و کچان بەتایبەتی لەئاستێکی کۆمەڵایەتی‌و کولتوری دواکەوتوودایە کە بووەتە ترادسیۆنێکی لکەدار بە فەرهەنگی کۆمەڵگەو خێزانەوە.

شێوازەکانی توندوتیژی کە دەرهەق بە ئافرەتان دەکرێت پێکهاتوون لە: توندوتیژی جەستەیی، سایکۆلۆژی، ئابوری، فەرهەنگی‌و پەراوێزخستنی ئافرەتان، هاوکات ڕۆژانە لەعێراقدا سەرباری تیرۆرو کوشتن‌و تەقینەوە دیاردەیەکی دیکەی ناشرین

لەئازادایــە، ئــەویش دیــاردەی ئــافرەت کوشــتن‌و چەوســانەوەی ئافرەتان‌و توندوتیژی بەکارهێنانی دژی ئافرەتـان، بـەڵام بەداخـەوە ئامارێکی وردو زانستی لەبەردەستدا نییە بۆئەوەی بەتەواوەتی ئـەو ئامارانــە بخەینــە بەردەســتی خوێنــەرو رێکخــراوە جیهانییــەکان، هۆکارەکانیش دەگەڕێنەوە بۆئـەوەی کـە ئەورۆکـە لەعێراقـدا شتێك نییە بەناوی ئارامی‌و دڵنیایی، هاوکات هیچ سـەنتەرێکی لێکۆڵینـەوە نەیتوانییـەوە تائەورۆکـە ئـەو ئامارانـە دەستبخات، هـەروەها ئـەم دیاردەیــە هێنــدەی دیاردەیــەکی شــاراوەوو پــەنهان‌و پــڕ لەنهێنییــە هێندە دیاردەیەکی ئاشکرا نییـە، لەبەرئـەوەی ئـەم ئافرەتانـەی لـەم کۆمەڵگەیــەدا دەکــوژرێن تەرمەکــەیان لەلایــەن ئەنجامدەرانییــەوە دەشـــاردرێنەوە یـــان فرێدەدرێنـــە دەریـــاوەو، یـــان جەســـتەیان دەشـیوێنرێت، دواتـر بـەهۆی ئـەم شـتانەوە ئـەو قوربانیانـە نـاوو گۆڕیــان ونــدەبێت، ئەگــەر ونــیش نــەبێت کەسوکارو خزمــانی ئــەو ئافرەتـە کوژراوانـە لەبـەر ئابروچون‌و مەترسـی لەسـەر شـەرەفیان ئـیعتراف ناکـەن بـەوەی کـە ئافرەتەکـەیان کـوژراوە یان کوشـتویانە، لەخراپترین حاڵەتـدا دەڵـێن دیارنـەماوە یـان سـەفەری کـردووە، یان بەنەخۆشـی مـردووە، یـان دەڵـێن هیـچی لـەبارەوە نـازانین. هاوکـات چـەند ئـافرەت کوشـتن لـەم کۆمەڵگەیـەدا زادەی نهێنـی‌و پـەنهان‌و شاردنەوەیە، سەد ئەوەندەش توندوتیـژی بـەکارهێنان بەرامبـەر بـە ئافرەتـان لەپـەنهان‌و نادیـاردا ئەنجامـدەدرێت، لەکاتێکـدا دیـاردەی خۆسـوتاندنی ئافرەتـان‌و خۆکوشـتنی ئافرەتـان لەتـەواوی عێـراق‌و هـەرێمی کوردســتاندا بووەتــە دیاردەیــەکی رۆژانــە، زوربــەی ئــەو

ئافرەتانەی خۆیان دەسوتێنن یان خۆیان دەکوژن لەبەر ئەم هۆیانە: توندوتیژی بەرامبەریان کراوە، لەرووی جەستەیی‌و سایکۆلۆژییەوە چەوساونەتەوە، بە هەڕەشەو هێز مافەکانیان پێشێلدەکرێت، خواست‌و داواکارییە هەرە پێویستییەکانیان نایەتە دی‌و ژیانیان لەبەردەم مەترسیدایە.

دیاردەیەکی دیکەی ناوشارەکان بریتییە لە: هەرچەندە ئافرەت وەك شکڵ کەمێك ئازادە، ئەم ئازادییەش ئازادییەکی سنورداری کۆتوبەندکراوە، بەلاّم روح‌و فیکرو بیرکردنەوەو روانینەکانیان ئازاد نین، لەکاتێکدا پەیوەندی نێوان کوڕان‌و کچان لەتەواوی عێراق‌و بەتایەبتی لەناوچە کوردنشینەکان سنوردارو دیاریکراوو ناتەندروست حسابی بۆ دەکرێت، لەبەرئەوە لەم کۆمەلگەیەدا بەگشتی پەیوەندی کوڕو کچ حەرام‌و قەدەغەکراوە لەرووی کۆمەلاّیەتی‌و فەرهەنگی‌و ئاینییەوە، هاوکات هیچ شوێنێکی تەرفیهی‌و گەشتیاری‌و خۆشگوزەرانی بۆ ئافرەتان‌و کچان‌و گەنجان نیە، بێجگە لەکۆمەلێك باخچەی گشتی کە کوڕان‌و کچان ئازاد نین تیایدا. باخچەکان چەند گەورە بن جێی دوو مرۆڤی مۆدێرنی تیادا نابێتەوە، باخچەکان چەند گەورەن، بەلاّم زۆر بچوکن بۆ مرۆڤە ئازادەکان.

ژیان‌و پەیوەندی‌و کاریگەری ئافرەتان لەم هەرێمەدا زۆر سنوردارو ناشارستانییە، بەواتایەك ژیانێکی داخراو و بێزارکەرە، ئافرەت لەم هەرێمەدا هێندەی کائینێکی بێدەنگ‌و پەراوێزخراوو فەرامۆشکراوە، هێندە مرۆڤێکی ئەکتیف‌و کاریگەرو رێپێدراو نییە، ئەوەمان لەبیرنەچێت پرۆسەی پەراوێزخستن‌و پشتگوێخستن

بەشێکە لەبەکارهێنانی توندوتیژی بەشێوەیەکی سایکۆلۆژیو فەرهەنگی.

دەرەنجامی شێوازەکانی توندوتیژی کە بەرامبەر ئافرەتان بەگشتی بەکاردەهێنرێتو کاری پێدەکرێت ئەم کۆمەڵگەیە زیاتر بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە:

-زوربەی ئافرەتان لەپڕێکدا واز لەخوێندن دەهێنن، بەتایبەتی لەدەرەووەی شارەکاندا، ئەوڕۆکە دنیایەك ئافەرت لەم کۆمەڵگەیەدا بوونبە ژنی ماڵەوەو خوێندنیان تەواو نەکردوەو بوون بە خزمەتکاری خێزانەکانیان یان بەو ئاستە نزمەی خوێندنەوە بوونبە فەرمانبەر بۆ پڕکردنەوەی ئەو سیستمە بەتاڵە دەمامککراوەی کە لەعێراقدا دەگوزەرێت.

-رێژەی ئافرەتانی نەخوێنەوار روو لەزیادبوونە.

-هاوکات ئافرەتانی هەڕەشەلێکراوو توندوتیژیی بەرامبەرکراو لەلایەن خێزانو مێردو تایەفەو کۆمەڵگەوە روو لەزیادبوونە، لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی داخراو بەگشتی دڵڕەقترین کۆمەڵگەیە بەرامبەر ئافرەتو رەگەزی مێیینە.

-رێژەی ئەو ئافرەتانەی کە لەماڵەوە نایەڵن یان رێیان پێنادرێت بێنەدەرەوە ئیشبکەن یان بخوێنن یان سەفەر بکەن یان پەیوەندی دروستبکەن بەردەوام لەزیادبووندایە.

-تائەوڕۆکە سود لەتوانستی کچانو ئافرەتان وەرنەگیراوەو هەوڵی ئەوتۆش نەخراووەتەگەڕ بۆ ئەکتیڤکردنو بەشدارپێکردنی

ڕەگەزی مێ، هاوکات کار لەسەر ئەوەش نەکراوە ئافرەت بکرێتە بەشدارێکی ئەکتیف لەبواری فەرهەنگیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو سیاسیو ئابوریو زانستیدا.

## سێکس و کۆمەڵگە

سێکس لەکۆمەڵگە داخراوەکانی وەك ئێمەدا نەك کردوەیەکی ناشرینو لادەرانەیە، نەك دەلالەتە بۆ ناپاکیو بەدڕەوشتی ...هتد، بەڵکو هەموو خەیاڵو خولیایەك بۆ ڕۆمانسیەتو عەشقو پێکەوەبوونیش قەدەغکراوو حەرامکراوێکی ناشیرینەو دیاردەیەکی بچکۆلەو خەفەکراوی ناو کۆمەڵگەیەو تائەوڕۆکە کچانو کوڕانی ئەم وڵاتە بەدزیەو عەشق دەکەنو بە دزیەوە ماچێك دەکەنو بەدزیەوە دەست لەملی یەکتر دەکەنو بەدزیەوە خەون دەبینەنو بەدزیەوە سێکس دەکەنو هەر بەدزیەوە سەیری یەکتریش دەکەن، لەلایەکی تریشەوە تەواوی هەموو ئەو هێزانەی کە لەپشت قەدەغەکردنی عەشقو ژیانو سێکسو خەونە کەڤاڵییەکانی کچانەوەن، هێزگەلێکی مەرگ دۆستانەنو مەرگخوازانە دەروانەنە دنیاو، هەر لەرێی ئەو مایکرۆسکۆپەی جەهلەوە کە کار لەسەر کۆنترۆڵکردنی ژیانو عەشقو سێکسو خەونو خولیاکانی مرۆڤ دەکەن، هەموو ئەو هێزانەی کار لەسەر خەفەکردنو فەرامۆشکردنی خولیاو خەونو ئارەزوو چێژوو غەریزەکانی مرۆڤ دەکەن، هێزگەلێکی مەرگخوازن بۆ بچوکردنەوەی ژیانو کوشتنی هەر خەیاڵو خولیایەك لەدەرەوەی ئەخلاقیانو نەریتی داخراوی خۆیان هەڵبەتە مەرگ

ئەوەنیە کە بونەوەرێك دەمرێت، نەخێر خەفەکردنی ژیانە لەرێی فەراموشکردنی مرۆڤو ئارەزوو خولیاکانیەوە مەرگێکی کاریگەرترو ناشیرینترە لەو مەرگە سادەوساکارەی ناو ژیان، بەلام چ کاتێك کچان بڕیاردەدەن خۆیان بکوژن؟ ئەوکاتە کچانو ئافرەتانی ئەم ولاتە دانەدانە بەتەنها هەر کەسەو بۆخۆی بڕیاری ئەوەدەدەن خۆیانبکوژن کە ژیانیان بچوکدەبێتەوە بۆ خزمەتکاریەکی تاقەتپڕوکێنی ماڵو باوكو براو ...هتد، کاتێك ئارەزوو خەونو خولیاکانیان بۆ ژیانو عەشق فەرامۆرش دەکرێتو تاسەرئێسك خەفەدەکرێنو کاتێك روانینو سەرنجەکانیان بێدەنگ دەکرێنو لەبونەوەرێکی قسەکەرەوە دەیانگۆڕن بۆ بونەوەرێکی بێدەنگو خامۆشو پەراوێزکراو، ئەوکاتە بڕیار دەدەن خۆیانبکوژن، خۆیانبسوتێنن، خۆیاندەرمانخوارد بکەنو، بەڵێ ئەوکاتانە بڕیاردەدەن کە بەخواستی خۆیان عیشق ناکەنو بەخواستی خۆیان پیاسە ناکەنو بەخواستی خۆیان دەستکاری ژیان ناکەنو ، ئائەمەیە کۆمەلگای کوشندەو داخراو دواجار هەمومان لەبەردەم کولتورێکی هەزارو داخراوداین.

## فۆبیای پەیوەندی

هەڵبەت ئێمە لەزۆر شوێنی جیاوازو لەزۆر نویسندا ئاماژەمان بەو فۆبیاو ترسو دڵەڕاوکێیانە داوە کە لەپشت هەر پەیوەندییەکی ئاسایی مرۆڤەکانەوە ئامادەیە، بە مانا مۆدێرنەکەی، بەواتایەك ئەوەی ئامادەگی بەردەوامی هەیەو کلێشە بۆهەر پەیوەندییەکی دوو

مرۆڤـی رەگـەز جیـاواز دادەنێـت تـرس‌و فۆبیـای پەیوندیکردنـە بەدەرەوەی خودو بەدەرەوەی دونیای ئاسایی خۆیەوە.

ترس لەبەرامبەر یان فۆبیا لەوی دی دیاردەیەکی هـەروا ئاسان‌و ساکار نییە، بەڵکو لەپشت ئەو ترسەوە دونیایەك نەریت‌و دونیایەك قەدەغراوو دونیایەك حەرامکراو دونیایەك پۆلێنکردن ئامادەگیان هەیە، هەڵبەت کولتوری مامەڵەکردن‌و پەیوەندییە ژیارییەکانی هەر کۆمەڵگایـــەك لەئاســـت تاکەکـــەس‌و کۆمـــەڵگاو گروپەکانیـــدا بەئەندازەیـــەکی جیاکـــەرەوەو جیـــاوازن‌و هاوکـــات فەرهـــەنگێکی بیرکـــەرەوەو ستراکـــچەرێکی جیاکـــەرەوە کلێـــشەسازی هـــەموو ئـــەو پەیوەندییانە دەکێشێت کە کۆمەلگاکانی پێدەناسرێتەوە، بـەلام ئـەو جیاوازییـە گەورەیـەی کـە لـەنێوان فەرهـەنگی کـراوەی کۆمەڵگـەی مۆدێرن‌و کۆمەڵگە داخراوەکاندا لەئارادایە، بەئەندازەیـەکی بێـسنور بۆشاییەکی گەورەی لەنێوان ئەو دوو فەرهەنگەدا دروستکردووە.

لەکۆمەڵگـەی کـراوەدا فۆبیایـەکی نـەریتی‌و ئـەخلاقی لەپـشت پەیوەندییـەکانی مرۆڤـەوە بەیەکتریيـەوە ئامـادەگی نییـە، هەڵبەتـە لێـرەدا ئێمـە مەبەسـتمان پەیوەنـدی نێـوان نێـرو مێیـە، یـان کـوڕو کچە، بەلام ناکرێت ئێمە لەم نووسینەدا بگەڕێینەوە سەر قسەکردن لەسەر مرۆڤی ئاشکرا یان مرۆڤـی داماڵدراو لەفەرهـەنگی نـەوەکانی پێـشوو، مـرۆڤ وەکخـۆی لـەدەرەوەی ستراکـچەرە داخراوەکـانی وەك دەسـەلاتی ئـەخلاقی ئـاین‌و زەبـری دابونـەریت‌و فۆبیـای پەیوەنـدی مرۆڤەکان بەیەکترییەوە، ترس لەهەر یەکتر قبوولکردنێك یان هـەر بەرامبـەرێك، مرۆڤـی ئاشـکرا بـەرەنجامی دونیـای مـۆدێرن‌و ئـەو

گۆڕانکارییە گەورەکانە کە بەسەر ئەو ئاستە ژیاریو فەرهەنگییەی کۆمەڵگاکانی دونیادا هاتووە، بەتایبەتی هەر لەسەردەمی رۆشنگەرییەوە تا سەروەختی ڤیکتۆریو سەرهەڵدانی ناوەندگەلە مرۆڤدۆستەکانو گۆڕانکارییە ریفرۆمخوازەکانی دژ بەکاسۆلیكو داخرانو دەسەلاتی مەسیحی لەڕێی پرۆستانتەکانو شۆڕشی فەڕەنساو جیاکردنەوەی مافەکانی مرۆڤو مافە مەدەنیو هەنوکەیەکانی مرۆڤ لەناوەندە داخراوەکانو بەخشینەوەی بەخودی مرۆڤ، هەموو ئەو گۆڕانکارییانە لەپاڵ گەشەکردنی زانستیو دەروونشیکاریو فەلسەفەی پەیوەندی مرۆڤ بەبوونەوە، هۆکارگەلێکی دیارو کاریگەر بوون بۆ لێکردنەوەی فۆبیای پەیوەندیو کرانەوەی زیاترو ناسینی ئەویدی.

ئێمە بۆئەوەی زیاتر نەچینە نێو ئەو وردەکارییە فەلسەفیو سایکۆلۆژیو کۆمەلایەتیانەوە، باس لەمۆدێلێکی دیکەی مرۆڤ دەکەین کەبە" مرۆڤی شاراوە " یان " مرۆڤی پەنهان" ناوی دەبەینو لەم نووسینەدا کار لەسەر ئەو فەرهەنگە دەکەین کە لە پشت ئەم مرۆڤەوە کار دەکات.

## قوربانی و یادەوەری

قوربانی وەك چەمك دەرکەوتەیەکی کۆمەلایەتیو ئاینیو فەرهەنگییە، یەکێکە لەدیاردە هەرە کۆنەکانی بیرۆکەی سەرەتایی هەر بیروباوەڕێکی ئاینیو کۆمەلایەتی کۆمەڵگە سەرەتاییەکانو ئەو کۆمەڵگە کۆنانەی کە ئەوڕۆکە بە تەنها کۆمەڵێك وێنەی ئەرشیفی

هەلکۆلراوی ناو ئەشکەوتەکانو چەند کەرەستەو پەیکەرو کۆمەلێك پانۆرامای پچرپچڕمان هەیە لەسەری.

ئێمە لەکتێبی کۆمەلگەی داخراودا، لەدوتوێی لێکۆلینەوەیەکی سێ بەشیدا بە وردی باس لەسەرهەلدانی ئاینو بیروباوەڕە سەرەتاییەکانمان کردووە، هاوکات لەهەولی راڤەکاری کۆمەلێك تێزی دیکەدا باس لەوە کراوە کە بیرۆکەی قوربانی چ پەیوەندییەکی ئالۆگۆڕکێی هەیە بە نهێنییەکانی بەخششو مەرگو پەیوەندی مرۆڤ بە دنیای شتە پیرۆزەکانەوە، بەلام ئەورۆکە باسکردنی دیاردەیەکی وا دێرین وەك دیاردەی قوربانی وەك چەمكو میکانیزمی بیرکردنەوەی هەر کۆمەلگەیەك جێی بایەخو قسەکردنێکی جدییە، هاوکات دیاردەیەکە تا رادەیەکی سەرسوڕهێنەر دەکرێ شیبکرێتەوەو بە ئەندازەیەك ئەو مەودایانەی کەشف بکرێت کە دەکەونە نێو بازنە داخراوەکانی بەرهەمهێنانی هەر پێکهاتەیەکی قوربانییەوە یان ئەو مەودایانە دیاربکرێنو رایەلە کولتورییەکانیان بدۆزرێتەوە کە دەکەونە دەرەوەی ئەو رووبەرە زاراوەییەو ناوەندگەلێکی فەرهەنگیو کۆمەلایەتیو سیاسیان داگیرکردووەو بوونەتە بەرپاکەرو بزوێنەری هەر خەیالدانێکی مێگەلیو لوکالیو پێکهاتەیی مۆدێرنی وەك حیزبو ئایدۆلۆژیاو دامەزراوە کۆمەلایەتیو فەرهەنگییەکان.

بەرلەوەی باس لەقوربانی بکەین، پێویستە ئەو مەوادا داخراوەی موقەدەسەکان دیاریبکەین، لەبەرئەوەی ناوەندەکانی پاراستنی دنیای شتە پیرۆزەکان بێشومار زیادنو لەدنیایەك رووبەری بچوکتر

لەخۆیان دروستبوون، ئێمە تەنها باس لەو ناوەندە گەورانە دەکەین کە خالّی نیین لەهەر پەیوەندییەکی کاریگەرو چالاك لەڕووی مرۆییو کولتوریو کۆمەلاّیەتیو ئایدۆلۆژییەوە، کەواتە بۆئەوەی ئەو رووبەرانە لەناوەندێکی جێگیرو وەستاوەوە بگوازینەوە بۆ ناوەندێکی چالاكو سەرزەمینی بەرهەمهێنانی هێزو فەرهەنگو ترادسیۆنو یادەوەری.

هەلّبەت بەر لەهەرشتێك پێویستە بچوکترین خانەی کۆمەلاّیەتیو فەرهەنگی کۆمەلّگە وەربگرین کە خێزانە، لەمەش بترازێت هەموو یەکە کۆمەلاّیەتیانەش دەگرێتەوە کە بچوکترین چالاکی فەرهەنگیو کۆمەلاّیەتی تیادا ئەنجامدەدرێت، خێزان بەرلەوەی یەکەیەکی کۆمەلاّیەتی بچوك بێت بە مانا سۆسۆلۆژییەکەی، هاوکات یەکەیەکی فەرهەنگیو ترادسیۆنی گەورەیە بۆ پاراستنی روانینی دیاریکراو، هێزی تاکەیەك ئیرادەی رامکراو، پاراستنی مۆڕالّو دیاریکردنی پەیوەندییەکانی تاکەکەس بە کۆی ژیانو ئەو ئاستە دیاریکراوەی ژیارییەوە، هاوکات ماشێنێکە بۆ بەرهەمهێنانی تاکەیەك روانینو تاکەیەك خەیالّگەو تاکەیەك ئیرادەو تاکەیەك موراڵو ستانداردێکی دیاریکراوی دنیای شتە پیرۆزەکان.

لەپشت هەر خێزانێکەوە.. لەو دیو هەر دەرگایەکی داخراوەوە دنیایەك خەیالّی جیاوازو دنیایەك پەراوێزکراو هەیە لەدەرەوەی ئەو نەریتە کۆنکرێتییەی ژیانەوە، بەلاّم قەفەزێك هەیە بۆ بەخێوکردنی تاکەکەس بە کۆمەلّێك جۆری خواردنو خواردنەوەی دیاریکراو، بۆ راهێنانی تاکەکەس بە تاکەیەك مۆڕالّی مامەلّەکردنو

هەڵوێستو رەفتارو بچوککردنەوەی ئارەزووەکان لەچوارچێوەیەکی بچوکی خێزانو چواردیواری سنور بۆ کێشراودا. مەریوان وریا قانیع سەبارەت بە خێزانو کۆنترۆڵکردنی فەرهەنگی دەڵێت:"لە دنیای ئێمەدا تاکەکەسی کورد مەحکومە بەوەی هەموو جیاوازییەکانی خۆی بچەپێنێتو یەکەیەکەیان رەتبکاتەوەو نەیاندۆزێتەوەو بەرزیان نەکاتەوە بەڕووی دنیای دەرەوەدا. پەیوەندی دەمجی یاسای سەرەکی گرێدانو نقومکردنی تاکەکەسە لەناو خێزاندا. قازانجی خێزان وەك گشتێك، ناوبانگی خێزان وەك کۆیەكو مانەوەی خێزان وەك راستییەکی کولتوری پیرۆزکراو- لە قازانجو ناوبانگو مانەوەی تاکەکەس گرنگترە. کولتوری ئێمە مەودای ئەوە بە تاکەکان نادات بوونی خۆیان، ناوبانگی خۆیان،ماناوەی خۆیان بە ئەندازەی گرنگیو پیرۆزی خێزانو لەدەرەوەی رەهەندی خێزاندا، بەرهەمبێتو هێڵێك، ماوەیەك، فاریزەیەك لەنێوان خۆیانو رووکارە کۆییەکانی خێزاندا بکێشن.(دەسەلاتو جیاوازی، ل42)"، دنیای شتە پیرۆزەکانی ئەو ناوەندە دیاریکراوەی کۆمەڵگە بەرلەوەی ناوەندێك بێت بۆ گەڕانەوە، بەرلەوەی خەیالگەیەك بێت لەیادەوەریو مێژوودا، بەرلەوەی کۆمەڵێك هێماو ئاماژە بن بۆ راگرتنی ئێمە لەهەر خاڵێکی دیاریکراوی ژیاریو بەرجەستەدا، هەلگری کۆمەڵێك پەیوەندی کاریگەرن بۆ بەستنەوەی مرۆڤ بە نەریتێکی بەرجەستەی وێنەیی لەمیناتۆرێکی کۆمەڵگەییداو بەستنەوەی تاکەکەس بە زیاد لەبوارێکی ژیانەوە. بۆنمونە سیستمی باوکسالاری هێندەی موقەدەسێکی تەوتەمیی وەستاوە، هێندە

هێزێکی ڕێکخەری کاریگەری ژیان نیە لەکۆمەڵگەو خێزانو یەکە فەرهەنگییەکاندا، واتە باوکسالاری هێندەی رووبەرێکی گەورەی موقەدەسو حەرامکراوێکی بەرجەستەیە لەخەیاڵگەو یادەوەریو سەرزەمینە ژیارییەکانی روانینی تاکەکەس لە تەواوی جیاوازیو وێکچوونی مرۆڤەکاندا لەگەڵ هەر کایەیەكو پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیدا. هێندە ئەکشنێکی جوڵاو و زیندوو نیە، بەڵام پانتاییەکی گەورەیە بۆ بچووککردنەوەی تاکەکەس لەموقەدەسێکی بەرجەستەکراودا.

کاڵبوونەوەی تاکەکەس لەنێو ئەو یەکەو خانە فەرهەنگیانەدا بە تایبەتی لەخێزانو گروپو قوتابخانەو خێڵو حیزبو دامەزراوە داخراوەکاندا، هێندەی پەیوەستە بە دنیای بەرجەستەی شتە پیرۆزەکانو دنیای روانینە رامکراوەکانەوە، هێندە پەیوەست نیە بە پەیوەندی راستەوخۆی تاکەکەسەوە بە هەر یەکێك لەو چەمکانەو ئەو خەیاڵگەیەی کە دنیا بچوکدەکاتەوە بۆ قەفەزێکی دیاریکراوی روانینو دنیابینی.

سەرەنجام ئێمە لەبەردەم کایەیەکی گەورەی مەعریفیدا نین، بەڵام لەبەردەم کولتورو ترادسیۆنێکی بەرجەستەی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیەك داین کە کۆمەڵگەیەکە تا ئەندازەیەکی بەرفراوان کۆمەڵگەیەکی داخراو و وێرانکارە، چۆن پیاوسالاری دەسەڵاتێکی موقەدەسو سایکۆلۆژییە، بەهەمان شێوە دەسەڵاتی سەرجەم موقەدەسە هاوشوناسەکان هێزگەلێکن بۆ یەکخستنو غەرقکردنی هەر جیاوازیو لادانێك لەیەکەیەکی گەورەتردا کە خێزانی موقەدەسو حیزبی

موقـەدەسو گروپـی موقەدەسـە. هاوکـات فەرهـەنگی لۆکـاڵی خێزانـی بەرهەمهێنـەرو کۆپیکـەری دابونـەریتو مۆراڵـە، هەرچـەندە ئەمانـە هـەمووی وەك ترادسـیۆن سـەیردەکرێن، بـەلاّم کۆمـەڵێك موقەدەسـاتو حـەرامکراو و قەدەغـەکراون بـە ئەندازەیـەك پـۆلێنکراون کـە مەحاڵـە جیاکردنـەوەیان لـەکۆی ئـەو پەیوەندیانـەی خێـزان بـەناوەوەو دەرەوەی خۆیەوە، واتە جیاکردنەوەی لەو گشتە نابەرجەستەیەی کە مەریوان وریا ناوی دەنێت قازانجی خێزان وەك گشتێك.

ئەگـەر لێـرەدا بگەڕێینـەوە بـۆ چـەمکی کۆمەلاّیـەتیبوون، دەکەوینـە بـەردەم مەودایـەکی بـەرفراوانی کۆمەلاّیـەتی جیـاواز کـە رووبـەرێکی گـەورەترە لەهـەر هێزێکـی لۆکـاڵیو فەرهـەنگیو خانـەو یەکەیـەکی کۆمەلاّیـەتی کـە پێکـڕا خێزانـە لەگـشتێکی فەرهەنگیـداو پەیوەنـدی مرۆڤەکانـــە لەمەودایـــەکی بازنەییـــدا. کەواتـــە چـــەمکی بـــە کۆمەلاّیەتیبوون Socialization رەنگدەرەوەی هەموو ئەو ئەزمونانەیە کـە لەرێگەیانـەوە ئەنـدامانی گـەنجو منـداڵی کۆمەڵگـە فێـری کولتـوری کۆمەڵگەی خۆیان دەبن، ئەمـە لەکاتێکدا کـە لەروانگەیـەکی کۆمەڵییـەوە دەڕوانینە ئەم چەمکە، بەلاّم لەروانگەی تاکەکەسییەوە مـرۆڤ لەڕێگەی پرۆسـەی بـە کۆمەلاّیەتیبونـەوە ئامـادەیی هەڵـسوکەوتی نـاو ژیـانی کۆمەلاّیەتیـدا پەییـدا دەبێـت.(دەروازەکـانی کۆمەڵناسـی، مینوچـیهری موحسینی، و. کۆمەڵێك وەرگێڕ ل131). قوربـانی یەکـەمی ئـەم سیتمە کۆمەلاّیەتییە لەکۆمەڵگە داخراوەکانـدا تاکەکەسـە، تاکەکـەس لـەناوەوەڕا گرفتاری دەستی کۆمەڵێك پەیوەندی خوێنەویستە کـە لەڕێیـەوە ئـالودەی ئەو رووبەرە ژیاریو فەرهەنگییەی کۆمەڵگە دەبێتو ئەو تایبەتمەندییە

جیاوازانـــەی خـــۆی کاڵدەبێتـــەوەو ئـــەو پرۆســـەی بـــە کۆمەڵایەتیبونـــە دەســـتپێدەکات، هەڵبـــەت ئـــەم پرۆســـەیە بەرلـــەوەی پرۆســـەیەکی کۆمەڵایـەتیو فەرهـەنگی بێت پرۆسـەیەکی سایکۆلۆژیو مەعریفیـشە، بەواتایـــەك هەرچـــی کـــۆنترۆڵکردنی تاکەکەســـە بـــەم پرۆســـەیەدا تێدەپـــەڕێتو سەرچـــاوەیەکی تەکنیکییـــە بـــۆ بەرجەســـتەکردنەوەی تاکەکەس لەتابلۆیەکی دیاریکراوی مۆڕاڵدا.

ئەم کۆنترۆڵکردنەش میکانیزمێکی هەروا سادەوساکار نیە، بەڵکە میکانیزمێکـە کـە زیـاد لـەبوارێكو زیـاد لەمەودایـەکی هەژمونگـەر کـاری لەســـەر دەکـــەن، وەك میکـــانیزمی پـــەروەردەو فێرکـــردنو دەسەڵاتی باوکسالاریو کولتورسالاری، کە کۆمەڵێك رووبەرن تیایاندا غـەریزەو چـێژو خـەیاڵو خولیـاو ئـیرادەو خەونـەکانی تاکەکـەس رامدەکرێت، هاوکات کاریگەرییەکی ئاسۆیی لەسەر هەر تاکەکەسێك جێدەهێڵن، ئـەم رامکردنـەش کـار لەسـەر کیمیـای پەیوەندییـەکانو ئاسۆکانی روانینو دنیابینی دەکاتو سەرەنجام مرۆڤەکان لەتاکەیەك دنیابینی دیاریکراوی هەژاردا بەرجەستەدەکات.

## سەرچاوەکان:

1-مەریوان وریا قانیع، سەرەتایەك بۆ لێکدانەوەی دیاردەی دیکتاتۆریەت، گۆڤـای سەردەمی رەخنە، ل67

-هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل93

-ه.س.پ، ل93-94

2-(بەختیار عەلی/ رۆشنبیر، کۆمەڵگا، دیموکراسییەت- گفتوگۆ-ل25)

3-ماهية الديموقراطية، الان تورين

4-بەختیار عەلی، دیموکراسیەتی زۆرو دیموکراسیەتی کەم...ل23

-مەریوان وریا قانیع، سەرەتایك بۆ لێکدانەوەی دیاردەی دیکتاتۆریەت، گۆڤاری سەردەمی رەخنە،ل93-94 )

5- علي حرب، اوهام النخبة او نقد المثقف، المركز الثقافي العربـي، طبعـة الثانيـة 1998، ل13

6-هاوڵاتی، ژ233 چوارشەمە 2005/7/20،ل15

7-علی حرب، حديث النهايات،2001،ل10"

8-مەریوان وریا قانیع، شوناس و ئاڵۆزی، 2004، ل23-24

9-النقد الحداثة،الان تورين،ترجمة:انور مغيث،درا المجلس الاعلى للثقافة،ص 30.

-ه. س، پ، لا 30

-لە ئاماژەیەکی ئالان تۆرینەوە بۆ گادامێر وەرگیراوە- لە کتێبی ڕەخنە لەنوێگەری. -

-میشێل فۆکۆ، چـاودێرکردن و سـزا، لا196، لـە کتێبـی (رەخنـە لـە نوێگـەری) وەرگیراوە .

- شوناس و ئاڵۆزی، ل20

10-ئۆکتاڤیۆ پاز- شعر والنهايات القرن. و: ممدوح عدوان-دارالمدى- لا31

11-بەختیار عەلی، دیارو نادیـار (2)ئیمپراتۆریـەتی وەهـم، مانـای نوێگـەری و..، گۆڤاری ڕەهەندژ5/ 1998- لا35-36.

-ئۆکتاڤیۆ پاز- شعر والنهايات القرن. ترجمه: ممدوح عدوان-دار المدى- ص31

12-(بەختیار عەلی، خوێنەری کوشندە، ل37 )

13- (مەریوان وریا، بەختەوەری و بێدەگی، ساڵی 2003، ل84)

-(خوێنەری کوشندە، ل36)

-خوێنەری کوشندە،ل36

- (خوێنەری کوشندە،ل39)

-خوێنەری کوشندە/ل37"

14-( بـەختیار عـەلی، کـێن ئەوانـەی دەبنـە نەوەیـەکی دی؟ بەشـداریەك لـەو گفتوگۆیانەدا کە دەربارەی (شوێنی گەنجان لە کۆمـەڵگادا) سـازدەکرێت.ڕۆژنامـەی هاوڵاتی، ژ(101 ) دووشەممە 2002/2/2.ل9)

-نقد الحداثة ، ترجمة: انور مغيث، دار الحداثة، ل22-23)

- (خوێنەری کوشندە، ل43)

-(بەختەوەری و بێدەنگی،ل93-94)

-ڕۆشنبیر، کۆمەڵگە، دیموکراسیەت/ل67)

- (ه.س.پ/ل7)

15(ئیدوارد سەعید، وێنەکانی ڕۆشنبیر، و. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، لـەکتێبی" بـیری ڕەخنەیی هاوچەرخ، کۆمەڵە وتار، 2001، ل 109)

16- Emil Durkhiem, Elementary form of Religious life – study of Religious sociology. trans .Joseph ward swain . new York .free press 1965 –21-33.

17-قاموس الانثروبولوجيا –تاليف: د. شاكر مصطفى سليم –1981-ص 813

18- E. Taylor .primitive culture Lon.: Johan Marray 1871.

19-موريس گودوليه –لغز الهبة –المقدس-سنة 1998ل213

20-نظرية الثقافة –تاليف: Michael Thompson-Richard Ellis-Auron Wildavasky Oxford UN 1990 ترجمة:د.علی سعيد الطاوی (لەم باسەدا ئاماژەدراوە بە ماری دۆگلاس بە تايبەتی ئەو تویٚريانەی کە تايبەتە بە جياکردنەوەو پۆلێنکردنی دنيای شتە پيرۆزەکان و پۆلێنکردن و وێناکردنی مرۆڤ بەسەر دنيای دابڕاو لەپيرۆزی و دنيای تەبا لەتەک پيرۆزی)

## له كتێبه چاپكراوه‌كانی نوسه‌ر:

1-**موسافیرو چاوه‌ڕوانی نه‌وره‌سێك**/ دیوانه شیعر، چاپی یه‌كه‌م 1998 ، له چاپكراوه‌كانی بنكه‌ی ئه‌ده‌بی روناكبیری گه‌لاوێژ.

-چاپی دووه‌م 1999 /زنجیره بلاوكراوه‌كانی رێكخراوی TDC.

2-**كۆچ و سه‌فه‌ر**/ لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی ئه‌نترۆپۆلۆژی كۆمه‌ڵناسی‌یه ده‌رباره‌ی دیارده‌ی كۆچ له جیهاندا به‌گشتی‌و له‌كوردستاندا به‌تایبه‌تی، چاپی یه‌كه‌م 2000 / له بلاوكراوه‌كانی ده‌زگای چاپ‌و په‌خشی سه‌رده‌م.

3- چاپی دووه‌م 2001 به هاوكاری وه‌زاره‌تی رۆشنبیری له سلێمانی.

4-**تازه‌گه‌ری**/ لێكۆڵینه‌وه ده‌رباره‌ی تازه‌گه‌ری‌و راقه‌كردنی دیووه نادیاره‌كانی قه‌سیده‌ی ره‌نگدانی شێركۆ بێكه‌س، چاپی یه‌كه‌م 2003 چاپخانه‌ی ئه‌هلی .

5-**كۆمه‌ڵگای مۆدێرن**/ ده‌رباره‌ی دیموكراسی، كۆمه‌ڵگای مه‌ده‌نی‌و مه‌ترسییه‌كانی تیرۆر، له‌بلاوكراوه‌كانی رێكخراوی(KIE)و به‌هاوكاری رێكخراوی (RTI) نێوده‌وڵتی، چاپی یه‌كه‌م **2004**

6-**كۆمه‌ڵگای داخراو**/ رۆشنبیر، كۆمه‌ڵگا، ده‌سه‌لات، له‌بلاوكراوه‌كانی به‌ڕێوبه‌رایه‌تی چاپ‌وبلاكردنه‌وه‌ی وه‌زاره‌تی رۆشنبیری له‌سلێمانی، چاپی یه‌كه‌م 2004

-**کۆمەڵگـەی داخـراو**/ چاپخانەی چوارچرا لەسلێمانی/چـاپی دووەم: 2005

7-**غوربـــەتی فـــڕین**/ شـــیعر/ لـــەبلاوکراوەکانی بەڕێوبەرایـــەتی چاپوبلاوکردنەوەی وەزارەتی رۆشنبیری لەسلێمانی، چاپی یەکەم 2005

8-**دەسەلاتی کوشـندە لەکۆمەڵگـەی دیکتـاتۆرە بـچوکەکاندا**/ وتـارو لێکۆڵینـەوە/ لـەزنجیرە کتێبـەکانی چـاپخانەی شـڤان/ چـاپی یەکـەم: 2007

## پڕۆژەی ئایندە:

1/**دنیای پاش حیکایەتە گەورەکان** / وتارو لێکۆڵیەنەوە.

2/**دەســـەلاتی غـــەیبانی**/ تێـــرۆرو کولتـــوری مەرگدۆســـتی/ لێکۆڵینەوە.

3/**رەخنەو بێدەنگی**/ وتارو لێکۆڵینەوە

4/ **کۆمەڵگەی کراوە**/ وتارو لێکۆڵینەوە.

# پێڕست

## ڕێزو سوپاس بۆ....

ئەو ئازیزو خۆشەویستانەی کە بەدڵەوە هاوکاریان کردم.. باوکی بەڕێزو خۆشەویستم شێخ جەبار سەید ئەحمەدو دایکی زۆر ئازیزم دایە نەسرین کە لەسەروەختی نوسینی ئەم کتێبەدا بەخۆشەویستییەکی زۆرەوە هاوکاریان کردم، ئازیزو خۆشەویستم ڕۆشنا غەریب کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە یارمەتیدام، برای بەڕێزم ئاکۆ جەبار لەبەریتانیا، خوشکی خۆشەویستم شیلان جەبار لەکەنەدا، هاوڕێی ئازیزو خۆشەویستم د. دانا سەردار لەبەریتانیا، هاوڕێم یادگار ئەورەحمان کە کاری کلێشەو دیزاینی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ.

نرخی ( ٥٠٠٠) دینار